هونەری سەرکردایەتی کارا

# 12 کلیل بۆ گەیشتن بە لوتکە


نوسینی وانەبێژی جیهانی

د.ئیبراهیم فەقی

Dr.ibrahim Eifikh





وەرگێڕانی:

گەرمیانی محەمەد ئەحمەد

2014

# هونەری سەرکردایەتی کارا

## ١٢ کلیل بۆ گەیشتن بە لوتکە

نوسینی وانەبێژی جیهانی

د.ئیبراهیم فەقی

وەرگێڕانی: گەرمیان محەمەد ئەحمەد

چاپی یەکەم

٢٠١٤

**لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە(٤٩١)**

## ناسنامەی کتێب


- ناوی کتێب: هونەری سەرکردایەتی کارا
- نوسینی: د.ئیبراهیم فەقی
- وەرگێڕانی: گەرمیان محەمەد ئەحمەد
- تایپ: وەرگێڕ
- بەرگ: فواد کەوڵۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٤
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

**لەبەڕێوەبرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان ژمارە سپاردنی: (١٣٦٥)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە.**

ناونیشان:

سلێمانی ــــ بازاڕی سلێمانی ــــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)



# پێرست

# بەناوی خودا کە دەهندە و دلۆڤانە

[ خوا لە هیچ گەلێك ناگۆڕێ، تا ئەوان دڵیان نەگۆڕن ]

(رعد-هەورەگرمە:11)

خودای گەورە ڕاستی فەرمووە

## لەبارەی ئیبراهیم فەقییەوە چییان گوتووە؟



ئیبراهیم فەقی کەسێکی تایبەتمەندە، کۆڕەکانی بەجوانی و بەرنامەکانی بە سانایی پێشکەش دەکات. بە هەموو شارەزایی و ئاشنایەتیەکانی ئامازە پێدەری تەواوی ژیانە، پێویستە هەموان هەڵی گەیشتنە خزمەتیان بۆ برەخسێت..

(Rose Sollazzo...AT &T Canada)

کۆڕ و وانەکانی ئیبراهیم فەقی وەکو کلیلی سەرکەوتن وەهان..

(Collette Assaab...Bell Canada)

کۆڕەکانی ئیبراهیم فەقی بەهەموو شێوەو پێوەرێك کاریگەر و گونجاون

(Andre Dostie...Chysler – Canada)

ئیبراهیم فەقی جیاوازێکی دانسقەیە، کۆڕەکانی زۆر بەپێز و بونیات نەریشن.

(Marcel Cheuier...Pepsi Cola)

لەمرۆژە تایبەتیەدا، ئاهەنگی ساڵانەمان بەم شێوەیە سەرکەوتوو نەدەبوو گەر ئیبراهیم فەقی نەبوایە..

(Bernard Thibaulit...Greater Montreal Beal Estate Board)

رێنماییە نائاساییەکانی ئیبراهیم فەقی بووە هۆی هاندان و وروژاندنمان بۆ سەرکەوتنی مەزن...

(Alain GerardTelToute Communication)

# ئەم پەڕتوکە پێشکەش بێت



بـە هـەموو ئەوانـەی رۆژێـك پێیـان گتـووم نـەخێر.. بـەبێ ئـەوان نەمـدەتوانی توانـا ڕاستەقینەکانم بدۆزمەوە و سەرکەوتن لە ژیانمدا بەدیبێنم..

بە ئامالی هاوسەرم.. کچە جومکەکانم نانسی و نەرمین ..

**د.ئیبراهیم فەقی**

پێشکەش بێت بەو کەسـەی فێـری سـەرکردایەتی کردنـی کـردم و دانـاییم لێـوە چـنگ خست... بە مێردەکەم، لە خوا داوای بۆ دەکەم بیخاتە باخی نەبڕاوەی نەمرانـەوە و ئـەم کارە باشانەی بکاتە کێشکانی چاکانی..

**ئامال فەقی**

## سوپاس و ڕێز



لەکاتێکدا ئەم پەڕتوکە بەری ساڵانێکی زۆری فێربوون و گەڕانە، هەمدیس ئەنجامی ماندووبونێکی ماوەدرێژی دەستەیەکی کاری بلیمەتی ناوازەشە. بۆیە لێرەوە و لە قوڵایی هەناومەوە دەمەوێت سوپاس و نەوازش ئاراستەی هەموو ئەو کەسانە بکەم کە یارمەتی و هاندانەکانیان لە بەرجەستەبوونی ئەم پەڕتوکەدا ڕەنگ ڕێژ بووە، بەهۆیانەوە ئەم پەڕتوکە بە ڕاستینەیەکی کەتواری بووە.

بە تایبەت دەمەوێت سوپاسی هاوڕێ و هاکاری ژیانم و هاوبەشە خەباتم (ئامال) بکەم" لەبەرامبەر ئەو هەموو هەوڵ و ماندوبونانەی لە گەشتی ژیانمدا بۆی نواندوم و یارمەتی کردووم بۆ ڕێکخستنی گەشت و کۆڕ و وانەکانم. سوپاسی ئامال دەکەم بەهۆی مانەوەی تا درەنگانێکی شەو" بۆ ئامادەکردن و ڕێکخستنی یادگاری نامە و بەرنامە و پێویستییەکانم لەکات و جێی خۆیدا.

سوپاس بۆ هاریکارەکەم Pina DeFabrizo بۆ ئەو ئەمەکداری و ماندوو نەناسییەی کە لەکارەکەی خۆیدا دەینواند. سوپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی لە لایەکەی تری کیشوەرەکەوە کاریان ڕەگەڵ کردووم، ئەوانەی یارمەتییان داوم بۆ هاتنە بەرهەمی ئەم پەڕتوکە و بەتایبەت بەڕێوەبەر Sylvain Bedard بۆ ئەو ئامۆشیارییە بە بەها و هاندانە بەردەوامانەی کە پێشکەشی دەکردم. سوپاس بۆ Pol Mall بەهۆی ئەو هونەرکاری و ڕازاندنەوەیەی کەلەم پەڕتوکەدا ئەزیەتی پێوە کێشاوە.

Regis Nadeau خۆشەویستترین هاوڕێم، کە هەمیشە جێ نیازی من بووە.

Fehim Sofraci هـاورێم و جێگـری سـەرۆكی Holiday Inn Crowne Plaza، Metro Center بەهۆی هاندانە بەردەوامەكانیەوە بۆمن .

سـوپاس بـۆ هـاورێم Alain Laroche ئەنـدامی لیژنـەی گەشـەپێدان لەشـاری Verbun بۆ هاندانە بەردەوامەكانی بۆ من.

سوپاس بۆ هاورێم Joseph Sidaros بەڕێوەبەری هەرێمی كۆمپانیای London Life بـۆ ئـەو متمانـە و بـاوەڕە زۆرەی بـەمن هـەیبوو. بـۆ David Meyersبەڕێوەبەری Sunlife of Canada .

سوپاس بۆ Toni DiFruscio بەڕێوەبەری گشتی Preston Phipps .

سـوپاس بـۆ Benito Migliorati بەڕێوەبـەر و سـەرۆكی میوانخانـەی Hotel Chateau Vaudreuil .

بۆ Angela Prevost ی خاوەن و بلاوكاری ڕۆژنامەیPremiere Edition.

سوپاس بۆ هەموو ئەوانـەی لـەكۆڕ و وانەكانمـدا ئامـادەبوون، بـۆ سـەرجەم سـەرۆك و بەڕێوەبەرانی جێبەجێ كاریی كە ڕێگەی چاوپێكەوتنیان پێدام.

سوپاس بۆ هەموو بەهرەداران كە بەشدارێتییان هەمیشە بووەتە سەرچەشمەی گیان و پەیام و كاریگەریەكانم، بەتایبەت خوا لێخۆشبووان: د. نۆرمان ڤینسیت بیـل، د. ڕۆبێـرت شۆلر، د.جۆن گیندر، د.ڕیچارد باندلر، د.دیباك شـوبرا، د.زج زیجـلار و برایـان تراسـی .

سوپاسی تایبەتم بۆ هەمووتان.. خودا موارەكتان بكات.

**تێبینییەك لە نوسەرەوە**

بـۆ ئاسـانكاری خوێندنـەوە، وشـەی (ئـەو)م بـەكارهێناوە؛ وەك ئاماژەدان بە بەڕێوەبەر یان سەركردەكان لـەنێو ئـەم كتێبـەدا، بـۆ نێر و مێش هەمان شت وتراوە و بەكارهێندراوە.

# پێشەکی

چۆن ئەم پەڕتوکە دەبێتە ڕێنوێنی کارت" بەرەو سەرکەوتن؟





تۆیش وەکو من بڕوات وەهایە کە لەداهاتوودا نەختێك جهان دەگۆڕێت؟ کێبڕکێ کاری نوێ و بەهێزتر دیار وچێ دەبن، دەتوانن هەبووەکانی ئێستا بهاپن و تیابەرن و ون ناو بکەن، بێگومانیش ون ناویان دەکەن؟ گەر بە بەڵێ وەلامی هەردووك پرسیارەکەت داوەتەوە ئەوا بزانە کە من و تۆ لەم بارەیەوە هاوڕاین، هیچ شتێکیش نییە ماناو ناوی هەڵسوڕاندنی مانەوە یاخود کارگێڕی مانەوەبێت. تۆ دەزانی سەرکەوتن تەنها بە بیرکردنەوە چێ نابێت، بە هەڵسوڕاندنیش، بە فرۆشتن بە هەمان شێوازی کۆن، یاخود زاڵبون بەسەر چالاکی ئەوانی تردا، لەڕاستیدا شێتییە مرۆۋ لەسەر هەمان چەشنە چالاکی کۆنی بەردەوام بێت و بەردەوام بێ و چاوەڕوانی ئەنجامی جۆراو چەشن بێ. نایتنجاڵ لە " کایەت هەڵسوڕێنە" دا باسی چیرۆکی پیاوێکمان بۆ دەکات کەلە پێشی ئاگردانێك دانیشتووە و دەڵێت:" گەرمیم پێ ببەخشە، کۆترەدارت پێ دەبەخشم" ، بۆماوەیەکی زۆر بێ دەستکەوتنی گەرمی مابویەوە" چون لەبیری کردبوو کە پێویستە لەسەرەتادا ببەخشێت و کاری خۆی ئەنجامبدات بەر لەوەی هیچی دەست بکەوێت یاخود ئەنجامی بەرچنگ کەوێت.

بەپشتیوانی ئەزمونم بۆم دیارکەوت کە زۆرێك لە بەڕێوەبەران هێشتاکە بەم چەشنە بیردەکەنەوە، ئەوکاتەی دەستم دایە نوسینەوەی ئەم پەڕتوکە و ئەنجامدانی چاوپێکەوتن ڕەگەڵ بەڕێوەبەرانی ئیش و پلەجیاوازدا، هەموویان سەیریان لەوەدەهات

كە بۆچی ئەنجامی باشتریان چنگ ناكەوێت؟! یاخود بەلای كەمەوە ناتوانن ئەو ئەنجامەش بپارێزن كە پێی راگەیشتوون؟!

تاكە رێگە بۆ برەودان بەمانەوە لە كێبڕكێی ئەو چەرخەی كە هەرگیز بە كۆتا نایات- لەسایەی پێشكەوتنی خێرای بواری تەكنەلۆژیاوە- ئەوەیە كە گەشە بە خۆت بدەیت، بەهرەی نوێ یادبگریت، بەسەركردەیەكی باشتربیت، هاندەر و وروژێنەرێكی خاستروبیت، بە مەشق پێكارێكی چاكتربی، بە باشتر كاتەكانت بەكاربێنی، ئامانجەكانت دیاری بكەیت" بۆئەوەی بەهرەكانت لەسمارتەبدەی، بەهرەی هەمووانی دەوروبەریشت هەست پێبكەی.

رێسایەكی زۆر ساكارهەیە، **یان بۆ پێشەوە پێش دەكەوی، یاخود ئەوانی تر دەتشێلن.** تۆم بیترز جارێك گوتی:" **دوو جۆر بەرێوەبەر هەیە: خێرا و مردوو**"، تۆ پێویستت بەوەیە خێرابیت بۆئەوەی داهێنەربی و مانەوەی خۆت لە بازارەكاندا بپارێزی. زۆربەی بەرێوەبەران بەر لەوەی پێیان بگوترێت بەرێوەبەر، هەمیشە دەستكەوتەكانیان ناوازە و نایاب بووە، بەلام هێشتاكە ئامادەیی بەرگەگرتنی ئەوەیان تیادا بەرجەستەنەبوو كە لەگەل دەستكەوتنی نازناوی بەرێوەبەردا توشیان دەبێت" لە داواكاری كۆتا نەهاتوو.

باوەكو چرۆكێكت بۆ بگێرمەوە: جارێك راوچییەك سەگێكی بۆ راو بەكرێ گرتبوو، بەخت یاوەری بوو، راوێكی باشی بە قیسمەت بوو. پاشی مانگێك راوچییەكە هاتەوە بۆ بەكرێ گرتنی هەمان سەگ، لەبەرئەوەی ناوی سەگەكەی نەدەزانی هەستا بە پەسندانی سەگەكە بۆ خاوەن سەگەكە و ئەویش گوتی: " ئەها سەگە كات دەلێی، ئێستا كرێی رۆژانەی بەرزكراوەتەوە بۆ پازدە دۆلاری رۆژانە" . راوچییەكە پارەكەیدا، ئەمجارەشیان بەخت یاوەری بوو. پاشی یەك مانگی تر گەرایەوە و داوای هەمان سەگی كردەوە، خاوەن سەگ داوای ٢٥ دۆلار رۆژانەی كرد"چون ببوە پالەوانی فرۆشەكان، راوچییش دەیزانی سەگەكە ئەوەندە و زیادتریش دەهێنێت بۆیە پارەكەیدا و بردی بۆ راو، ئەمجارەش راوێكی باشی بۆی چنگ خست، جاری داهاتوو گەرایەوە بۆ بە كرێ

گرتنەوەی هەمان سەگ، بەڵام خاوەن سەگەکە گوتی: " ببورە ناتوانم بەکرێ ئەو سەگەت پێبدەم! " ، بەکرێگیریش پرسی بۆ؟ ئەویش گوتی: " چونکە ئێستا سەگەکە تەنها لەسەر کلکی دادەنیشێت و دەحەپێت و هیچی تر ناکات" .

بۆ بێ بەختی و چارەڕەشی زۆرێك لە بەڕێوەبەرەکان هەمان چەشنە ڕەفتار دەنوێنن بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان، وادەزانن گەر هەمان شت ئەنجام بدەیت ئەنجامی باشتر چنگ دەخەیت. ئەم پەرتوکە وەکو قسەکردنی دوو بەڕێوەبەر ڕەگەڵ یەکتر وەهایە، ئەم پەرتوکە پوختەی بیست و پێنج ساڵ لە شارەزایی و فێربوون و ئەزموواندن و گەڕانە. ئەم پەرتوکە نوێترین بیرۆکە و ستراتیژییەتی باوت پێشکەش دەکات" بۆ یارمەتیدانت لەبۆ ئەوەی:

- وەڵامی گونجاو بۆ هەموو ئەو ئاریشانە بدۆزیتەوە کە ڕۆژانە توشت دەبن.
- برەو بە وەرنامەی سەرکەوتنی تایبەتیت بدەیت.
- فێری بەهرەی کارگێڕی کارابیت، بەئاسانی پەیوەستی شێوازی خوزاراو و پەسەندی خۆتی بکەیت.
- بیرکردنەوەکانت داهێنەرتربن، بەخاوەنی وابینینێکی بەهێزبیت.
- هەروەها یارمەتیت دەدات بۆ ئەوەی:
  - بڕیاری دروست بدەی.. باشترین بڕیار.
  - هانی خۆت و هەموانی دەوروبەرت بدەی.
  - لەگەڵ گۆڕانەکاندا خۆت بگونجێنی.
  - دڵەڕاوکێکانت هەڵبسوڕێنی.
  - بە سەرکردەیەکی بەهێزبیت.
  - دەستەیەکی بەهێز چێ بکەیت.
  - بەباشتر لە جاران کاتەکانت هەڵبسوڕێنی.

- بە ئاسانی و متمانە و بێکێشەوە پەیوەندی بە ناجۆرترین مرۆڤەکانیشەوە بکەیت.
- بەجۆرێك کۆڕەکانت هەڵسوڕێنی باشترین ئەنجامیان هەبێت.
- فێری هونەری دامەزراندن و دەرکردن بیت.
- .... شتی زۆرتریش.

ئامانجم لە دارشتنەوەی ئەم پەرتووکە ئەوەیە کە: تۆ ئاشنا بکەم بە دۆزینەوە و هەستکردن بە زۆرترین کلیلەکانی بەڕێوەبردنێکی زندەیی و پێویست، لەپێناو فێربوون بە هاوژیانیکردن و ئاشنابوون بە گومان و ئەو کێشانەی چارەکردنیان ئاسان نییە، سەرباری ئاشناکردنت بە وەرنامەگەلێکی ناوازەی بواری کارگێڕی بەنرخ و پێویست.

بۆ ئەوەی لەمرۆوە بەرزترین ئاست چنگ بخەیت، وەها لەگەڵ هەر ئاریشەیەکدا بجولێرەوە کە تاکە کێشەی ژیانتە، بۆئەمەش پێویستت بە خوێندنەوەی تەواوی ئەم پەرتوکەیە. کاتی تەواو بەخۆت ببەخشە بۆ خوێندنەوەی جاراو جاری دوای یەکی ئەم پەرتوکە" **هەر کێشەیەك لەخۆگرتەی بنچینەی خودی چارەسەریەتی**" . ئەم پەرتوکەش تیابووی هەموو ئەو چارەسەرانەیە کە پێویستت پێیەتی" بۆ ئەوەی بەوە بیت کە دەتەوێت.

ئێستاش وەرە باوەکو پێکەوە ئاشنای یەك بە یەکی هەر دوازدە کلیلەکەی سەرکەوتنی بەڕێوەبەرانی زۆر سەرکەوتوو بین.

# هەموو ڕۆژێك



هـەوڵی ئەنجامـدانی کارێـك بـدە پێشـتر ئـــەنجامت نـــەدابێت، ئیشـــێکی وەهـــا ئەنجامبـدە پێشــتر توانــای ئەنجامـدانیت نەبوبێت.

... ڕۆژانە گەشە بەخۆت بدە" نەختە نەختە.

... فێری بەهرەی نوێتربە.

...چارە بۆ کێشە نوێیەکانت ببینەوە.

...یەك میل پتر بڕۆپێشەوە، بەمەش لەسەر ڕێگەت دەبیت بـۆ بـەدیهاتنی شـکۆمەندی باڵای خوازراو .

**د.ئیبراهیم فەقی**

# کلیلی یەکەم

## بڕیار...

## ڕێگەیەك بەرەو سەرکەوتن



(( نهێنـــی ســـەرکەوتنی ژیــان لــەوەوە سەرچــاوە دەگرێــت کــە مرۆڤێــك ئامــادەی قۆستنەوەی ئەو هەلەبێت کە بۆی دەڕەخسێت))

**بنیامین دیزرالی**

# 1- هێزی بڕیاردان:

**((هیچ شتێك نییە ڕێگری هیمەتم بێ، خۆ دورخستنەوەش لە هەر هەوڵێکی هەڵە جگە لە هەنگاوێکی تر بۆ پێشەوە هیچی تر نییە))**

**تۆماس ئەدیسۆن**



سەربارى ئەوەى هەوڵەکانی تۆماس ئەدیسۆن نزیکەی دەهەزارجار شکستی هێنا، بەڵام بەردەوام بوو تاوەکو گڵۆپی کارەبایی دۆزییەوە، هنری فۆردیش پێنج جار مایە پووچ بوو بەر لەوەی بە مۆدیلی T سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، واڵت دیزنی شەش جار شکستی هێنا بەر لەوەی شاری دیزنی لاندی بەناوبانگ دروستبکات. ئەوکاتەی ١,٠٠٧ چێشتخانە بیرۆکەی مریشکی کنتاکی ڕەتکردەوە کولونیل ساندرز کۆڵی نەدا تاوەکو (KFC ) قایلمەندی پێ بەخشی. کەواتە خاڵی هاوبەشی هەموو ئەو کەسە سەرکەوتوانە چییە؟ بێگومان پابەندی و پێداگیری، بەڵام ئەم هێزەی لەکوێوە هێناوە؟ بە بڕیاردان دەستی پێکردووە، هەموویان بڕیاریانداوە بۆ ئەنجامدانی ئەوەی پێویستە بۆ سەرکەوتن، بێگومانیش توانییان هەموو کارێکی پێویست ئەنجامبدەن بۆ بەدیهاتنی سەرکەوتنی باو، ورد و دروستتریش دەبێت گەر بڵێین: ئەم کەسانە خۆیان ڕێگەی سەرکەوتنی خۆیان دروست کردووە، ئەمەش ڕەگەڵ وتەکەی هانیباڵدا هاوتایە: "**یان ڕێگەیەك دەدۆزینەوە، یاخود ڕێگەیەك دروست دەکەین**".

کەچی تۆ گرنگی بە دروستکردنی ڕێگەت نادەیت و گرنگ نییە بەلاتەوە ئێستا تۆ کێیت یاخود چی دەکەیت؟ بۆنمونە: ئەو شێوازەی بۆ دانیشتن هەڵت بژاردووە، ئێستا، ئەو شێوازەی خۆراکی پێ دەخۆی و پێی دەجوڵێیتەوە، ئەو شێوازەی ئەم پەڕتوکەی

پیّ دەخوێنیتەوە یاخود لێی دەناڵێنی یاخود بە چارەی دەبینی، **هەروەها ئەو ڕێگەیەی** ئامانجەکانی پێ دەبینی و کاتەکانتی پێ ڕێك دەخەیت، لەگەڵ خەڵکدا ڕەوتاردەکەیت هەموو ئەمانە لە بڕیاردانەکانتەوە سەرچاوە دەگرن، ئەم بڕیارەش یان ئەوەتا بە تەواوی هۆشتەوە داوتەوە یان بەبێ هۆش و وشیارییەوە بڕیارت لێداوە و تەنانەت گرنگی بە بڕیاردانیش نادەیت، ئەمەش بۆخۆی بڕیارە(( **بڕیاردان بۆ بڕیارنەدان**)).

گەر کردارەی بڕیاردروستکردن تا ئەم ئاستە بەهێز و گرنگە، گەر یەکەمین کارە بۆ بەڕێوەبردن و هەڵسوڕاندن، بەجۆرێك بەشێکی سەرەکی ژیان پێکدەهێنێت، کەواتە بۆچی بە شتێکی نارەحەت و نەکردە لێی دەنواڕی؟ بۆچی هەرتاکێك ئەنجامی نادات؟ بۆچی بۆهەمووان بووەتە کێشە؟ وەڵامەکەش خۆی لە ترسدا دەبینێتەوە... ترس لە شکست" چون هەر بڕیارێك بۆخۆی هەڵگرتەی چەشنێك لە سەرکێشی و مەترسییە و ئەمەش مانای دۆڕانە—لای زۆر کەس. هەندێك پێیان باشە لە شوێنێکی ئاسایشدا بمێننەوە و توانا شاراوەکانیان بەکارنەهێنن"چون لە دانی بڕیای هەڵە دەترسێن. بەڵام تۆماس ئەدیسۆن، واڵت دیزنی، هنری فۆرد، لۆنیل ساندەرز، گاندی و زۆێتریش لە بڕیارداندا سەرکەوتوو بوون، پابەندی بەجێ هێنانی بوون.

لەوانەیە نەزانی کە توانای گۆڕاندنی شتەکانت پترە لەوەی هەستی پێدەکەیت، ئەمەشت چنگ ناکەوێت مەگەر ئەو کاتانە نەبێت کە خۆت بڕیاردەری خۆت دەبیت و دەپرسیت: چۆن دەتوانم ئەمە بەدیبهێنم؟ وەڵامەکەش ئەوەدەبێت کە: **خۆت بناسەوە و خۆت بدۆزەرەوە**. بابلیلیۆس سیرس دەڵێت: (( **هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ زانینی ئەوەی کەسێك دەتوانێ چی بکات مەگەر هەوڵێکی بۆ بدات))** .

زۆر بەڕێوەبەر هەن هەموو شتێك ئەنجام دەدەن بۆ دووركەوتنەوە لە بڕیاردان. ئەم کارە بە کەسێکی تر دەسپێرن بۆئەوەی لەم ترس و سەرکێشییە بەدووربن، ئەم جۆرە کەسانە پێویستیان بەفێربوون و یادگرتنی بەهرە و شێواز گەلێکە یارمەتیدەریان بێت بۆ دانی بڕیاری تەندروست.

ئـەم بەشـەت پێشدەسـت دەخـەم کـە یارمـەتی دەرت دەبێـت بـۆ گەشـەپێدانی ئـەو ماسولکەیەی کە کاری بڕیاردانی لەئەستۆ دەبێت، هەروەها بۆ تێگەیشتنی ڕاستەقینە لـە بڕیارەکان و بوون بە بڕیاردروستکارێکی ناوازەش.

## ٢-هەشت جۆر بڕیاردەر:

**(( هیچ كەس نیە لەوە كەساس و كلۆلتربێت كە بڕیارنەدان بووەتە تاكە خووی)) .**

**ولیام جیمس**

یەكەمین هەنگاو بۆ دانی بڕیاری دروست ناسینەوەی شێوازی گونجاوی خۆتە بۆ بڕیاردان، هەروەها ئاشنا بونە بە شێوازی بڕیاردانی ئەوانی تریش. هەشت جۆر بڕیاردەر هەن، بەم شێوەیە:

### ١-سەركێشی خواز:

ئەم جۆرە كەسە كەم حەوسەڵە و بێ جیقڵە، ئەم كەسە حەزی بە سەركێشی و جەربەزەییە، خاوەنی كەسێتییەكی بەهێزە، زۆر گرنگی بە زانیاریەكان نادات و بەخێرایی بڕیاردەدات و بەهۆیەوە زۆرجار توشی بێ ئومێدی دەبێت.

### ٢-خۆ بە دوورگر لە كێشەكان:

ئەم جۆرە كەسە بڕیاردەرانە هەموشتێك ئەنجام دەدەن تەنها بۆ ئەوەی لە بڕیاردان وەدووربن. ئەم كەسانە پێیانە باشە كەسێكی تر لەبریياندا بڕیارەكە بدات. خووی هەمیشەیی خۆ دوورگرتنە لە توشبوون بە كێشە. ئەم جۆرە كەسانە زۆر سەرزەنەشتی ئەوانی تر دەكەن، لۆمەی ئەو كۆمپانیا یان حكومەتە دەكەن كە ناچاریان كردووە بۆ بڕیاردان.

### ٣-دوودڵ یان ڕاڕا:

ئەم جۆرە كەسانە ناتوانن بە ئاسانی بڕیاری كۆتایی بدەن، گەر بڕیارێكیشیان دا ئەوا زۆرجار هەڵدەگەڕێنەوە و لێی پەژیوان دەبنەوە ئەوجا دەشی گۆڕن. ئەم ڕێگە

ناجێگیرەی بۆ بڕیاردان گرتویانەتەبەر زۆرجار دەبێتە هۆی نانەوەی کێشـە و ئاریشـە لـە نێوان خۆی و گەورەترەکانیدا.

### ٤-خاوەن لۆژیك:

ئەم جـۆرە کەسـانە هـیچ کـات بڕیـار نـادەن تـاوەکو زۆرتـرین زانیـاری کۆدەکەنـەوە. کرداره(عەمەلیـە)ی کۆکردنـەوەی زانیـاریش کـاتی زۆری پێویسـتە، بۆیـە ئـەم کەسـانە زۆرجار لە بڕیاردان دوادەکەون و بەهۆیەوە توشی پەژیوانی دەبنەوە.

### ٥-لێکۆڵەر:

ئەم کەسە زۆر بەگومانە، حەزی لەوەیە خۆی لە شتەکان بکۆڵێتەوە پێیان ئاشـنابێت، لە دەورو‌پشتی بکۆڵێتەوە و بپرسێت بەر لەوەی بڕیارێـك بـدات کـە پشـت بەسـتووە بـەو زانیاریانەی کۆی کردونەتەوە.

### ٦-بەسۆز:

ئەم چەشنە کەسانە بۆ بڕیاردان پشـت بـە سـۆز و هەسـتەکان دەبەسـتن. ئـەم کەسـە متمانەی بە پەیبردنەرووداو(حەدەس)ی خۆی هەیە، هەرگیز نایەوێت ئازاری کەس بـدات، پاش لە گوێگرتن لەکەسانی تر بڕیارێك دەدات هەڵقولاوی هەناویەتی.

### ٧-دیمۆکراتی:

ئەم جۆرەی مرۆڤ حەزی بە کۆکردنـەوەی دەسـتەی کارەکەیـەتی بـۆ ڕاوەگرتنیـان لـە بارەی دۆخە تێکەوتوەکەیانەوە. ئەم چەشنە کەسانە بڕیارەکانیان پشت بەستە بـەکۆڕا، پشتگیری دەستەیی" بەلاّ ئەو کێشە تایبەتیانەی توشی ئەم جـۆرە کەسـانە دەبێـت لـەم کاتەدا ئەم کەسە کەسی وەهای دەست ناکەوێت بۆ ڕاوێژکردن پشت پێ بەستراوبێت.

## ٨-خاوەن بڕیاری(دوایین سات):

ئەم جۆرە مرۆڤە تاوەكو دوایین سات چاوەڕوانە ئەوجا بڕیار دەدات، یاخود چاوەڕێ دەكات تاوەكو دەكەوێتە ژێر گوشارەوە، لەم كاتەشدا جگە لە بڕیاردان هیچ ئەگەرێكی دیكەی دەپێش نابێت.

**ئێستاش**..تۆ كام جۆرە بڕیاردەریت؟ كام جۆر بە باشترین دەزانی؟

**بەزۆری**..لە زۆرێك لەو كۆڕانەی دەیبەستم خەڵكان لێم دەپرسن: كام جۆر لەم كەسانە باشترینیانە؟ منیش هەمیشە دەڵێم: هیچ كام لەم هەشت جۆرە لەوانی تر باشتر نییە. دەتوانی تۆیش بە خاوەنی شێوازێكی تایبەتی بیت كە ئەم جۆرانە هەمووی لەخۆ بگرێت و تەرزی گونجاوی تۆ بۆ بەڕێوەبردن بنوێنێت. گرنگ ئەوەیە چاوت بخەیتە سەر یەك وشە(( كشۆكی-مرونەت)) و بەپێی ئەمە رەوتاربكەیت. ڕەنگە شێوازی بڕیاردانت دیمۆكراتیانەبێت كەچی بەپێی قایلمەندی بە كۆمەڵ بڕیاربدەیت. بەڵام زۆرجار پێویستت بەوەیە پشت بە لۆژیك ببەستی و زانیاری زۆر كۆبكەیتەوە. لە جارەكانی تردا كە پێویستی كرد دەتوانی پشت بە پەیبردنەڕوداو( حەدەس)ت ببەستیت و متمانەی پێبكەیت. كلیلەكە ئەوەیە كشۆك بیت جا بە بەهەر ڕێگەیەكیش بڕیاربدەیت.

## ٣- دە هۆکار بۆ بڕیاردانی هەڵە:

**(( سەریاری فرەیی... کەمیش لەبونە))**

**هیپۆکراتس**



ئـەو کاتــەی هۆکارەکـانی پشــت بڕیـاردانی هەڵــە دەزانیت، ئەمە بۆخۆی یرمەتی دەرت دەبێت بۆئـەوەی باشـتر خـۆت ئامادەبکـەیت" گـەر دووچـاری دۆخــی هاوشـێوەی ببیتــەوە، لێـرەدا گوتەیــەکی فیرجیلــت بیردەخەمەوە، کە دەڵێـت: " **لـەو مرۆڤـە بەختـەوەرتر نییە کە بە هۆکاری پشت شتەکان ئاشنایە**"، لێرەشـدا دە هۆکارت بۆ دەخەینەڕوو کە هۆکاردەبن بۆ بڕیاردانی هەڵە:

### ١-دودڵی و گوشاری کار:

ئەوکاتەی بە ڕاستییەوە دەکەویتە ژێر گوشارێکەوە، ڕەنگە ئەمە ببێتەهۆی ئەوەی کە بەیەکـەم بیرۆکـەی بۆهـاتوت قایـل بیـت و بـەبێ گرنگیـدان بـە بیرۆکـە گـەلیتر بڕیـاری لەســـەربدەی. دودڵــی دەتخاتــە دۆخێکــی ئــاوەزی ناسروشــتییەوە، کاردەکاتەســـەر هەستەکانت، ئەمەش وەهات لێدەکات بڕیاری ناتەندروست بدەیت.

### ٢-پەیپێبردن(ئیدراك)ی هەستی(حسی):

کاتێك دەتەوێت ڕاستێتی دۆخێك دووپات بکەیتەوە کە توشی ئارەزووەکانت هـاتووە، بەڵام ڕاستی گـەلی پاڵپشـتی بونیـان نییـە، ئـەوا تـۆ لـەم کاتـەدا لایـەنگیری بیرۆکەیـەکت دەبیت، کە کۆکردنەوەی ئـەو زانیاریانـە لـەخۆدەگرێت کـە یارمـەتی بـڕوا و هەسـتەکانت

دەدات و دواتریش لەسایەیدا بڕیاردەدەی، بۆیە هەوڵەكانت لەبۆ پشتیوانی كردنی تێڕوانین و هەستە تایبەتیەكانت هانت دەدەن بۆ بڕیاردانی هەڵە.

**٣-ترس:**

گەر بیرۆكەیەكی پێشوەختت هەیە لەبڕیاردانی شكست خواردوو، ئەوا توشی ترس دەبیت لە شكست، جا گەر بتەوێت لە ئێستا یاخود لە داهاتووشدا بڕیاربدەیت هەمان شت ئەزمون دەكەیت. ئەزموانندنی شكستی پێشوو بڕواكانت بۆ دوبارە شكست خواردنەوە زیاد دەكات. ترس وەها لە مرۆڤ دەكات بەشێوەیەك هەست بكات كە هیچ بگۆڕ و هێزێكی نییە، بەندییەكە لەنێو ئەندێشە نەرێنیەكانیدا، ئەمەش هانی دەدات بۆ بڕیاردانی هەڵە. ئەمەش ڕاستێتی قسەكەی فرانسیس بیسكۆن دووپات دەكاتەوە كاتێك دەڵێت: **" هیچ شتێك نییە بتترسێنێت جگە لە خودی ترس"**.

**٤-توڕەیی:**

توڕەبوونیش هۆكارێكی سەرەكی هەڵە بڕیاردانە" چونكە لە دۆخی توڕەییدا بڕیارەكان پشت بەستن بەو زانیاریانەی كە ڕەنگە هیچ پەیوەندییەكیشی بە خودی بابەتە بنچینەییەكەوە نەبێت و بڕیاری لەسەر بدەیت. بۆنمونە: هەڵدەستیت بە وەدەرنانی كارمەندێك كاتێك تۆ توڕەیت، دواتر كە دادەمركێیتەوە پەشیمان دەبیتەوە. بەداخەوە زۆرێك لە بەڕێوەبەران لە دۆخی هەڵچون و توڕەییدا بڕیاردەدەن و دەشزانن هەڵەیە، بەڵام هەر بڕیاری لێدەدەن. توڕەیی وەك هوراس دەڵێت: **" جگە لە ماوەیەكی كورتی شێتێتی هیچی دیكی نییە"** .

### ٥-کارتێکاری دەرەکی:

ڕەنگە هۆکارێکی دەرەکی فاکتەری پشت هەستکردنت بێت بە داڕووخاوی. بۆنمونە: گەر چاوەڕوانی وەرگرتنی قەرزێکی گرنگیت، بانکەکەش ئاگادارت دەکاتەوە کە پێت نادرێت، یاخود گەر ڕوویدا کارکارێکی تایبەتمەند لەدەست بدەیت، یامەکو پەیوەندیت بە سەرگەورەکەتەوە باش نییە، هەموو ئەم کارتێکار و هاوشێوەکانی کاریگەری تەواوی هەیە لەسەر بڕیارەکانت، تەنانەت هانت دەدات بۆ دانی بڕیاری هەڵە.

### ٦-بیرکردنەوە ئاسۆ تەسك:

زۆرجار کە بە خێرایی بڕیارێك دەدەیت بۆ چارەکردنی شتێك یام دۆخێك بەخێرایی، ڕەنگە ئەم بڕیاردانە لە داهاتوودا کێشەی گەورەترت توش بکات، بۆنمونە: بەڕێوەبەرێك بڕیاری کەمکردنەوەی بانگەشە و ڕیکلام دەدات بۆ کەمکردنەوەی خەرجییەکان و زیاوکردنی داهاتەکان، بەلاّم ئەم کارەی هەلی قازانجی گەورەی داهاتووی لەدەست دەردەکات" لەداهاتوودا. زۆرجار بڕیاری پەلە هەڵەدەبێت و کارەکە پتر دەئالۆزێنێت.

### ٧-نمونەیی:

کاتێك دەتەوێت نمونەیی بیت، بڕیارەکانت تەندروست بن، ئەوا کاتێکی زۆرت پێویستە بۆ کۆکردنەوەی زانیاریەکان، ئەمەش بۆخۆی ناچارت دەکات بڕیاری هەڵەبدەی. کۆکردنەوەی زانیاریەکان کارێکی زۆرباشە، بەلاّم تەوەزەلی و دواخستنی کۆکردنەوەی زانیاریەکان ناچارت دەکات هەست بە دڵەڕاوکێ بکەیت" بەهۆی کەمی کاتی بەردەستی ماوەوە، ئەوجا بڕیاری هەڵەت لێوە سەرچاوە دەگرێت. لەم کاتەشدا گوتەیەکی بابلیلیۆس سیرست وەکو نمونە بۆ دەهێنمەوە کە دەڵێت: " **کاتێك لە بیرکردنەوە دەوەستین، ئەوا زۆرجار هەلەکانمان لەدەست دەردەچێت**".

## ٨-گرنگی نەدان بە خێرایی بڕیاردان:

بۆنمونە گەر ویستت شوێنی بانگەشەکردنەکەت لە ڕۆژنامەیەکدا بهێڵیتەوە، دواتر ئەم کارە هەڵبوەشێنیتەوە و بڵێی بۆ جاری داهاتوو، بەڵام کە دواتر دەتەوێت دیسانەوە بانگەشە لەو ڕۆژنامەیەدا دەست پێبکەیتەوە پێت دەڵێن: ئەو ماوەیەی قەوڵ بووە لە نێوانماندا تەواوبووە. گرنگی نەدان بە خێرایی بڕیاردان و تەمبەڵی تێداکردنی ناچارت دەکات بڕیاری هەڵە بدەیت. لێرەشدا گوتەیەکی کۆنفۆشیۆست بیردەخەمەوە کە دەبێژێت: **" گەر مرۆڤ هەستی بە کێشە دوورەکان نەکرد، ئەوا زارتر و دڵەڕاوکێدارتر دەبێت کاتێك نێزیکتر دەبێت".**

## ٩-ڕێك نەخستن و تێکەڵاوکردنی لەپێشییەکان(ئەولەویات):

ڕێکنەخستن و تێکەڵاوکردنی لەپێشییەکان، بە ناچارییەوە دەتخەنە ژێر کاریگەری دڵەڕاوکێ وە، کە ئەمەش ناچارت دەکات بڕیاری هەڵە بدەیت. کاتێك چەندین شت لەیەك کاتدا دەتەوێت ئەنجام بدەیت، ئەوا دەکەویتە دۆخێکی ڕاڕایی و خەمۆکییەوە، ئەوجا ناشتوانی بڕیاری تەندروست بدەیت، بابیلیلۆس سیرس دەڵێت: **" ئەنجامدانی دووشت لەیەك کاتدا، مانای ئەنجام نەدانی هەردووکیانە".**

## ١٠-بڕیاردان لەسەر بیستراو:

کاتێك لە هەموو ڕاستیەکان بێ ئاگادەبیت، گوێت بۆ قسەکانی خەڵك سوك دەبێت، ئەوجا خۆت ئامادەی بڕیاردانی هەڵەیش دەکەیت، ئمرسۆ دەڵێت: **" ناتوانی هەڵەبکەیت بەبێ گرفتاربوون بە هەڵە".**

هەموو ئەوانەی پێشووتر باوترین ڕێگە و هۆکارەکانی پشت بڕیاردانی ناتەندروستن، لەبەرئەوەی تۆ ئێستاکە دەزانی دەبێت چی نەکەیت، باشتر وەهایە ئامادەبیت فێری ئەوانەش بیت کە دەبێت بیان کەیت، بۆئەمەش مەنشۆس دەڵێت: **" پێویستە خەڵکی بڕیاربدەن دەبێت چی نەکەن، بۆئەوەی بە خرۆشەوە ئەوە ئەنجامبدەن کە بڕیاردەدەن بیکەن ".**

## ٤-دە ئامۆشیاری بۆ دانی بڕیاری دروست

((گەر بەری لیمۆت بۆ بەردەستە، دەبێت ئاوگیراوەی لیمۆ دروست بکەیت))

**پۆلیۆس ڕۆزینۆلد**



لەبەرئــەوەی هەنوکــە تــۆ شــێوازی بڕیاردانــت و هۆکارەکانی پشت هەڵە بڕیاردانت ئاشنایت، ئێستایش کاتی ئەوە هاتووە ئەو شێوازە کارایانە ئاشنابیت کە یارمــەتی دەرت دەبــن بــۆ بڕیــاردانی تەندروســت. لێرەشدا دە ئامۆشیاریت بۆ بەردەست دەخـەین لـەبۆ بڕیاردانی ڕاست و بێ مەلأم:

### ١-ڕاهاتن لەسەر بڕیاردانی ڕۆژانە و دووبارەکردنەوەی:

وەك لەپێشدا گوتمان کە : کردارەی بڕیاردان وەکو ماسولکە وەهایە، کەواتە پێویستی بـە مەشـق و بـەردەوامی پێدانـە بـۆ ئـەوەی بـەهێز و دروسـت بێـت. ئەوکاتـەی ڕۆژانـە بڕیاردەدەیت-تەنانەت گەر بڕیارەکانیش نا گرنگ بن-بەمەش خۆت بۆ کەسێکی خـاوەن بڕیاری تەندروست ئامادە دەکەیت و توانـای بڕیـاردانی پێویسـت و تەندروسـتت بـۆ چـێ دەبێت.

### ٢-لە ئەزمونەکانی پێشوترتەوە فێربە:

هەوڵبـدە لـە هەڵـەکانی پێشـوترتەوە فێربیـت و سـودیان لـێ ببینـی، هـەروەها لـە سەرکەوتنەکانیشتەوە فێربیت و کەڵکیان لێ ببینی.

### ٣-راوێژی شارەزایان بکە:

هەوڵی ڕاوەرگرتنی ئەو کەسانە بدە کە بەلاتەوە پەسەندن، ئەوانەی کە متمانەت بە بڕیار و داناییەکانیانە، هەوڵبدە لێیانەوە فێرببیت کە چۆن بڕیاردەدەیت، بەلاّم دەبێت ئەوەشت لەیادنەچێت کە تێڕوانینی شارەزایان بۆ بوارەکە یارمەتییەکی مەزن دەبێت بۆ بڕیاردانی تەندروست، بەلاّم مەرجیش نییە بە تەواوەتی بێ خەوش بێت.

### ٤-وای دابنێ تۆ کەسێکی تریت:

هەوڵی ڕوانین لە دۆخەکەت بدە لە چاوی کەسێکی ترەوە، یاخود لە گۆشەی جۆراوجۆرەوە لە دۆخەکانت بڕوانە، ئەمە دەبێتەهۆی زیاوبوونی هەڵبژاردنەکانی پێشووترت، بەشێوەیەکی گشتی بۆ هەر کێشەیەك سێ ڕوانگە و بۆچوون بوونی دەبێت: تێڕوانینی تۆ، تێڕوانینی کەسێکی تر، تێڕوانینی ڕاست و دروست.

### ٥-لایەنگیر مەبە:

بەدووربە لەبڕیاردانی پشت بەست بە هەستکردن و سۆزەکانت بەرامبەر کەسێکی تر، دەبێت لەڕوانگەی جۆراوجۆرەوە لە دۆخەکە بڕوانیت و هیچ لایەنگیرییەکی تێدا نەبێت.

### ٦-وشیاربە لە لوتبەرزی پێگە:

ڕەنگە بڕوات وەهابێت تەنها لەبەرئەوەی پلەت بەرزە و نازناوت مەزنە ئیتر هەموو بڕیارەکانت دروستن؟! بەڵکو پێویستە بڕیارەکانت پشت بەست بە ڕاستیەکان دابمەزرێنی و نەکەویتە ژێر کاریگەری پۆست و پێگەی کارتێ کردوتەوە.

## 7-جێبەجێکردن:

کاتێك بڕیارێك دەدەیت، بۆنمونە: بڕیارت داوە ڕێژەی فرۆشەکانت بە ١٠٪ بەرزتر بکەیتەوە، بڕوای تەواوت بە گەیشتن بەم دۆخەت هەیە، پێویستە هەنگاوی شیاو بنێی بۆ زێدەترکردنی سەرکەوتنەکانت و سەرکەوتنی نەخشەڕێکانت لەخۆ بگرێت.

## ٨-بەکێش بە:

گەر بڕیارێکت دا، جێبەجێت کرد، هەوڵبدە کە بەکێش بیت و ئامادەی ئەنجامدانی چاکسازیی پێویست بیت بۆئەوەی پلانی سەرکەوتنت لەخۆبگرێت.

## ٩-لە گشتاندن خۆت بەدووربگرە:

کاتێك وشەگەلی گشتاندنی وەکو (( هەمیشە، هەرگیز، گشت)) بەکاردێنی بە درۆزن دیاردەکەوی، بۆنمونە گەر گوتت: (( من هەمیشە گرنگی بە کڕیارەکانم دەدەم))، ئەم چەشنە بانگەشانە و بەکارهێنانی وشەی هەمیشە بۆخۆی مانای ناڕاستی قسەکەیە" چونکە ناتوانی بەبەردەوامی کاری وەها ئەنجام بدەی. هەروەها کاتێك دەڵێی: (( من هەرگیز بڕیارێك نادەم مەگەر ڕاوێژی دەستەی کارکارم بکەم)). ئەم چەشنە دەستەواژانە ڕەنگە ببنەهۆی ناڕاست دەرخستنی قسەکانت. بۆیە پێویستە خۆت لە وشە گشتاندنەکان بەدووربگریت و بەدیاریکراوی لە دۆخ و شتەکان بدوێی" لەکاتی هەر چەشنە بڕیاردانێکدا.

## ١٠-بەدواداچوون:

بەدواداچوون هۆکارێکی گرنگ و بنچینەیی سەرکەوتن و شکستی کۆمپانیاکانە. هەربۆیە پێویستە بەدواداچوونی ئەو بڕیارانەت بکەی کە لە جێبەجێکردندان، دڵنیابیت

لەوەی هەمووان کار و بەرپرسیارێتی خۆیان دەنوێنن و ڕێزی ڕێچکەی کارەکە دەگرن.
لەبیرت بێت بەدواداچوون هەمان کاریگەری و گرنگی بڕیاردانی هەیە، بگرە زیادتریش.

ژیانی داهاتووت پشت بەستە بەو بڕیارانەی ئەمڕۆ دەیدەیت، بۆیە ژیانت باشتر دەبێت گەر بەباشتر فێری بڕیاردان بیت. لەمڕۆوە دەست پێبکە و بڕیاری سادە و ساکاربدە، لەماوەیەکی کەمدا فێری ڕۆیشتنەسەرەوە دەبیت بەسەر پلەکانەی سەرکەوتندا، دەتوانی بڕیاری باشتر و گرنگترین بدەی.

## ٥-چۆن بڕیارێکی بەکۆمەڵ دەدەیت؟

**(( ژیان یان سەرکێشییەکی جوامێرانەیە، یاخود هیچ نییە))**

**هیلین کیلر**



بڕیاری بەکۆمەڵ سودی زۆر و ئاوێتەی هەیە. هەوڵبدە لە نێو دەستەی کارەکەتدا بەرپرسیارێتی بڕیاردانی هاوبەش و متمانەی هاوبەش بئافرێنی.

**بۆئەوەی بڕیاری بەکۆمەڵ بدەیت، پێویستە ئەمانە ئەنجام بدەی:**

١- بابەتەکە بنوسەرەوە بۆئەوەی شیکردنەوەی بۆ بکەیت بە هەموو هەڵوێست و ڕوانگەکانەوە.

٢- لەبەرگیراوەیەکی بدەبە هەموو ئەندامانی کارەکە، لەبیرت بێت کە پێویستە هەموان بەباشی ئاشنای کێشەکەبن.

٣- داوا لە ئەندامانی دەستەکە بکە هەڵوێست و بۆچوونی شیاوی خۆیانی لەبارەوە بخەنەڕوو.

٤- هەموو تێڕوانینەکان بەراورد و دیاری بکە.

٥- دەنگی زۆرینە بۆ چارەی پێویست و شیاو بەدەست بخە" لەڕێگەی وەلأمدانەوەی ئەم چوار پرسیارەوە:

أ- چەندی تێ دەچێت؟

ب- مەترسیدارترین ئەگەر بۆ ڕوودان چییە؟ چۆن دەتوانین چارەی بکەین؟

ت- دەتوانین چی بکەین؟ چۆنیش لەسەری بەردەوامبین؟

پ- كاريگەرييە لاوەكييە دوور و نزيكەكانى ئەم بڕياردانە چين؟

٦- لە دەستەكە بپرسە و بزانە كاميان حەزى لە جێبەجێ كردنە، بەرپرسياريەتيەكانيش دياريبكە بۆ زامنكردنى سەركەوتن.

٧- دەبێت بەدواداچوونى جێبەجێ كردنى بڕياركە بكەيت، ئەنجامەكانيش ديارى بكەيت، وەك وەليام چيمس دەبێژێت: " كاتێك دەگەيتە بڕيارێك، جێبەجێى دەكەيت، پێويست چاو لە هەموو بەرپرسيارێتيەكان بپۆشى و گرنگى بە ئەنجام بدەى"، وەك وەليام چيمس دەبينێ هەر كاتێك هەلێكى بۆ بەشدارى كردن هەيە لە بڕياردانى بە كۆمەڵدا، لێرەوەش بڕيارەكان لەسەر بنەمايەكى پتەو دەدرێن و ئەنجامى خوازراو چنگ دەخات.

## ٦-چۆن بڕیاری تەندروست دەدەیت؟

(( گەر هەوڵ نەدەیت شتێك ئەنجام بدەیت دوورتربێت لەوەی فێری بوویت، ئەوا هەرگیز پێش ناکەویت))

ڕۆناڵد. ئۆسپۆرت

زۆرجار توشی هەندێك دۆخ دەبیت بڕیاری ڕاستەوخۆی بێ دواخستنی پێویستە، لەبەرئەوەی سەرکردەیت، پێویستە بە توانابیت بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەم چەشنە دۆخانە بە متمانە و وردی تەواوەوە، بۆئەمەش دەتوانی ئەم ڕێگایانە بۆ بڕیاردانی یەکلاکارەوەی تەندروست و متمانە پێکراو بەکاربێنی:

### ١-شێوازی پیر( کوڕی دانا):

کاتێك بنیامین فرانکلین توشی کێشەیەك دەهات کە چارەسەرێکی ڕاستەوخۆی پێویست دەبوو، دوو هێڵی ستونی لەسەر لاپەڕەیەك دەکێشا، لەسەر ستونی یەکەم دەینوسی ( بەڵێ)، لەسەری ئەوی تریش دەینوسی( نەخێر)، ئەوجا لایەنە ئەرێنیەکانی لەبەشی بەڵێدا دەنوسی و نەرێنیەکانیشی لەبەشی نەخێردا دادەڕشتەوە، هەرکام ستونێك زێدەتر بوایە ئەوەی بە ئەنجام وەردەگرت بۆ بڕیاردان:

| بەڵێ( هۆکارە ئەرێنییەکان) | نەخێر( هۆکارە نەرێنیەکان) |
| --- | --- |
| ١- ................................ | ١- ................................ |
| ٢- ................................ | ٢- ................................ |
| ٣- ................................ | ٣- ................................ |
| تێکرا | تێکرا |

## ٢-ڕوانین لەکێشەکە لە گۆشەی جۆراوجۆرەوە:

دەبێت لە گۆشەی تازەوە لە کێشەکان بڕوانیت، جێگرەوە گەلێك بدۆزیتەوە کە بتوانێت یارمەتیت بکات لە کردارەی بڕیاری دروستدا.

| دۆخەکە | دۆخەکە لەڕوانگەی جۆراوجۆرەوە |
| --- | --- |
| *خەرجکردنی پارە بۆ نوێکردنەوە. | *ئافراندنی کەشێکی باشتر بۆ کارکردن و باشترکردنی ڕاژەی پێشکەشکراو بە کڕیار. |
| *زیادبوونی تێچوونەکانی بانگەشە. | *بانگەشەی فراوان، قازانج و فرۆشی زۆر. |
| *زیادبونی خەرجیەکانی مووچە. | *زیادبونی سود لەڕێگەی دامەزراندنی کارمەندی زۆرترەوە. |
| *دەرکردنی کارمەندێك. | *یارمەتی دانی بۆبەرجەستەکردنی داهاتووی لە جێگەیەکی باشتر . |

ڕوانین لەکێشەکان لە ڕوانگەی نوێوە هەڵبژاردنی زۆرت بۆ بەردەست دەخات و بۆچوونی فرەجۆریشت بۆ دەستەبەر دەکات کە لای خۆیەوە یارمەتیت دەدات بۆ دانی بڕیاری باشتر.

## گرنگ

((کاتێك پابەندیت پێویستە بڕیاری یەکلاکارەوە بدەی، دەبێت وردتر و خۆپارێزتر بیت، هەوڵبدە بەر لە بڕیاردان بەجوانی و بەکاتێکی باش بیر لە بڕیارەکانت بکەیتەوە)).

## ٧-ڕێزگرتن لە خوود و کردارەی بڕیاردان :

**((گرنگترین دۆزینەوەی هاوتەمەنانم، ئەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێت ژیانی بگۆڕێت" گەر بتوانێت ئاراستە ئاوەزیەکانی بگۆڕێت)).**

**ولیام جیمس**



ڕێزگرتنی خود کاریگەری ڕاستەوخۆی دەبێت لەسەر هەموو لایەکانی ژیان، تاوەکو پتر ڕێزی خۆت بگریت خۆشەویستیت بۆ خۆت زێدەتر دەبێت، بڕیارەکانت باشتر و دروستتریش دەبن. ڕێزگرتنی خود کلیلی سەرکەوتنە، ڕەگەزی سەرەکی ژیانێکی بەختەوەرە. کەواتە ڕێزگرتنی خود چییە؟ چۆن دەتوانی بەدی بهێنی؟ ناشانیل براندین نوسەری پەرتوکی ( چۆن ڕێزگرتن لە خود بەدیدەهێنی) وای دەبینێ کە: ڕێزگرتنی خود شێوازی هەستکردن و بڕوابوونە بەرامبەر بەخۆت. ڕێزگرتنی خود هەستکردنە بە ئاشتی هەناوی لەگەڵ دەروندا.

زۆر کەس بڕوایان وەهایە کە هەستکردنی باش بەرامبەر بە خود، لە بڕیاری نەدروستەوە سەرچاوە دەگرێت. بەڵام ئەمانە پێچەوانەکەی تێگەیشتون"چونکە ئەوە بڕیاری ڕاستە لە هەستکردنی باش بەرامبەر خودەوە هەڵدەقوڵێت، نەوەك پێچەوانە. ئەم هەستە باشانە بەشێوەی وێنەی هەناوی کەسەکە دیاردەکەوێت، لەبری ئەوەی لەم ڕوانگەیەوە بڕیاربدەی، یان بڵێی: ناتوانم بڕیاری دروست بدەم، ئەوا لەم چەشنە تاوتوێ کارییە نەرێنیانە لەگەڵ خۆتدا خۆت بەدووربگرە" چونکە هەستکردنی خۆ بەکەم زانین لە هەناوتدا بەرجەستە دەکات، ڕەنگە ئەمەش بەسەر خۆتدا زاڵبکەیت و نەزانیت کە زۆر

خـەڵك بـەم هۆیـەوە توشـی شكسـت هـاتوون و زۆر دامـەزراوە و كۆمپانیـاش بـەهۆی بیركردنەوە لە وشەی (ناتوانم)ەوە لەلایەن خاوەن و بەڕێوەبەرەكانیەوە توشی مایە پوچ بوون هاتوون.

**((ئەوەی لەدەستمان ڕۆیشتووە و ئەوەشی چاوەڕوانمانە بێ بەهادەبێت گەر بەراوردی بوونی هەناومانی بكەین))**

**ڕالف و.ئیمرسۆن**

## چۆن ڕێزی خودیت پونیات دەنێیت ؟




١-تێبینی ئەو وشانە بکە بەخۆتی دەڵێی.

٢-بەپێی توانایی خۆت ئەم دێڕانە دووبارە بکەرەوە.

- هەموو ڕۆژێك ڕێزگرتنم لە خودم باڵاتر دەبێت.
- من خۆمم خۆش دەوێ و ڕێزی خۆیشم دەگرم بەبێ مەرج.
- دەتوانم بە ئاسانی بڕیاربدەم.
- من بڕیار دروستکارێکی ناوازەم.

٣-تەمەنت دابەشی سێ قۆناغ بکە.. گریمان ئەنجامەکەت ١٥ دەرچوو..

- ئێستایش سێ بڕیاری ڕاست بیری خۆت بخەرەوە کە لەو کاتەوەی لەدایك بوویتە تاوەکو تەمەنت گەیشتۆتە ١٥ ساڵ داوتە، تۆماری چۆنێتی کارتێکردنی ئەم بڕیاریانەت بکە لەسەر هەستەکان و باشترکردنی ژیانت.
- هەمان شت بۆ ماوەی نێوان ١٥ -٣٠ ساڵیت دووبارە بکەرەوە.
- هەمان شتیش بۆ تەمەنی ٣٠-٤٥ ساڵی تەمەنت.

ئێستایش... تۆ خاوەنی ٩ بڕیاری بەهێزی، بڕیارگەلێك وەهای لێ کردووی هەست بە مەزنی خۆت بکەیت. ئەمەش بەڵگەیە بۆئەوەی کە تۆ توانیوتە بە درێژایی تەمەنت نۆ بڕیاری دروست و یەکلاکارە بدەی. جار نا جارێك ئەم بڕیارانە بخوێنەرەوە، بۆ بەهێزکردنی ڕێزگرتن لە خودت پەنایان تێبگرە. لەمڕۆوە دەست پێبکە، متمانەت بەخۆت هەبێت، دەشتوانی سەرکەوتووبیت، تواناداردەبیت کە بڕیاری تەندروست بدەی.

لێرەشدا گوتەيەكی ئو ج.ماندينۆ ت بير دەخەمەوە كە دەڵێت: " **هەميشە تێبكۆشە، ئەوەی ئەمڕۆ دەيوەشێنی سبەی بەرەكەی هەڵدەگريتەوە))**.

د. نۆرمان ڤينسينت بال دەبێژێت: (( **ئەوكاتەی بيركردنەوەكانت دەگۆڕيت، تۆ بەم كارەت هەموو جهانت دەگۆڕيت))** .

## ٨-کرداره(عەمەلەیە)ی بڕیاردان:

**((کاتێك دۆخەکە پەیوەست دەبێت بە تایبەتمەندیی بالآوە، بەس سەرلێدەرکردن بەس نابیت، بەڵکو پێویستت بە هەوڵە بۆ یادگرتنی زانین و قۆستنەوەی))**

**کۆنفۆشیۆس**

زانین هێزە!! .. ئایا ئەمە ڕاستە؟ بەتایبەت لەم چەرخەماندا (چەرخی زانیاری)، بەلآم ئەم زانینە تەنها بەشێوەی زانیاری دەمێنێتەوە گەر نەیخەیتە بواری جێبەجێکردن و بەکارهێنانەوە. لەم بەشەدا هەموو بنەماکانی بڕیاردانی دروستم پێشکەش کردی، بەهیوام پەیامی چۆنێتی ئەنجامدانیم پێ ناساندبیت.

ئەرەستۆ دەڵێت: **(( مرۆڤ بنچینەی هەموو ئەو شتانەیە ئەنجامی دەدات))**، تۆمارس هکسلی دەڵێت: **(( ئامانجی بالآ لە ژیاندا زانین نییە، بەڵکو کارە))** .

(( چەند خولەکێك لەکاتەکانت بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە پەسەندە تەرخان بکە" بۆئەوەی لەمڕۆوە بەسەر پلەکانەی سەرکەوتنندا بەرەو سەرێ هەنگاوبنێی)).

١-سێ بڕیار بنوسەرەوە کە پێشتر نەختێك دوات خستوون. نەخشەی کارت دیاریبکە، کاتی گونجاویش بۆ هەر بڕیارێك تەرخان بکە:

| بڕیار | نەخشەی کار | دوا کات | ئەنجام |
|---|---|---|---|
| ١- | | ................... | |
| ٢- ............ | | ................... | |
| ٣- | ................... | | |

٢-ئێستاش دەست بە جێ بەجێكردن بكە، پەيوەندى تەلەفۆنى ئەنجام بدە، كۆبونەوە ببەستە، قسەلەگەڵ ئەم كەسدا بكە، نامە بۆ ئەويتر بهەنێرە، گرنگ ئەوەيە بڕيارەكەت بچێتە بوارى جێبەجێ كردنەوە.

گومانى تێدانييە كە تۆ جاربەجار بڕيارى هەڵە دەدەيت، بەلأم گرنگ ئەوەيە تێبگەى كە دۆخێكى سروشتييە مرۆڤ هەڵەبكات. لەڕاستيدا وەك سيگمۆند دەڵێت: **(( لەكاتێكدا مرۆڤ لە هەڵەيەكەوە بۆ هەڵەيەكى تر دەگوازێتەوە، ڕاستى تەواوى بۆ دياردەكەوێت)).**

گرنگى ئەم هەلأنە لەوەدا دياردەكەوێت لێيانەوە فێربيت، فێربيت كە چۆن لەداهاتوودا بڕيارى گونجاو دەدەى.

بە ئازايەتى و بوێريى خۆت چەكداربكە" بۆئەوەى هەرئێستا بڕياربدەى. ئەوەت لەبيربێت كە هيلين كيلر گتويەتى: **(( ژيان يان سەركێشييەكى بوێرانەيە، ياخود هيچى تر نييە)).** هەموو سەركەوتنێكى مەزن پريشكى يەكەمى بە بڕيار دەستى پێكردووە.

**پێداگيرى بكە لەوەى ببيتە بڕياردەرێكى سەركەوتوو.**



# کلیلی دووەم

## هاندان ..

## هێزی پاڵنەری جیاکردنەوەی مرۆڤایەتی



((هەموو کردارەکانت –جا ڕەگەزنامەت هەرچییەك بێت، یاخود کار و پیشەی ئەنجام دراوت چی بێت– لە ڕەگەزی هاندانی هەناوتەوە سەرچاوە دەگرێت، جا ئەم هاندانە ئەرێیی بێت یاخود نەرێنی))

د.ئیبراهیم فەقی

## ٩-هاندان.. چییە؟ مانای چییە؟ :

**(( ئەو کارە سەرەکیەی کە مرۆڤ لە ژیانیدا دەکەوێتە ئەستۆی، ئەوەیە بدوێ و خۆی ئاراستەبکات))**

**ئارش فرۆم**



تۆیش لەگەڵ مندا هاوڕای لەوەی کە: گەر هاتوو ڕەگەزی هاندان و بزواندنمان لەدەستدا بەهای کاریشمان لەدەست دەدەین؟ ئایا کەسێك دەناسی خاوەنی ئیشێکی باش بوبێت" چێژی لێ بینی بێت، پلەکەشی باش بوبێت، بەلاّم سەرباری ئەوەش کەچی دەستی لەکارکێشابێتەوە لەبەرئەوەی هاندانی نەماوە و وروژێنەرەکانی لەدەستداوە؟

کاتێك هاندراو دەبیت، ئاستی نواندن و ئەنجامدانت لە ترۆپکدا دەبێت، ڕاستییەکی دروستیشە،کاتێك هاندانت لەدەست دەدەیت ئاستی نواندن و ئەنجامدانت کەم دەبێتەوە، ئێستا پتر لە هەر کاتێکی پێشتر هاندان بووەتە جێگەی باس و بایەخ، پەڕتوکی زۆری لەبارەوە بلاّوبوەتەوە، کە دووپاتی گرنگییەکەی دەکەنەوە. هەنوکە بەڕێوەبەرگەلێکی زۆر هەوڵی فێربوون و یادگرتنی هونەرەکانی هاندان و هاندەرەکان دەبن، لەگەڵ چۆنێتی بەکارهێنان و قۆستنەوەی بەرامبەر کارمەندەکانیان" بۆ ئەوەی باشتر کاربکەن و بەهۆیەوە بەئامانجی خوازراو بگەن و قازانجی بالاّی ویستراو چنگ بخەن.

ڕەنگە تۆیش بپرسیت: ئەی هاندان چییە؟ ئەم وشەیە لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە؟

ئەم وشەيە لە كۆنە وشەيەكی يۆنانييەوە وەرگيراوە و مانای بزواندن و جولاندن دەگەيەنێت. فەرهەنگی ويستر هاندان بە كار دەناسێنێت، ياخود گوتنی شتێكە پاڵ بە كەسێكەوە دەنێت بۆئەوەی كارێك ئەنجام بدات، لە زمانی ئينگليزيشدا وشەی هاندان Motivationدەتوانرێت بە Motive-action يش بخوێنرێتەوە، واتە: **هاندان كردارێكە لە هاندەرێكەوە سەرچاوە دەگرێت.** بەڵام ئەم هاندانە لە كوێوە هەڵدەقوڵێت؟

د.دينيس واتلی – نوسەری پەرتوكی( هاندان لە رووی دەروونييەوە)–دەڵێت: (( هاندان لە ئارەزوەوە سەرچاوە دەگرێت، كاتێك ئارەزووەيەكی پتەو و بەهێزت هەيە بۆ بەديهاتنی ئامانجێكی دياريكراوت، ياخود ئەوكاتەی جۆرێك كێشەت دووچار دەبێتەوە، لەو كاتەشدا تۆ دەتەوێت گۆڕانێك بەرەو ئاستێكی بالاتر ئەنجام بدەيت، ئەوا تۆ هاندراو دەبيت، لەم وەختەشدا كە تۆ لە لوتكەی هاندان‌دا دەبيت بەرەو بەديهاتنی ئامانجەكەت هەنگاو دەنێی، بۆ بەديهاتنی ئەم ئامانجەشت هيچ لەمپەر و داڕووخاوييەك نابێتە رێگرت)) .

## ١٠-کرداره(عەمەلیە)ی هاندان :

(( ڕەنگە یەکێك بێت لە پەرچوەکانی ژیان، ئەوەی کە هەرچییەك لە ئاستی لوتکە نزم تربێت تۆ ڕەتی بکەیتەوە، ئەوا تۆبە لوتکەت دەگەیت)).

سۆمرست مۆم

بەرلە قۆستنەوەی هێزی مەزنی هاندان بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکان، پێویستە لەسەرەتاوە خودی کردارەی هاندان ئاشنابی و فێری بیت.



### ١-ئارەزوو:

هاندان بە بوونی ئارەزوویەکی بەهێز بۆ بەدیهاتنی ژیانێکی باشتر دەست پێدەکات.

### ٢-وادانان :

وای دابنێ کە تۆ خەونەکەت بەدی هێناوە، تۆ بەڕاستی لەنێو خەونەکەتدا دەژیت.

### ٣-قسەکردن لەگەڵ خۆدا:

لەگەڵ خۆتدا قسەبکە، بەشێوەیەك هێزت پێ ببەخشێت، هیمەتت بوروژێنێت، لەبیرت بێت هەمیشە بەخۆت بڵێ: دەتوانم ئەمە ئەنجام بدەم، دەتوانم ئەنجامی بدەم... بەردەوامبە لەسەر وتنەوەی ئەم دروشم و قسەیە تاوەکو دەبیتە بەشێك لە کەتواریت.

**٤-کردار( جێبەجێ کردن):**

زانین و هێزت بخەرە بواری کردارییەوە، لەبیرت بێت پێویستە ببیت و ئەنجامبدەیت و بەدەستی بێنی ئەوەی دەتەوێت.

**نمونەیەك بۆتۆ:** گەر خەون بەوەوە دەبینی بە بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای ئیش تێکراوت بیت، چاوانت دابخە، وای دابنێ تۆ بەڕاست بەم پێگەیە گەیشتووی، ئەوجا دە جار بەدوای یەکدا بڵێ: من دەتوانم بەمە بم.. ئەوجا دەستبکە بەکارکردن بۆ بەدیهاتنی ئەم ئامانجە مەزنەت. دایڤید ڤیسکۆت دەڵێت: " **دەست پێبکە و وای دابنێ بەوکەسە بویتە کە دەتەوێت ببیت)).**

## ١١-سێ جۆرەکەی هاندان:

(( لای کەسانی تازە دەست بۆ بردوو ئەگەرەکان زۆرن، بەڵام لای شارەزا کەمە ))
**شاتریۆ سوزوسکی**

**١-هاندەری مانەوەی بنچینەیی:**

ئیبراهیم ماسلۆ دەبێژێت: (( **گرنگترین بزوێنەری مرۆڤ هاندەری مانەوەیە**))، ئەم چەشنە هاندەرە هەموو پێویستییە بنچینەییەکانت دەگرێتەخۆ، وەکو: خۆراك و ئاو و ئەو هەوایەی هەڵی دەمژیت، گەر یەکێك لەم پێویستیانەت لەدەستدا ئەوا پاڵنەرێکت لە هەناوەوە بۆ چێ دەبێت و ناوەندەکانی دەماری جۆراوجۆرت لە مێشکدا بۆ دەبزوێنێت، لەکاتێکدا هەڵچونەکانی خانە دەمارییەکانت زیادەبێت، تۆ بە جەستە هاندەرێیت بۆ ئەنجامدانی ئەوەی پێویستە لەبۆ بەدیهاتنی تێری ئەم پێویستییە.

هەر کە ئەم ئاتاجییەت تێربوو دۆخت دەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی، بەخۆ دوورگرتن لە ئاڵۆزاندن نمونەیەکت پێ دەبەخشم:

گەر ڕۆژێك پاش ماندوبونێکی زۆر گەڕایتەوە ماڵێ، ئەوەندە شەکەت بووی نەتدەتوانی هیچ شتێك ئەنجام بدەیت، لەناکاو.. گوێت لەدەنگێك دەبێت کە هاواردەکات: ئاگر.. ئاگر.. دەنگی ئاگادارکردنەوەی کەوتنەوەی ئاگر دەبیستی، خەڵکی لێرە و لەوێ بەرەو دوور لە ئاگرەکە دەڕۆن، ئەی تۆ چی دەکەیت؟بێگومان تۆیش وەکو ئەوان ئەنجام دەدەیت و بەرەو دوور لە ئاگرەکە دەڕۆی. کەواتە ئەم هێزی ڕۆیشتنەت لەکوێوە بۆ هات؟ وەلامەکە: تۆ بە هاندەری مانەوە پاڵپشتی کرابووی بۆ ئەوەی گیانی خۆت ڕزگاربکەیت. بەڵێ، ئائەمەیە لە هەناوتەوە ئەو وزەیەی پێ بەخشیویت کە بە هۆیەوە دەتوانی خۆت ڕزگاربکەیت.

لە کۆڕێکدا لێیان پرسیم: ئایا هاندەری مانەوە دەتوانێت کەسێك بجوڵێنێت کە نەخۆش بێت و تازە لە نەخۆشخانە وەدەرکەوتبێت؟ گوتم: بەڵێ، وای دابنێ سەگێکی

زۆر برسی و هار لە نزیکیەوەیەتی و لەناکاو پەلاماری دەدات، دەبینیت کە خێراتر لە ڕاکەرانی گۆرەپانەکان هەڵدێت. بەشێوەیەکی گشتی کە دۆخەکە دێتەسەر مانەوە تۆ دەبیتە داهێنەر، بەئاگا، هاندراو، وای دابنێ کە هەموو کاتێك ئەم هاندەرەت هەبێت دەبینی دەبیتە داهێنەرێکی مەزن و ئەو ئەنجامانەی بەدەستی دەهێنی ناوازە دەبێت.

## ٢-هاندانی دەرەکی

ئەم چەشنە هاندانە لە چوارچێوەی دەرەوەوە سەرچاوە دەگرێت، بۆنمونە: لەو دەستەواژە و قسانەوەی کە هەستەکان دەخرۆشێنن، یان لە هاوڕێ و خێزانەوە. ڕەنگە وتارێك بێت لە گۆڤارێك یاخود لە دەزگایەکی ڕاگەیاندنەوە بلاوبێت، ڕەنگە سەرچاوەی ئەم هاندانەت سەرۆك ئیشەکەت بووبێت، کێشەی ئەم هاندەرە دەرەکیانە ئەوەیە بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام نابێت، پاشی ماوەیەکی کورت هێزی هاندەریت دەپوکێتەوە.

**بۆنمونە:** هەرگیز بووە، جارێك ڕووبکەیتە کۆڕێك لەبارەی هاندانەوە؟ گەر وەلامەکەت بەلێ بێت، ئەوا پرسیاری مەودای کارایی ئەم کۆڕەت لێ دەکەم بۆ هاندانت؟ پاش ماوەیەك کاریگەریەکانی لەسەر تۆ چۆن بووە، پاشی مانگێك، ئەی دوای ساڵێك؟ ئەی ئێستا؟ بێگومان ئاستی هاندانت بەتێپەڕبوونی کات لاواز دەبێت و دەپوکێتەوە. وەرە باپرسیارێکی دیکەت لێ بکەم: گەر سەرۆك ئیشەکەت بە پێکەنینێك پێشوازی لێ کردی، ئەمە چۆن کاردەکاتە سەر ئیشی ئەو ڕۆژەت؟ ئەی ئەگەر پێچەوانە ڕوویدا، ئایا ئەمەش کار لە ڕۆژەکەت دەکات؟ دڵنیام لەوەی کار لە هەستەکانت دەکات، ئەم کارتێکردنەش بۆماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە، بۆ نەگبەتی مرۆڤ هەمیشە پشت بە هاندانی دەرەکی دەبەستێت بۆ هەستکردن بەوەی ئەوان جێگەی ڕێزی سەرۆك یان هاوڕێ یاخود هاوبەشی ژیان یان هەرکەسێکی تری گرنگن.

ولیام جیمس لەم وارەدا ئێژێ: **(( گەر چاوەڕوانی ستایش و پەسندانی ئەوانی تری ئەوا زۆر بەزوویی دەبیتە نێچیرێکی ئاسانی فرت و فێلّ و تەلّەکان)).** لەڕێگەی

لێکۆڵینەوەکانمەوە بۆم دیارکەوت کۆمپانیاکانی دڵنیایی ساڵانە کێبڕکێیەك بۆ کارمەندانیان ڕێك دەخەن، ئەوکارمەندەی باشترین فرۆشی و قازانجی هەبێت ئەوا بەبێ بەرامبەر دەبرێت بۆ گەشتی دوورگەیەکی بچۆلانە و جوان. بێگومان لەکاتی ئەم کێبڕکێیەدا ئەو کارمەندەی هەفتانە فرۆشی دەگاتە ٢٠٠٠ بەرزی دەکاتەوە بۆ ٣٠٠٠ دۆلار . واتە بەڕێژی ٥٠٪ فرۆشی زیاد دەکات، بەلأم پاشی کێبڕکێکە، بڕی فرۆشەکانی کەمدەبێتەوە بۆ ١٥٠٠ دۆلاری هەفتانە، واتە بەڕێژەی ٥٠٪ نزم دەبێتەوە، پاشی ماوەیەکی کورت ژمارەیەکی زۆری کارمەندەکان یان دەست لەکاردەکێشنەوە یاخود دەردەکرێن! سەرباری ئەوەی هەمان کارمەندان لەگەڵ هەمان خەڵکی ناوچە و بۆهەمان کۆمپانیا کاردەکەن کەچی بەهۆی ھاندەرەکەوە گۆڕانی گەورە لەفرۆشیاندا ڕوو دەدات، ئەمەیە کێشەی ھاندانی دەرەکی، کە بە تێپەڕبوونی ماوەیەکی کەم هەڵدەپرۆقێت و نامێنێت.

لێرەدا قسەیەکی کۆنفۆشیۆس ت بیردێنمەوە، کەدەڵێت: **(( ئەوەی مرۆڤی باڵا هەوڵی بۆ دەدات لەهەناویدا دەستەبەرە، بەلأم مرۆڤی لاواز لای ئەوانی تر دەستەبەرە)).**

### ٣-هاندانی ناوخۆیی:

ئەم جۆرەی هاندان کاریگەرترین و بەردەوامترینی سێ جۆرەکەی هاندانە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئەم جۆرەیان" چون لەم کاتەدا تۆ بە هێزی خودی و باڵات هاندراویت بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکانت. بەر لە ٢٠٠٠ ساڵی ڕابردوو سۆکراتی فەیلەسوفی گەورە یەکەم کەس



بوو ئاماژەی بەم جۆرە یاسایە ئاوەزییە هۆکارییە کردووە، لەمرۆشدا لەلایەن زاناکانی

دەرون ناسییەوە ئاماژەی (( هۆكار و ئەنجام))ی بۆ بەكاردەهێنن. **هەموو هۆكارێك ئەنجامێكی هەیە گەر هەمان هۆكار دووبارە بوویەوە هەمان ئەنجام چنگ دەكەوێتەوە،** بە مانایەكی تر گەر بتوانی هەمان هاندەرەكانی ڕابردووت چنگ بخەیتەوە ئەوا بەردەوام هاندراودەبیت .

لە وەرنامەی زمانەوانیانەی دەماریدا گریمانەیەك هەیە ئاماژەدەكات بەوەی كە:

**(( لە مێژووی هەر مرۆڤێكدا هەموو ئەو سامانانە هەن كە دەتوانێت لە سایەیاندا هەموو گۆڕانێكی ئەرێی ئەنجام بدات)).**

بۆیە ڕەگەڵ مندا هەوڵی ئەنجامدانی ئەم ئەزمونكراوە زانستیە بدە:

چاوانت دابخە، بە قوڵی لە لوتەوە هەناسە بدە، بیر لە كاتێك بكەرەوە كە لە لوتكەی هاندانڎا بویتە.

بیر لە ئەزمونێكی دیاریكراوت بكەرەوە كە بتەوێت دووبارە تێیدا بژیتەوە" لە كەتواری ئێستادا. بەهەمان شێوازی پێشوو هەناسەبدە، دانیشە یان بەهەمان شێوە هەستە، هەوڵبدە هەست بە هەمان چەشنە هەستی ئەزمونی ڕابردووت بكەیتەوە، گەر بتوانی ئەم مەشقە بە جوانی ئەنجام بدەی ئەوا هەمان چەشنە هاندانت بۆ دەستەبەر دەبێت.

هاندانی هەناویت وەكو كاری هەناوی وەهایە، ئێمە پێویستمان بەوەیە هانی خۆمان بدەین بۆ ئەوەی هاندانمان لە قوڵایی خودمانەوە بێت، پێویستمان بە هیچ كارتێكارێكی دەرەكی نابێت، مارك تۆین ئاماژەدەكات و دەڵێت: **(( گەر نەتوانی ستایش چنگ بخەیت، ئەوا خۆت بەهەر شێوەیەك بێت پەسنی خۆت بدە.. گەر ئەوانی تر بەشان و باڵتدا هەڵیان نەدا، ئەوا خۆت بە خۆتدا هەڵبدە)).**

هەوڵبدە لە قوڵایی هەناوتەوە مەلەبكەی، ئەزمونەكانی ڕابردوت بگێڕەوە، هەستی پێبكە، چێژی لێ وەربگرە، هەوڵبدە بەپێی توانا تێیدا بژیت. ئەلێكسەندەر گراهام بێل دەڵێت:

**(( من ناتوانم بڵێم ئەم هێزە بەچی دەبێ، بەڵام دەزانم هەیە، ئەم هێزە تەنها لەکاتێکدا بەردەست دەبێت کە مرۆڤ لە دۆخێکی هزری وەهادابێت کە لە ڕێگەیەوە بزانێت بە تەواوەتی چی دەوێت؟ سووردەبێت لەسەر ئەوەی نەوەستێت تاوەکو بەوەدەگات کە دەیەوێت)) .**

لەبیرت بێت کە هێزێکی خودی بێ شومار لەهەناوتدایە بۆ هاندانت، ئەوەی لەسەر تۆیە ئەوەیە کاتێك بدۆزیتەوە کە تۆ تێیدا هاندراوبیت، هەوڵی دیسانەوە ژیانەوە لەم ئەزمونە بدە" بەهەموو سۆز و هەستەکانتەوە.

## ١٢- دە خێراترین ڕێگە بۆ داڕووخانی کارمەندان :

**(( لەکاتێکدا من لەکارمدا بۆ پێشێ هەنگاو دەنێم گرنگی بەوە نادەم خەڵکی چیم لەبارەوە دەڵێن،بەڵام گرنگی بەوە دەدەم کە ئەنجامی دەدەن))**

**ئەندرۆکارنگی**



بەداخەوە تاوەکو ئێستا زۆرێك لە بەڕێوەبەران ترس بەهۆکاری پارمەتی دەری هاندان دادەنێن، بە پارمەتی دەری دەزانن بۆ ئەنجامدانی کاری گرنگ بەشێوەیەکی خێرا لەگەڵ بەدیهاتنی ئەنجامی باشترین، لەکاتێکدا پێچەوانە ڕاستە. خۆ ڕاستە بەکارهێنانی دەستەلآت و سزا دەبێتە هۆی بەدیهاتنی ئەنجامی خێرا، لە ڕاستیدا تاکە ئەنجام لەم کاتەدا شلەژان ، دڵەڕاوکێ و داڕووخان لە بەدیهاتنی ئامانجە خوازراوەکان دەبێت.

دە ڕێگەت بۆ پێش دەست دەخەم کە هۆکاری پشت داڕووخانی کارمەندانن:

( دەتوانی تۆ لای خۆتەوە کەڵکی لێ ببینی).

**١. ناجێگیری :**

ڕەنگە کۆمپانیاکەت توشی ناجێگیری بێت" گەر شێوازی پەیڕەو لێکراوی کارگێری بەخێرایی بگۆڕیت، یاخود جاربە دووی جار کێشە بەسەر کۆمپانیاکەتدا دێت، یاخود بەهۆی دووچاربوون بە ئاریشەوە نەخشە ڕێگای پەیڕەو کراوی دەگۆڕێت. ئەم چەشنە هەستکردنانە دەبنە هۆی ناجێگیری، ئەمەش لای خۆیەوە دەبێتەهۆی ناهاندانی کارمەندان.

### ٢. موچەی نەگونجاو:

ئەو موچەیەی بۆ کارمەندانت دەیبڕیتەوە بەقەت بەهایانە ؟ کەی بووە دوایین جار کرێکانیانت بەرز کردۆتەوە؟ تێبینی بکە و بزانە کە موچەی نەگونجاو دەبێتە هۆی کوشتنی هاندەرەکان، بۆیە بە دەستکەوتنی یەکەمین هەل ئەم کاریان جێدەهێڵن.

•

### ٣. سەرزەنەشت و خراپ مامەڵە:

ئایا تۆ ڕاهاتووی لەسەر ئەوەی لەپێش چاوی ئەوانی تر ڕەخنەی کارمەندانت بکەیت؟ لەبەردەم ئەوانی دیکە بەسەریاندا دادەبارێیت؟

لەبیرت بێت خراپ مامەڵە کردنت ڕەگەڵ کارمەندانتدا دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی هاندانیان بۆ باش کارکردن.

### ٤. ئومێدی درۆ:

ئایا ڕوویداوە بەڵێنی پلە بەرزکردنەوەت بە کارمەندێکت دابێ و بەڵێنیەکەت نەبردبێتەسەر؟ یاخود بەڵێنی ئەوەت پێ دابێت کە پاداشی بکەیت و نەت کردبێت؟

بەجوانی بیربکەرەوە، دەبینی ئەمە بۆخۆی دەبێتە هۆی لەدەستدانی متمانەی نێوان خۆت و کارمەندەکانت، هاندانەکانیان تیادەچن و دەپوکێنەوە.

### ٥. ڕۆتینانەت(ناپێویست و بێزارکار):

ئایا هەمیشە هەمان کار بەسەر کارمەندەکانتدا دەدەیت؟ ئایا کارمەندەکانت ڕاهاتوون لەسەر ئەنجامدانەوەی هەمان کارەکان؟

دەبێت تێبینی ئەوە بکەیت کە مرۆڤ هەمیشە پێتقی بە نوێبونەوە و فێربوونی بەهرەی نوێیە. ڕۆتینیش یەکێکە لەو هۆکارانەی مرۆڤ دەگەیەنێتە دۆخی پوکانەوە و هۆکاری پشت نزمکردنەوەی ئاستی هاندانیان دەبێت.

### ٦. خراپی بەرهەمی پێشکەش کراوت:

بەرهەمە پێشکەش کراوەکانت خراپییەکیان تێدایە؟ کارمەندەکانت توشی ڕەخنە دەبنەوە لەکاتی پێشکەش کردنی بەرهەمەکانت بەوانی تر؟

هەوڵی بەرزکردنەوەی ئاستی باشی بەرهەمەکانت بدە" چون پێویستە مرۆڤ هەست بە شانازی بکات لەوەی دەیفرۆشێت، شانازی بکات بەوەی ئەنجامی دەدات.

هەربۆیە بەرهەمی خراپ هۆکاری پشت شەرمەزاربوون و بێزاربوونی کارمەندانە، ئەمەش دواتر هۆکاری پشت کەمبونەوەی هاندانیانە.

### ٧. ئامانجی دژ بەیەك :

ئایا ڕوویداوە شتێك بڵێی، دواتر لێی پەشیمان بووبیتەوە؟

دەزانم کە دژبەیەکی ئامانجەکان دەبنەهۆی دڵەڕاوکێ و ئاژاوە، هەروەها جۆرێك لە لەدەستدانی متمانەش دەئافرێنێت و لە تواناییەکانت وەکو بەڕێوەبەر کەمدەکاتەوە، ئەمەش بێگومان کار لە کارمەندانت دەکات.

### ٨. ئاراستەکردنی لۆمە و سەرزەنشت:

کاتێك توشی هەر شکستێك دەبیت لۆمەی کارمەندانت دەکەیت؟ خووگرتن بە سەرزەنشتن کردنی ئەوانی تر کارێکی ئاسانە و دەبێتە هۆی ئەوەی پەیرەوی ڕێگەیەکی لاواز بکەیت بۆ کارگێڕی و بەڕێوەبردن، ئەمەش دەبێتەهۆی هان نەدانی کارمەندان بۆ باشتر کارکردن.

### ٩. لایەنگرتن:

بێ جیاوازی لەگەڵ هەموو کارمەندەکانتدا کاردەکەیت یاخود هەندێکیان بەسەر ئەوانی تردا باشتر دەسەپێنی؟

خاترگرتن و لایەنگرتن دەرکی وتی وتـی دەکاتـەوە و واتـە وات لـەنێو کارمەندەکانتـدا دروست و بڵاودەکات، ئەمەش بێگومان دەبێتەهۆی لاوازکردنی هاندانیان.

### ١٠. ڕەفتاری تایبەتیت:

ئایا تـۆ لـەو کەسـانەی کـەمترین پێکـەنین لەسـەر ڕووخسـارت دیاردەکـەوێت؟ کاتێـك بـەوانی تـر دەگـەیت سـڵاویان دەکـەیت؟ تێبینـی بکـە و بزانـە کـە ڕەفتـاری تایبـەتیت هۆکارێکی گرنگە بۆ لاوازکردنـی ئاسـتی هانـدانی کارمەنـدانت، ئـەو ڕێگەیـەی ڕەفتاریـان ڕەگـەڵ دەکـەیت و بەهۆیـەوە لێیـان نێزیـك دەکـەویت، هـەموو ئەمانـە ڕەنگـە ببنـەهۆی لاوازبوونی هاندانی کارمەندانت. بێگومان ئەم لیستە دەشێت درێـژتربێت، بـەلاّم مـن ئـەم دە هۆکارەکەم بە کاریگەرترین و بـاوترین زیـان گەیەنـەرەکان بـە دامـەزروەکان زانیـوە، بۆیە ئاماژەم پێ داون. خۆت لەنێو بەندێك یاخود زێدەتریش لـەو لیسـتەدا دەبینیتـەوە؟ گەر وەها نەبوو ئەوا پیرۆزباییـت لـێ دەکـەم بـۆ گەیشـتن بـە لوتکـە.. بـەلاّم گـەر لـەنێو لیستەکەیت ئەوا هەرئێستا هەندێك گۆڕانکاری ئەنجام بدە.. بەڵێ، هەرئێستا، تاوەکو پتر خێراتربیت ئەوەندە باشتر دەبیت.

## ١٣-پێنج ڕێگەی بەسود بۆ هاندانی کارمەندان:

(( بەهێزترین شت لەم جهانەدا، ئەوەیە بیرۆکەیەك لەکاتی خۆیدابێت))

**ڤیکتۆر هۆگۆ**



لەکاتی بونم بە میوانی بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی چنی، لێم پرسی: بەچی ڕێگەیەك هانی کارمەندەکانت دەدەیت؟ گوتی: بە پارە هانیان دەدەم.

بەپێکەنینەوە لێم پرسییەوە: لەپاڵ ئەمە چی تر ئەنجام دەدەیت؟ گوتی: بۆچی دەبێت هانیان بدەم؟ نازانیت چەندە بێ کار هەن و بەدووی کاردا دەگەڕێن؟ ئەوەتا منیش کارم بۆ هەندێك لەمانە ڕەخساندووە. تاوەکو باشتر کاربکەن منیش بەخشندەتر دەبم لەگەڵیاندا، گەر وەها ئەنجام نەدەن ئەوا منیش بێ سێودوو دەریان دەکەم و کارکەری دیکە دەهێنم.

لەم کاتەدا پرسیاری ڕێژەی گۆڕینی کارمەندی کۆمپانیاکەیم کرد، لەوەلامدا گوتی: ٦٣٪، بەڕاستی زۆرم سەیر لێهات !

لەم کاتەدا پێنج ڕێگەی بەکەڵکم خستە پێش دەستی بۆئەوەی بتوانێت هانی کارمەندەکانی بدات:

**(١) کەمکردنەوەی تێکڕای خولانەوەی کارمەندان:**

کاتێك کارمەندان ڕێز و هاندان دەبینن بەبێ زیادکردنی پارەش حەزی بەردەوامبونیان بۆ دەستەبەر دەبێت و تەنانەت گەر لەجێگەی تریش موچەی زیادتریشیان بدەنێ ڕەنگە نەڕۆن. کەسێك دەناسی ڕەتی پێشنیاری کۆمپانیەکی موچە زیادتری کردبێت بەهۆی پەیوەستی بەم کارەی ئێستاوەی؟ چونکە بەختەوەرە و خەمی نییە. پارە هۆکارێکی هاندەرە، بەڵام هەمووشتێك نییە، چونکە هەموو کارمەندەکان تەنها پێویستیان

بەپارەنییە بۆ کارکردن، بەڵکو پتر پێویستیان بە ڕێز و خۆشەویستی بۆدەربڕینی هاوسەنگ و جیاوازی نەکردنە لەنێوانیاندا.

### (٢) کەمکردنەوەی ڕێژەی ئامادە نەبوون:

کاتێك کارمەندان ئیشەکانیان بەدڵ دەبێت کەمترین جار ئامادەنابن، تەنانەت لەدۆخی نەخۆشیشدا. بۆخۆم بەڕێوەبەرێك دەناسم کە نەشتەرگەری پێی ئەنجامدابوو، بەڵام پاشی نەشتەرگەریەکەی ڕاستەوخۆ بۆسەر ئیشەکەی ڕۆیشتەوە! ڕەنگە ئەمە بەزێدەڕۆیی بزانی، ڕەنگە تۆ لەمەدا ڕاست بیت، بەڵام مەبەستم ئەوەیە کاتێك کارمەندێك وەها هەست دەکات بۆخۆی کاردەکات، ئەوا هاندراودەبێت، حەزی بۆ ئیشکردن دەجوڵێت، خۆی لە ئامادەنەبوون بەدوور دەگرێت، مەگەر دۆخەکەی زۆر ناچاری بێت ئەگینا بۆ سەر کارەکەی دێت.

### (٣) ڕەفتاری باش بۆ کارمەندان:

کاتێك کارمەندان هاندراو دەبن، ئەوا حەزیان بە ژینگەی کارکردنیان دەبێت، پتر پێ دەکەنن و یەکتریان خۆش دەوێت، ئەمەش بێگومان کار لە شێوازی ڕەفتارکردن لەگەڵ کڕیار و سەردانکاراندا دەکات.

### (٤) بەدیهێنانی ئامانجەکان:

هاندان هێزێکی پاڵنەرە بۆ ئەنجامدان، بەجۆرێك وەها لە کارمەندان دەکات بە خرۆشەوە کاربکەن بۆ بەدیهاتنی ئەو ئامانجانەی وەکو ئامانجی خۆیان هەستی پێ دەکەن، لێرەوە هاندان دەبێتە گرنگترین هۆکاری پشت بەدیهاتنی ئامانجەکان.

### (٥) وزە:

هاندان دیسانەوە بەرهەم هێنەرێکی سەرەکی وزەشە، کاتێك مرۆڤ هاندراو دەبێت، ئەوا( لەشی بەجیاوازتر دەجوڵێنێت) بەشێوازی باشتر هەناسە دەدات، دەبێتە خاوەنی

چالاكی و زيندەيی و بەشێوەيەكی گشتی باری جەستەيی خاستر دەبێت لەكەسێك هاندانی نييە. ئەوكاتەی كارمەندانت ئەم وزەيەيان لا دەستەبەرە، بێگومان باشترە بۆ پتركردنی بڕی بەرهەم و يارمەتی دەريشە بۆ بەديهاتنی ئامانجە بەپێزەكان.

بێگومان هەر هەوڵێك بۆ هاندانی كارمەندانت بدەی، سود و كەڵكی باشی بۆت دەبێت و ئەنجام و بەرهەمەكانت باشتر دەبێت لەوەی پێشبينيت كردووە.

## ١٤-بیست ڕێگەی کارا بۆ هاندانی کارمەندان :

**(( باشترین ڕێگە بۆ دیاریکردنی ئەوەی چی خەڵکی هاندەدات ئەوەیە لێیان بپرسیت))**

**هارۆڵد. ماك ئەلیندۆن**



**ئێستایش باوەکو ٢٠ ڕێگەت پێشکەش بکەم که گرنگن بۆ هاندانی کارمەندانت:**

### ١) ستایش و ڕێزگرتن:

هەرگیز ڕوویداوە سوپاسی کارمەندێکت بکەیت؟ ولیام جیمس دەڵێت: **(( قووڵترین بنەمای سروشتی مرۆڤ حەز و ئارەزووە بۆ هەستکردن بە ڕێز))**. ڕێزگرتن لە کارمەندانت بەهێزترین ئامرازە بتوانی بەکاری بهێنیت بۆ هاندانیان" چونکە هەستکردن بە گرنگی و بەهاداری دەروون و ڕێزگرتنی خوود و هەستکردن بە متمانەیان لەلا دەئافرێنێت، بۆ چارە ڕەشی بەڕێوەبەرگەلێکی زۆر لەم ڕاستییە بێ ئاگان، یاخود ڕەنگە مەودای گرنگی و کارایی هاندان لەڕێی ڕێزگرتنەوە نەزانن.

توێژینەوەیەك لەلایەن کۆمپانیای پێشخستنی کارگێڕییەوە ئەنجامدراوە ئەوەی دیارخستووە کە ١١٪ی بەڕێوەبەرەکان بە تەنها پەسنی کارمەندانیان دەکەن و ڕێزیان دەگرن، هەروەها توێژینەوەکە دیاریخستووە کە ٢٧٪ی کارمەندانی بەڕێوەبەران حەزی گواستنەوەی کارەکەیان بۆ کۆمپانیایەکی تر هەبووە، بەهۆی بوونی هاندەر و ڕێزگرتن لە کارمەندان لەو کۆمپانیانەی دیکە. ئەو ڕێزەی مەبەستمانە تەنها بانگێشت کردنی کارمەندەکەت نییە بۆ نوسینگەکەت و تەوقەی لەگەڵ بکەیت و سوپاسی بکەیت،

ڕێزگرتن دەبێت لەسەر بنەماگەلی دیاریکراوبێت، بۆئەوەی ڕێزگرتنەکەت کارابێت پێویستە ڕەچاوی ئەم ڕێسایانە بکەیت:

١- دەبێت ڕێزگرتنەکە لەپێش چاوی هەموو کارمەندان بێت.

٢- پاش ئەنجامدانی کارێك شیاوی ڕێزگرتن بێت ڕێز لەکارمەندەکەت بگرە.

٣- هەولبدە ڕاستگۆ و دیاریکراوبیت، بۆنمونە مەڵێ: سوپاست دەکەم بۆ یارمەتیەکەت، باشتر وەهایە بڵێی: من دەزانم تۆ زۆر خۆت ماندوو دەکەیت و دوێنێش بۆ تەواوکردنی ڕاپۆرتەکە لەکاتی خۆیدا کاتێکی زۆر سەرقاڵ بوویت، من ڕێزی ئەم کارەت دەگرم.

٤- زیادە ڕۆیی مەکە.

٥- لەوەش گرنگتر، لەبیرت بێت کەنابێت ئەمە لەبیربکەی، واتە: ڕێزگرتنی کارمەندانت لەیاد مەکە.

کاتێك ڕێز لە هەوڵی کارمەندانت دەگریت، ئەوان باشتر کاردەکەن، نەوەك ئەمە بە تەنها، بەڵکو شێوازی هەستکردنیان بەرامبەر خۆیشیان و تۆیش باشتردەبێت، ئەمەش وەهات لێ دەکات هەست بەوەبکەیت تۆیش مەزن و خۆشەویستی، بۆیە لەمڕۆوە دەست پێبکە، پەسندانی کارمەندان بکەرە خووت، دەبینی پاداشەکانت مەزن دەبن، سۆکرات ئێژێ: (( **ئەوەی بەباشی لەگەڵ خەڵکدا ڕەوتاریکات بۆپێشەوە دەڕوات**))، لەبیرت بێت دەتوانی هەرکارێك لەبیربکەی تەنها سوپاسکردنی کارمەندانت نەبێت، هەوڵبدە بەبەردەوامی خۆت ئەم کارە ئەنجام بدەیت.

## ٢) خەڵات/پاداشت:



خەڵات بە ئامرازێکی گرنگی هاندان دادەنرێت، بۆ ماوەیەکی زۆریش ئەم هاندانە بەکارایی دەمێنێتەوە. دیارییەکە باشتروەهایە مەدالیای لێهاتوویی یاخود

تابلۆیەك بێت کە ناوی کارمەندە خەڵات کراوەکەی لەسەر هەڵکۆڵدرابێت لەگەڵ هۆکاری خەڵاتکردنەکەی، یاخود هەر جۆرە خەڵاتێکی تری باشتریش. باشتر وەهایە لە ئاهەنگێکدا بە کارمەندەکە بدرێت، هەروەها کاریگەریەکەی باشتردەبێت گەر تاکەکانی خێزانەکەی بەنهێنی بانگێشت بکەی و وەکو دۆخێکی چاوەڕوان نەکراو بە کارمەندەکەی ببەخشیت و ئەوانیش لە بینینی ئەم دیمەنە گرنگە بێبەش نەبن. دەتوانی پێشبینی کاریگەری ئەم خەڵاتە لەسەر کارمەندانت بکەیت؟ ئەتوانی بزانی چەندە هاندەر و پاڵنەریشە بۆئەوەی بە باشتر کاربکەن.

کاتێك کارمەندانت خەڵات دەکەیت وەهای لێ دەکەی باشتر لە بەرامبەر خۆی و خۆت و ئەوانی تریشدا بیربکاتەوە بڕوانێت، بۆیە شێوازی خەڵاتکردن بقۆزەوە بۆ بەرزکردنەوەی ورەی ئەوانی تر بۆئەوەی ورە و قازانجی تۆیش پتر بەرز بکەنەوە. وەك جۆن ئەندرۆ هۆڵمز دەڵێت: (( هیچ ئەزمونێك بۆ دڵ باشتر نییە لەگەیشتن بە بنك و بەرزکردنەوەی ئەوانی تر)) .

### ٣) کێبڕکێ:



لەکاتی ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەکەمدا بەڕێوەبەر گەلێ زۆر قسەیان ڕەگەڵ کردم، CEOs،VPs، هەروەها خاوەنی کۆمپانیاکانیش، بۆم دیارکەوت کە زۆر دامەزراوە و کۆمپانیا شێوازی کێبڕکێ وەکو ئامرازێك بۆ هاندان بەکاردەهێنێت، خەڵاتەکەش نان خواردنێك دەبێت لەگەڵ بەڕێوەبەری گشتی یاخود دانیشتن و قسەکردن و کات بەسەربردن ڕەگەڵ گرنگترین کەسی کۆمپانیاکە، ئێستاش دەمەوێت لەتۆ بپرسم: ئایا تۆ ئامادەی بۆ ئەوەی بەڕاستی کاربکەیت بۆئەوەی بگەیت بەوەی لەگەڵ سەرۆکدا نان بخۆی؟ ڕەنگە هەندێك بڵێن بەڵێ. بەڵام ئەو کارمەندانەی ئەم خەڵاتە دەبەنەوە توشی دڵەڕاوکێ دەبن، بیر لەپۆشینی ئەو جلەدەکەنەوە کە دەیپۆشن، شێوازی قسەلەگەڵ

كردن و چەشنی خۆراك خواردن، ئەمانە دەترسێن ڕەفتارێكی گەمژانە ئەنجام بدەن، بۆیە گەر دەتەوێت كێبڕكێ ببێتە هۆكارێك بۆ هاندانی كارمەندانت ئەم شتانەت لەبیربێت:

١- لەبارەی جۆری دیارییەكەوە لە كارمەندانت بپرسە، با خۆیان جۆرەكەی دیارییكەن" چون ئەمە دەبێتە هاندەری ڕاستەقینەیان.

٢- خەڵاتەكە باوەكو بۆ دوو كەس بێت، گەر خەڵاتەكە گەشتێكە بۆ دوورگەیەك ئەوا باوەكو گەشتەكە بۆ دووكەس بێت" چون ئەمە هەلێك بۆ كارمەندانت دەڕەخسێنێت بۆئەوەی ژنەكەی یاخود هەر كەسێكی تری گرنگ لەم گەشتەدا ڕەگەڵ خۆی بەرێت.

### ٤) پلەبەرزكردنەوە:



بە ڕەخساندنی هەلی پلە بەرزكردنەوە هەستی كارمەندانیش باشتر هاندراو دەبێت و دواتریش داهاتوویەكی گەش بۆ كۆمپانیاكە دابین دەبێت، بەداخیشەوە زۆرێك لە بەڕێوەبەران بۆ پڕكردنەوەی پۆستە ڤالاكان كارمەندی نوێ دادەمەزرێنن، من ناڵێم ئەمە تەواو هەڵەیە، بەڵام لەسەرەتادا كارمەندانی كۆمپانیاكەی خۆت هەن و دەبێت پلەیان بەرزتربكەیتەوە. هەلی پلە بەرزبوونەوە بۆ دەستەی كاركەرانت برەخسێنە" بۆئەوەی بەرەو پێشەوە هەنگاوبنێن، كاتێك پلەبەرزكردنەوەی دەبێتە پلەكانی قاڵدرمەی كۆمپانیاكەت ئەوا بەمە هاندراو دەبن و ئەوپەڕی توانایان دەخەنەگەڕ بۆ بەدیهاتنی ئەنجامێكی نایاب.

گەر ئەم هەلەت بۆ كارمەندانت ڕەخساند ئەوانیش ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان دەدەن بۆ پارەتی دانی تۆ و دابینكردنی داهاتوویەكی گەشیش بۆخۆیان. هنری دایڤد سۆرێۆ دەڵێت: (( **گەر مرۆڤ بەو لایەدا پێشكەوت كە خەونیەتی و ڕەهای دەپەوانی لەو ژیانەدا دەژێت خەونی پێوە بینیوە، ئەوا سەركەوتنێكی ناچاوەڕوان كراو لەكاتێكی كەمدا**

بەدەست دەهێنێت)) ، یارمەتی دەستەی کارکارانت بکە بۆئەوەی پێشبکەون و خەونەکانیان بەدیبێنن، بێگومانبە لەوەی ئەمە دەبێتەهۆی سەرکەوتنی دڵنیایی تۆ.

## ٥) مەشق:

دەتوانی مەشق وەکو ئامرازێکی گرنگ بۆ هاندانی کارمەندانت بەکاربێنی، ڕێکخراو و دامەزراوەکان لەمرۆدا پتر لەهەر کاتێکی ڕابردوو بڕوایان بەکاریگەری مەشق و ڕاهێنان هەیە وەکو هاندەرێك بۆ کارمەندانی. بێگومان سەرکەوتنی کۆمپانیاکەت لە داهاتوودا بەشێوەیەکی گەورە پشت بەستووە بە چۆنێتی ڕەفتارکردنت لەگەڵ کارمەندانت و شێوازی لەئەستۆدانی بەرپرسیارێتیەکانیشیان. تاوەکو بەباشتر مەشقیان پێبکەی، ئەوەندەش نواند و تواناییان پتر باڵاتر دەبێت، متمانە پێکراوتر دەبن لە ڕووبەڕوو بوونەوەی هەر دۆخێك، ئەمەش پتر هاندەریان دەبێت بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان. ڕێژەی قازانجی گەڕاوە بۆ خۆت و کۆمپانیاکەت پاش مەشق پێکردنی کارمەندانت بناڵا دەبێت، هانی کارمەندانت بدە بۆ گوێگرتن و سەیرکردنی کاسێتی گەشەپێدانی خوددی و پەنا بە مەشقەوانێکی کارا بگرە بۆ ڕاهێنان کردن بە کارمەندانت، ئەمەش ئەنجامێکی زۆرباشی بۆت دەبێت.

## ٦) متمانە:



لۆتسۆ دەڵێت: **"ئەوەی متمانە بەوانی تر نەکات هەرگیز بە متمانەپێکراوییان نابینێت".**

بۆیە، ئەو بەڕێوەبەرەی متمانە بە کارمەندانی ناکات، پێداگیری لەسەرئەوەش دەکات خۆی کارەکانی ئەنجامبدات، بەردەوام دەبێت لە پێداچونەوە بەکارەکانیان، ڕەخنەیان ئاراستەدەکات،

خۆی بە بار قورس دەزانێت، ئەوجا دەبێتە خاوەنی دەستەیەکی کاری ناکارا و بێ خرۆش بۆ کارکردن.

بەڵام کاتێك متمانە بەکارمەندانی دەکات، وەهایان لێدەکات هەست بە ئازادی بکەن، ئەنجامێکی زۆر خوازراوی دەبێت. جۆرجس.باتۆن دەڵێت:" **هەرگیز بە کەس مەڵێ چۆن ئەوکارەت ئەنجامدا. ئەوەی گرنگە پێی بڵێی کەچی دەکات، دەبینی بە هێزە داهێنانیەکانی تێرادەمێنێت**".

## ٧) دیاریکردنی ئامانجەکان:



دیون بیات دەڵێت:" **کەسی مەزن ئەوەیە بەیارمەتی ئاوەزی ئەوانی تر دەتوانێت کارەکەی ئەنجامبدات**" ، دیاریکردنی ئامانجی دامەزراوەکەت ڕەگەڵ کارمەندانتدا سودێکی زۆری هەیە، تۆ بەم کارەت تەنها هاندانیان لەلادا دروست ناکەیت، بەڵکو کۆمەکیان دەکەیت بۆئەوەی وابینینێکیان هەبێت لەبارەی سروشت و چۆنێتی بەشداریکردنیان لە بەدیهاتنی ئامانجەکانی کۆمپانیاکەت. توێژینەوەکان سەلماندویانە ئەو کارمەندانەی لەسایەی ئامانجێکی دیاریکراوەوە کاردەکەن پتر هاندراو و کارا دەبن وەك لەوانی تر. بۆیە گەر دەتەوێت بەڕێوەبەرێکی کارابیت، هانی کارمەندانت بدەی بۆ بەدهاتنی ئامانجی باڵا و مەبەست، پێویستە ڕێگە بەکارمەندانت بدەی ڕەگەڵتدا هاوکاربن بۆ دارشتنەوەی ئامانجەکانی کۆمپانیاکە و دانانی نەخشە ڕێگەی بەدیهاتنی.

**بۆنمونە:** خولێکی دیاریکردنی ئامانج بۆ کارمەندانت بکەرەوە، داوایان لێبکە ئامانج و پێشبینیەکانیان بنوسنەوە، لەگەڵ کاتی بەدیهاتنی. دڵنیابە لە تێگەیشتنیان لەم مەشقە، ئەوجا ڕەگەڵیان کۆببەرەوە و سود لە بیرۆکەکانیان وەربگرە بۆ دیاریکردنی

ئامانجە گونجاوەکانی خۆت لەگەڵ چۆنێتی جێبەجێ کردنیدا، ئالبێرت هابند دەڵێت: "**پێشکەوتن بەدی نایەت، تەنها لەڕێگەی قۆستنەوەی شارەزاییەکانەوە نەبێت**" ، بۆیە کاتێك ڕەگەڵ کارمەندانی کۆمپانیاکەتدا –کە خاوەنی بۆچوون و بیرۆکەی لێك جودان– ڕێنامە و ئامانجی کۆمپانیاکەت دادەڕێژیتەوە بەرەو بەیهاتنی سەرکەوتنت هەنگاو دەنێی، د.ڕۆبێرت شۆلر دەڵێت:" **ئامانجەکان تەنها پێویست نین بۆ ئافراندنی ھاندەرمان، بەڵکو بنچینەشن بۆ مانەوەمان لە ژیاندا**" .

## ٨) ئەنجام و دەستکەوت:

**(( بەرهەمی ئەمڕۆت ئاماژەیە بۆ هەوڵەکانی دوێنێت))**. دەستکەوت بەختەوەری بۆ ژیانی خۆت و کارمەندانت چێ دەکات، ئاماژە و ڕوونکاری ئەوەس کە: تۆ و کارمەندانت بەو پەڕی تواناتانەوە هەوڵتانداوە بۆ بەدیهاتنی ئامانجە دیارەکانی کۆمپانیەکە. دەستکەوت گرنگترین هۆکارە بۆ هاندانی هەموان و بەرزکردنەوەی ڕادەی ڕێزگرتن لە خود و هەستکردن بە بەهای دەروون. دەستکەوت بۆ هەموو جهان و دەورووبەری دەسەلمێنێت کەتۆ بەوپەڕی تواناوە هەوڵتداوە و کەڵکت لە ژیرێتیت وەرگرتووە. دەستکەوت وەها لە کارمەندانت دەکات باشتر لە خۆیان بڕوانن، لەکارەکانیشیان، یارمەتیشیان دەدات بۆئەوەی گەشەبکەن و هەوڵی بەدەست هێنانی شتە ئەستەمەکانیش بدەن. کاتێك ئامانج بۆ کارمەندانت دادەڕێژیت هەوڵی بەدشداربێکردنی کارمەندانت بدە و باوەکو ئامانجەکانت کەتواریانە بن و هانیان بدە و یارمەتیشیان بدە بۆ بەدیهاتنی ئەم ئامانجانە، دەبینی ئەنجامەکە باش و گونجاودەبێت، فرانکلین ڕۆزفلت دەڵێت:" **بەختەوەری لە چێژی دەستکەوتنەوە سەرچاوە دەگرێت، مەستی تێکۆشانی داهێنەرانەشە**" .

### ٩) بڕواپاستی(مسداقیەت)



لە لێكۆڵینەوەیەكدا كەلەسەر پێنج گەورەترین ئوتێلی مۆنتریال ئەنجام درابوو، پرسیاری ئەوە لە كارمەندان كرابووكە: ئایا بەویەڕی تواناتانەوە كاردەكەن؟ ٧٢٪ یان بە نەخێر وەڵامیان دابوویەوە، كاتێك هۆكارەكەیان لێ پرسی بوون، لەوەڵامدا گتبویان: پاداشی كارەكانیان بۆ بەڕێوەبەرەكانمان دەبێت نەوەك خۆمان، ئیتر بۆچی زۆر خۆمان ماندوو بكەیت!! بۆیە پێویستە هەركەسە و بەپێی كاری خۆی پاداش بكرێت و نابێت كەس لەبری كەس پاداش وەربگرێت، بەم كارەش متمانەی كارمەندانت بۆخۆت و كۆمپانیاكەت بەدەست دەهێنیت و هەمیشە هاندراو دەبن بۆ ئیشكردنی باشتر، بۆیە هەركارە و پاداشێك بۆ خاوەنەكەی دانێ و بە دادگەرییەوە بۆ سەركەوتن هەنگاو بنێ و لایەنگیرمەبە.

### ١٠) بڕیاردروستكردن:

بەشدارپێكردنی كارمەندانت لە كردارەی بڕیاردروستكردن بە گرنگترین هۆكارەكانی پشت هاندان دادەنرێت، مەبەستم ئەوەنییە لە هەموو بڕیارێكدا بەشداریان پێبكەی، نەخێر" چونكە تۆیش وەكو هەر بەڕێوەبەرێكی دیكە پێویستت بەوەیە زۆرجار خۆت خاوەنی بڕیاری خۆت بیت، بەڵام لە بڕیاردان لەبارەی مەشق پێكردن و دامەزراندنی كارمەندی نوێ و خزمەتكردنی كڕیاران و شتی لەم جۆرەدا دەتوانی راوێژی كارمەندانت بكەیت. دەبێت رێگەشیان پێبدەیت بۆئەوەی خۆیان ببنە بڕیاردەری خۆیان، كێشەكانیان خۆیان چارەسەری بكەن بەبێ ئەوەی بەناچاری بۆتۆ بگەڕێنەوە، رێگەیان پێبدە بۆئەوەی فێربن و بزانن كەچۆن رۆڵ و نواندنیان باشتردەكەن و شێوازی پەیوەندی دابەستن و رەفتاریان خاستردەكەن و خشتەی كارەكانیان بەجوانی بەرەو پێشەوەدەبەن و جێبەجێ دەكەن...هتد. بەمەش متمانەی كارمەندانت بەخۆیان باشتردەكەیت و

هەستکردنیان بە ئەمەککگیری(ئینتیما)یش باڵاتر دەکات، هەروەها بۆ پێشەوەیان دەبات، لەگەڵ بەشدار بونیشیان لە کەموکورپیەکان و بەرپرسیاریەتیەکانیش لە ئەستۆ دەگرن و هەوڵ بۆ بەدیهاتنی ئامانجی خوازراو دەدەن.

## ١١) ڕاسپاردن:



لە پەڕتووکی: (( ئەو حەوت خووەی زۆرینەی خەڵك شوێنی دەکەون)) ی نوسەری بەناوبانگ و پڕفرۆشی کتێبەکان لەجهاندا ستیفند.کۆڤای دا هاتووە:" ڕاسپاردنی ئەوانی تر بۆ ئەنجامدانی کارەکان بە کارایی باشترین کاری هێزبەخش و کاریگەرە" . ڕاسپاردن سودی زۆرە، کاتی تەواوت پێ دەدات بۆ چڕبیرکردنەوە(تەرکیزکردن)لە دۆخ و کارە گرنگەکان. هەروەها هانی کارمەندانت دەدات بۆ باشتر ئەنجامدانی کارەکان بە ئومێدی پلەبەرزبوونەوە" لە داهاتوودا، هەروەها ڕێزلە خۆگرتن و متمانە بەخۆکردن لەلایەن کارمەندەکانەوە باڵاتر دەکات، بۆیە ڕاسپاردن و بەبریکارکردن بخەرە ڕیزی یەکەمی بەرنامەکانتەوە. لیستی ئەو کارانە دیاریبکە کەبە کارمەندانتی دەسپێری و دواتریش لیستی کارمەندانی بڕواپێکراوت بنوسەرەوە، دواتر بەپێی هەردوو لیستەکە کاری گونجاو بۆ کەسی گونجاو دیاریبکە، فێری چۆنێتی ئەنجامدانی کاری پێ سپێردراویشیان بکە، ئەوجا کاتێکیش بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەشیان بۆ دیاریبکە، دواتریش بەدواداچوونت لەبیرنەچێت، ئەوجا بە شێوەیەکی ڕێك و گونجاو لەگەڵیان کۆببەرەوە و بزانە کارەکانت چۆن بەڕێدەکەن.

## ١٢) گەشە و باڵابوون:

**(( ڕەنگە جوانترین شت کە مرۆڤ لەژیانیدا قەرەبووی پێ وەربگرێتەوە ئەوەیە کە یارمەتی ئەوانی تر بدات، بەمە یارمەتی خۆیشی دەدات))** ، گەر یارمەتی کارمەندانت

بکەی بۆئەوەی پێش بکەون و گەشەبکەن، ئەمە دەبێتە هاندەرێکی مەزنیان، بۆئەمەش کارمەندانت بەشداری کۆرەکا بکە بۆ فێربوونی بەهرەی نوێ، هانیان بدە بۆئەوەی بەردەوام بن لە فێربوون یان بەلای کەمەوە دبلۆم لەئیش و کاریاندا بەدەست بێنن. گەر بتوانی باشتر وەهایە نەختێك لەرووی دارایشەوە بۆ ئەم مەبەستە کۆمەکیان بکەیت.

رێگەمەدە بە کارمەندانت بۆماوەیەکی زۆر هەمان کار ئەنجام بدەن، بۆئەوەی بێزار نەبن، وەها هەستبکەن کە بەساڵدا رۆدەچن بەلاّم لەکاردا رۆناچن، ناپلیۆن پۆناپەرت دەڵێت: (( **دانایی ئەوەیە وەها لەخەڵك نەکەیت بەساڵدا رۆبچن، لەکاتێکدا لەهەمان کاردا رۆدەچن))** .

خەڵکی بە بەدیهاتنی گۆران و گەشە هەست بە باشتربوونی دۆخی گشتییان دەکەن، سۆکرات دەڵێت: (( **مرۆڤ چێژ لە گەشەپێدانی زەویەکەی و دوایین ئەسپیشی دەبینێت، بەلاّم من چێژ لەوەدەبینم رۆژ لەدوای رۆژ خۆم پێش بخەم))**.

تۆیش کاتێك یارمەتی کارمەندانت دەدەی بۆئەوەی پێش بکەون، کەڵك لەم شارەزاییە زێدەیان دەبینی. ز.ج.زجلار دەڵێت: **"ئەوەدەبیت و بەدەست دێنیت لەژیانتدا کەدەتەوێت، گەر یارمەتی ئەوانی تریش بدەی بەوە بن و بەدەست بێنن دەیانەوێت"**.

## ١٣) رەفتاری کەسێتیت:

د.کلیمن ستۆن دەڵێت: **" جیاوازییەکی ئاسایی لەنێوان خەڵکدا هەیە، بەلاّم ئەم جیاوازییە کەمە ناچوونییەکی گەورەی ئافراندووە. جیاوازییە ئاساییەکەش رەفتاری ئەرێیی یان نەرێنییە"** .

گەر یەك هۆکاری بنچینەیی بەکەڵك هەبێت بۆ هاندانی کارمەندانت ئەوا رەفتارەکانی تۆیە، بۆنمونە شێوازی قسەکردنی تۆ، گوێگرتن و پێکەنین و شێوازی جوڵەکانت، تۆ وەکو ئەو بەرێوەبەرە وەهای کە هەمیشە لەژێر چاودێرییەکی ورددایە، دەبیتە جێگەی

شیکردنەوە و ڕەخنە، بڕیار لەسەردانت. ڕەفتار و پلەی پەیوەندیت ڕەگەڵ کارمەندان و کۆمپانیەکەشتدا لەهەر شتێکی تر گرنگترە.

ئێستایش تۆ ئاشنای ئەو ڕێگەیە دەکەین کە بتوانی لە ڕەفتارتدا بۆ هاندانی ئەوانی تر پێڕەوی بکەیت:

(أ) هەڵگری پێکەنینی گەرمی سەر ڕووخسارت بە، پێکەنین بەسۆزیت پیشان دەدات، ئاسودەیی بەخۆیشت دەبەخشێت و ئارامیش بە کارمەندانت، ئیمرسۆن لەم بارەیەوە دەڵێت: **"ئەوکاتەی کەسێکی خۆشحاڵ دێتە ژوورێکەوەو وەکو ئەوە وەهایە گلۆپێکی تازەت داگیرساندبێت"**.

(ب) گوێ بۆ کارمەندانت ڕادێرە. زینۆ دەڵێت: **"دوو گوێ و یەك زمانمان هەیە بۆئەوەی پتر ببیستین و کەم بدوێین"**. لە کارمەندانت بڕوانە کەلە دەوروبەرتن ، گرنگییان بۆ دیاربخە. پرسیاریان ئاراستەبکە و وەهایان لێبکە هەست بە گرنگی بکەن. خەڵکی حەزیان بەو کەسانەیە گوێیان لێ دەگرن بۆیە ئارامگریش بە، تاوەکو دەتوانی گرنگی پێدانی خۆتیان بۆ دیاربخە، مەهێڵە هیچ شتێك لەمەت داماڵێت.

(ت) کارمەندانت بە ناوی خۆیانەوە بانگێشت بکە، ناوەکانیان خۆشترین وشەی بیستراویانە، بۆیە کاتێك مرۆیەك بە ناوی خۆیەوە بانگ دەکەیت وەهای لێدەکەیت هەست بە گرنگی پێدان و ویستراویی بکات، بۆیە هەولبدە ناوی هەموو کارمەندانت لەیادبێت، پێیویستە بەجوانترین شێواز بانگێشتیان بکەیت.

(پ) بەرپرسیاری هەموو هەڵەکانت بە، هەولی سەرزەنەشتکردنی ئەوانی تر مەدە، بەتایبەت کاتێك ویستت هەندێك کار بەوانی تر ڕاسپێریت، کەوتنە هەڵە شتێکی ئاساییە و لەکاردا هەیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەرپرسیارێتی هەڵگریت و تیشك بخەیتەسەر دۆزینەوەی چارەکان.

(ج) دادگەربە، لایەنگیری کەسێك مەبە لەسەر هیسابی ئەوانی تر، هەروەها ڕێگە مەدە نازناو و پێگەی بەڕێوەبەریت ببێتە لەمپەرێکی نێوانتان. دال کارنیگی دەڵێت:"

**لەبیرت بێت بەختەوەری لە ڕەگەزنامە و موڵکەکانتەوە سەرچاوە ناگرێت" چون بەختەوەری ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە بیرۆکە و بۆچوونەکانتەوە"**. لێرەوە بۆت دیاردەکەوێت کە ڕەفتارەکانت یارمەتیت دەدات بۆ هاندانی کارمەندانت، هەروەها دەشتکات بەو کەسەی هەڵگری بەرپرسیارێتی هەموو گرە و کێشەکان دەبێت. د.نۆرمان ڤینسینت بال دەڵێت:" **هەر ڕاستییەك ڕووبەڕوومان بێتەوە ئەوەندە گرنگ نییە لەچاو ڕەفتارمان بەرامبەر ئەو ڕاستییە" چون ئەوە کاردانەوەی ڕەفتارمانە ڕادەی سەرکەوتن و شکستمان دیاری دەکات"**.

### ١٤) ئاشنای گۆڕانەکانیان بکە:

گۆڕان بووەتە تایبەتمەندیی باوی ئەم ژیانەمان، هەوڵبدە کارمەندانت ئاشنای گۆڕانکارییەکانی دامەزراوەکەت بکەیت" چون ئەمە بۆخۆی وانەوانەکان لەناودەبات. نەوەك تەنها ئەمە و بەس، بەڵکو کارمەندانت توشی نارامی دەکات" چون دەزانن چی لەدەوروپشتیان دەگوزەرێت و هۆکاری پشت ئەو گۆڕانکاریانە چین، ئەمەش لای خۆیەوە دەبێتە هاندەریان بۆ کارکردن.

### ١٥) ڕێز لەکارەکانیان بگرە:

بۆ چارە ڕەشی زۆرێك لە بەڕێوەبەرەکان ڕێزی کاتی کارمەندانیان ناگرن، بۆنمونە: کاتێك بەڕێوەبەرێك دەیەوێت چاوی بە کارمەندێکی بکەوێت، داوای لێ دەکات هەمووشت دەست لێ هەڵبگرێت و بێتە ژورەکەی، یاخود داوای لێ دەکات دەس و دەم ڕاپۆرتێکی بۆ تەواوبکات! ڕەگەزی کات هۆکارێکی گرنگە بۆ هەستکردن بە گرنگی و ڕێزگرتنی خوود، گەر ڕێزی کاتی کارمەندانت نەگریت، تۆ بەم کارەت لە شکۆمەندییان کەم دەکەیت، توانای هاندانیشیان کەم دەکەیت، بەڵام گەر کەڵکت لە ڕیزگرتن لە کاتەکانیان

گرت، ئەوا هانیان دەدەیت و دەیان وروژێنی و هەستی قوڵیان بۆ دەڕەخسێنی لەبۆ ڕێزگرتنی خودیان و هەمدیس ڕێزی بەهای کاتیان فێردەکەیت.

### ١٦) بەتایبەت گرنگیدان بۆ کارمەندانت دیاربخە:



هەوڵبدە بزانیت کارمەندانت حەزیان بە چییە، گەر ئارەزوویان لە وەرزش بوو، بۆنموونە: بزانە کام جۆرە وەرزش: هۆکی، پێ، باڵە، سەرمێز، هەوڵبدە خاڵێکی هاوبەش لەنێوان تۆ و ئەندامانی دەستەی کارمەندتدا بدۆزیتەوە، ڕەنگە خوێندنەوە یان تێڕامان، یۆگا، ئۆتۆمبێل بێت.

هەوڵبدە وەها بۆ کارمەندانتی دیاربخەی کە بێگومان تۆ گرنگییان پێ دەدەیت، هەمیشە پرسیاری دۆخی خۆیان و خێزانەکەیان بکە، لە بۆنەکانیاندا هاوبەشبە، ئەمە دەبێتە هاندەریان و کەڵکیشیان لێ وەردەگرن، هەروەها ڕادەی خۆش ویستنی تۆیش لای ئەوان پتر دەبێت و ڕادەی هەستکردنیان بە ئەمەکگیری(ئینتیما)یان باشتر دەبێت.

### ١٧) دیاری:

دیاری هۆکارێکی هاندەری گرنگە جابا دیارییەکە گرانیش نەبێت، گرنگ ئەوەیە بە وردیەوە دیاریی و کەسەکان هەڵبژێری. دیاری ئەوکاتە کارادەبێت کە بەدڵی کارمەندانت بێت نەوەك تۆ. گەر کارمەندێك زۆری حەز بەشتێکە ئەوا باوەکو دیاریەکەت لەو بوارەبێت، بۆنموونە: گەر حەزی لە یاری هۆکییە ئەوا باوەکو دیاریەکەت پلیتێکی ئامادەبوون لەیاری هۆکی بێت. ئەم چەشنە دیارییانە هانی دەدات و بۆ باشتر کارکردن و خۆشویستنی تۆ وکارەکەیشی.

## ١٨) جەژنی لەدایك بوون:

ئاهەنگ گێڕان بە جەژنی لەدایکبوونی کارمەندانت ڕەنگە ببێتە هۆی هاندانی کارمەندانت، مەرج نییە ئەم ئاهەنگە لە هۆڵ یان ئوتێلێکی گرانبەهادا ئەنجام بدرێت، بەڵکو دەتوانی تەنها مێزێك و کێکێکی بۆ ئامادەبکەی و هەموو کارمەندانی تر لە دەوری کۆببنەوە و چەند خولەکێك ئاهەنگ بگێڕن، دیارکەشت با کارتێك بێت لەتۆوە کە واژووی تۆی لەسەربێت و دواتریش واژووی هاوکارەکانی و کەسانی تری گرنگی دامەزراوەکانی لەسەر دابنرێت، ڕەنگە ئەمە زۆر ساکاربێت بەڵام زۆر کاریگەرە و ئەنجامی باشی دەبێت بۆ هاندان و باشتر متمانە بەخۆکردن و بڕیاردان.

## ١٩) بەرهەمی باش:

ئەو بەرهەمەی دەیخەیتەبازاڕەوە گەر خراپ بوو ئەوا خەم و نیگەرانی توشی کارمەندانت دەکەیت و ناچاریان دەکەین دووچاری گلەیی بەکاربەران ببنەوە، بە پێچەوانەشەوە کاتێك ئەنجامەکەت باش و ئاست بەرز دەبێت، ئەوا کارمەندانت شانازی بە ئیشەکەیان و تۆی بەڕێوەبەریانەوە دەکەن، بریکارەکانیشت شانازی بە فرۆشتنی بەرهەمەکانتەوە دەکەن، بێگومان ئەمەش هاندەرە بۆ باشتر کارکردنی کارمەندانت.

## ٢٠) گرەوەکانیان بۆ پێش چاوبخە:

میلین کلیر دەڵێت: **"لەبەرئەوەی من مرۆڤێکی تاکم، بۆیە ناتوانم گشت شت ئەنجام بدەم، بەڵام یەك شت هەیە دەتوانم بیکەم، ئەویش ئەوەیە ڕەتی ئەوە نەکەمەوە کە دەتوانم ئەنجامی بدەم"** .

هەوڵبدە هەلێك بە کارمەندانت بدەی بۆ ئەوەی فێری بەهرەی نوێبن و بەهۆیەوە ئامانجەکانت بۆ بەدی بێنن، ئەمەش لای خۆیەو هانیان دەدات بۆ باشتر کارکردن، بەلام ئەمەش بۆخۆی پشت بەستە بەشێوازی ڕەفتاری تۆ ڕەگەڵ کارمەندانت و چۆنێتی گونجاندن و ئامادەکردنیان لەگەڵ لەمپەر و ئاریشە نوێیەکان، بۆنمونە: دەتوانی داوا لە

سەرپەرەشتیارانی لقەکانی کۆمپانیاکەت بکە یکە ١٠٪ ڕێژەی فرۆشیان زیاد بکەن، یاخود داوا لە بەشی ڕاژەی کڕیاران بکە کە ١٠٪ ڕێژەی سکالاّکان کەم بکەنەوە.

تێبینیت کرد پارە تۆخمێکی بنچینەیی نەبووە لەنێو هەموو خالاّنی پێشووتر؟ دەزانی بۆچی؟ چونکە:

لە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت بە فاکتەرەکانی هاندان کەلەسەر ٢٠٠ کارمەند لە ٢٢ بانك ئەنجام درا دیارکەوت کە زیادکردنی مووچە پلەی نۆیەمی گرتبوو لەنێو هۆکارە گرنگەکانی هاندانی کارمەندان. **پارە هاندەرێکی گرنگە بەلاّم گرنگترین نییە.** ڕاستە پارە وەکو پێویستییەك وەهایە کە لەژێر سێبەری مانەوەدایە و کەمی دەبێتە هۆی ناجێگیری و کەمی هاندەریش، ئەمەش دەبێتەهۆی بەجێ هێشتنی کار. بەلاّم ئەمەش مانای وەها نییە تاوەکو موچەی کارمەندانت بەرزبکەیتەوە باشتر و باشتر کاردەکەن، نەخێر! هەروەها دەتوانی داوا لە کارمەندانت بکەی کاری نوێت بۆئەنجام بدەن، ئەمەش قازانجی زۆری بۆت دەبێت" چون بەرهەمت بەمە زیاودەبێت و هانی باشتر کارکردنی کارمەندانت دەدەی و متمانە بەخۆکردنیان بالاّتر دەکەیت.

مارك کرۆلی دەڵێت: **" گەر ڕووادانی ئەمە حەتمی بێت، ئەوا بۆ خۆم دەگەڕێتەوە"**

IF IT TO BE IT IS UP TO ME

## ١٥-پێنج ڕێگەی كارا بۆ هاندانی خۆت:

**((بۆ دەربڕین و ئەنجامدانی هەرشتێك هەمیشە ڕێگەیەكی باشتر هەیە، تۆیش تەنها پێویستە بیدۆزیتەوە))**

**تۆماس ئەدیسۆن**



هاندانی كارمەندانت بێگومان كاریش لەخۆت دەكات. بەڵام پێویستە فێربیت و بزانیت چۆن خۆت هاندەدەیت بۆئەوەی تواناداربیت لەبۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەو ئاستەنگ و كێشە لە ژمارە نەهاتوانەی دووچارت دەبنەوە و بتوانی هەڵیان بسوڕێنی. بۆئەمەش پێنج ڕێگەت بۆ بەردەست دەخەم كە دەتوانی خۆتیان لەڕێگەوە هانبدەی:

### ١-دیاری كردنی ئامانجەكان:

كاتێك ئامانجەكانی ژیانت دەست نیشان دەكەیت هەست بەهێزێكی نەبڕاوە دەكەیت بۆ بەدیهاتنی ئامانجەكانت. ئەمەش لای خۆیەوە دەبێتە هاندەرت" تاوەكو بتوانی ئامانجت بپێكی ئەوەندەی تر هاندراو و بەهێزتر كاردەكەیت.

دەتوانی بە نوسینەوەی لیستێك لەو شتانەی كە حەزت پێیەتی و دەخوازی ئەنجامی بدەی یان پێشكەشی بكەیت دەست پێبكەی. ئەوجا ئەم هیوایانەت بەپێی گرنگییان لە یەكەوە بۆ سێ ئامانج بنوسەرەوە، ئەمەش گرنگی نایابی دەبێت بۆ هاندانت، بۆئەمەش پێویستە كاتێك دیاریی بكەیت بۆ بەدیهاتنی ئەم ئامانجانەت.

لێرە بەدواوە هەوڵی ئەنجامدانی ئەو شتانە بدە کە یەك ئینچ زیادتر لە بەدیهاتنی ئامانجەکەت نێزیکت دەکەنەوە، ئەوجا فێربە هەموو ڕۆژێك بەر لەوەی بنووی ئامانجەکانت بخوێنیتەوە، وای دابنێ تۆ بەدیت هێناون، کاتێك بەئاگا دێیتەوە هەوڵی نوسینەوەی ئەم ئامانجانە بدە، بەلاّم بەشێوەی کاتی ڕانەبردوو. بۆنمونە: دەمەوێت کێشم بگاتە ٧٠ کیلۆ، دەمەوێت ١٠٠،٠٠٠ دۆلار ساڵانە داهاتم بێت، دەمەوێت من ببمە بەڕێوەبەری گشتی. ئەمە تەنها پێنج خولەکی لەکاتی تۆ پێویستە، دواتر وای بێنە پێشەچاوی خۆت کە بێگومان ئامانجەکانت بەدیهێناوە. هەموو بەیانییەکی زۆر ئەم کارە ئەنجام بدە، بێگومانبە لەوەی ئەمە دەبێتە زیادکردنی هاندانت بۆ باشتر کارکردن و هانت دەدات بۆ گۆڕینی خەونەکانت بۆ ڕاستی، بۆیە هەمیشە ئەم گوتەیەی ناپلیۆن هیلت لەیادبێت:" **هەرشتێك ئاوەزی مرۆڤ بتوانێ پەی پێبەرێت و بڕوای پێ بهێنێت دەتوانێ بەدی بهێنێت"** .

**٢-گەشەپێدانی خوود:**

ڕۆلاند . ئۆسپۆرن دەڵێت:" **تۆ ناتوانی پێش بکەوی مەگەر هەوڵبدەی شتێك ئەنجام بدەی لەوە بالاّتربێت بە ئاوەزتدا نێت"** . گەر جار بەدووی جار لە ئەنجامدانی ئەم کارە بەردەوام بیت، ئەوا هەمیشە هەمان ئەنجامت چنگ دەکەوێتەوە. هەوڵبدە لەناوچەی خەمۆك بەخش و هەڵبڕقێنەر بەدووربیت، شتی نوێ ئەنجام دەربە. هەندێك کاسێت بکڕە، لەکاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلتدا گوێیان لێبگرە، ڕۆژانە بەلای کەمەوە ٢٠ خولەك و گۆڤار و کتێب بخوێنەرەوە، فێری شتی نوێبە" لەڕێگەی کۆڕ و کۆبوونەوەکانەوە، خۆیشت دەتوانی شتی نوێتر و باشتر فێری خۆت بکەیت. ئێمە ئێستا لەچەرخی زانیارین کە زانیاری بووەتە هێز، تاوەکو زێدەتر فێربیت، ئەوەندەش بۆ پێشەوە هەنگاو دەنێی، هەروەها باشتر بەرامبەر خۆت هەست دەکەیت. بەردەوام هەست بە ڕێزگرتن لە خۆت و بەهای بالاّی خۆت بکە بۆئەوەی ئەمەش ببێتە هاندەرت و لە بەدیهاتنی ئامانجاکانت

نێزيك ترت بكاتەوە. ڤينس لۆمبارى دەڵێت:" **سروشتى ژيانى مرۆڤەكان هاوتايە لەگەڵ مەوداى پابەندى بۆ بەديهاتنى ئامانجەكانى، بە چاو پۆشين لەو بوارەى هەڵى بژاردووە".**

## ٣-گرنگى پێدانى تايبەتى:

حەز يان گرنگى پێدانى تايبەتيت هەيە؟ حەزت بە وەرزشە، نوسين يان چێشت لێنانە؟ بە چاوپۆشين لەوەى گرنگى پێدانەكەت چييە، گرنگ ئەوەيە ئايا تۆ ڕاهاتووى لەسەر ئەنجامدانى بەردەوامى ئەو شتانەى حەزى پێ دەكەيت ؟ گەر هيوايەتێكت نييە هەوڵى دۆزينەوەى بدە" چون بەرەو ژيانێكى جێگير و هاوسەنگت ئاراستە دەكات. من زۆرێك لە بەڕێوەبەرانى جێبەجێ كارى دەناسم حەزيان لە يارى تێنس يان وێنەكێشانيشە، هەوڵى ئەنجامدانى دەدەن بە يەك بۆ دووجار بەلاى كەمەوە لەهەفتەيەكدا، هاوڕێيەك دەناسم حەزى بەوەيە لەناو باخچەكەيدا كاربكات، هەندێك مەشقى جەستەيى ئەنجام بدات، من بۆخۆم زۆرم حەز بە چێشت لێنانە" چون لە خەمەكانى كار دوورم دەخات. مەڵێ كاتم بۆ ئەمە نييە، ياخود بە گرنگى نازانى، دەبێت ئەمە ئەنجام بدەى، دەبينى چى ئەنجامێكت دەبێت كاتێك لێى تێڕادەمێنى. هيوايەت يارمەتيت دەدات بۆ چێژ وەرگرتن لە كاتەكەت، هەروەها هانت دەدات بۆ كاركردن بە چالاكييەوە. هنرى فۆرد دەڵێت:" **ئەو كەسەى بەردەوام فێردەبێت، بەگەنجى دەمێنێت، مەزنترين شت لەژياندا هێشتنەوەى ئاوەزە بە گەنجێتى"** .

## ٤-يانەى تايبەتمەندان:

ئەم بيرۆكەيە هێشتاكە يەكێكە لە مەزنترين و كاريگەرترين بيرۆكەى هاندەرم. يانەيەكم دامەزراند و ناوم لێنا يانەى تايبەتمەندان. دە بەڕێوەبەرى سەركەوتووم هەڵبژارد، ئەوانەى خۆم دەيان ناسم و لە بيركردنەوەدا ئەرێيين، سوبحەينانى هەموو دوو شەممانێك يەكترمان دەبينى لە كاتژمێر حەوت بۆ نۆ، ئەمەش پاش قاوەڵتييەكى تەندروست بوو، تاوتوێى گرفتەكانى پێشمان دەكرد، هەر هەفتەيەك كێشەى يەكێكمان

ناوتویێ دەکرد، بیرمان لەچارەکردنی دەکردەوە، زۆرجار دەیان چارەیان بۆ کێشەیەك دەدۆزییەوە. ئەم چاوپێکەوتنە هەمیشە ئەرێیی کاریگەر بووە، شتی نوێی فێری هەمووومان دەکرد، تۆیش دەتوانی هەمان شت ئەنجام بدەی، لیستی کۆمەڵێك بەڕێوەبەری سەرکەوتوو بنوسیتەوە، ئەوانەی لەگەڵ تۆدا لە کێبڕکێدا نین، پەیوەندییان پێوەبکە، بیرۆکەکەتیان بۆ بخەرە ڕوو، ئەنجامەکەی ناوازە دەبێت، ئەمە تەنها هانت نادات، بەڵکو بازنەی ناسراوی و زانینەکانت فراوانتر دەکات و فێری بەهرەی نوێتر دەبیت. جۆرج برنارد شۆ دەڵێت:" **تۆ دەبینی شتەکان ڕوودەدەن، دەپرسی بۆچی ڕوودەدەن؟ بەڵام من خەون بەو شتانەوە دەبینم کە ڕوویان نەداوەو دەپرسم بۆچی بەڕاستی ڕوونادەن؟**" .

### ٥-تیانوسی ئەنجامدراوەکانی ڕۆژانە:

ڕۆژانە چی ئەنجام دەدەیت لە تۆماری ڕۆژانەتدا بینوسەرەوە، هەوڵبدە تیشك بخەیتەسەر ئەوەی بەڕاستی ئەنجامت داوە، نەوەك ئەو شتانەی ئەنجامت نەداون. بەم کارەت هێز و توانا و سەرکەوتنەکانت مەزنتر دەبن. ئەم نوسراوە ڕۆژانە بخوێنەرەوە و بەخت بڵێت کە ئەمەت ئەنجام داوە و دەتوانی جارێکی تریش بەباشترەوە ئەنجامی بدەی. بە تێپەڕبوونی کات تیانوسی ئەنجامدراوەکانی ڕۆژانەت دەبێتە هاوڵی بەسۆزت.

وەك دەبینی، هیچ شتێك نەکردەیی(مەحاڵ) نییە، دەتوانی هاندەر بۆخۆت بئافرێنی، جا هەرچییەکیش ڕووبدات و بوێت تۆ هەر دەتوانی هاندراوبیت. جۆن هایۆد دەڵێت:" **هیچ شتێك نەکردە نییە لە پێشی دڵێك حەز و ئامادەیی تیایە**"، هەروەها جۆرج س. باتۆن دەڵێت:" **گەر مرۆ باشترینی ئەنجام دا هیچ شتێك دوای ئەمە بوونی نابێت**" ، بۆیە تۆیش باشترین ئەنجام بدە و دەبیتە خاوەنی هاندەر و وزەی پێویست بۆ بەدیهاتنی ژیانێکی باشتر.

## 16-بەرنامەی زمانەوانیانەی دەمار و هاندان:

**((مرۆڤ خۆی بەختی خۆی دروست دەکات))**

**فرانسیس بیکۆن**

بەرنامەی زمانەوانیانەی دەمار کە بە (NLP)[1] ئاماژەی پێدەکرێت لەساڵی ١٩٧٣ لەسەر دەستی هەردوو پزیشکی دەروونی : جۆن گریندەر و ڕیچارد باندلر دیارکەوت، ئەم بەرنامەیە بە شوێن کەوتنی نمونەیەکی سەرکەوتوو دەبێت، بەوەی تۆ ڕێچکەی کەسێکی سەرکەوتوو دەگریت، بەکوت ومتی هەمان شتەکانی ئەو ئەنجام دەدەیت بۆ گەیشتن بە ئەنجامەکانی ئەو، ئەم بەرنامەیە لەدیارکەوتنیەوە تاوەکو ئێستا سەرکەوتنی خۆی تۆمارکردووە و لەماوەیەکی کەمدا توانیویەتی ئەنجامی مەزن و سەرسوڕهێنەر بەدەستەوە بدات، بەکەڵکە بۆ چارەکردنی فۆبیا( شۆك)ی ترس، هەروەها بۆ ستراتیژیەتی سەربازی و هۆکاری پشت هەستکردنی خەڵکی بەهەندەرەکانیان بەکەڵکە، هۆکاری داڕووخانیشیان پیشان دەدات.

لەڕێگەی جێبەجێکردنی ستراتیژیەتی هاندانەوە مرۆڤ دەتوانێت هاندراوبێت بە پلەیەکی باڵا، بۆیە ڕێگەم پێبدە نمونەیەکی هاندانت پێشکەش بکەم لە ڕێگەی پرۆگرام سازی زمانەوانیانەی دەمارەوە کە هەرئێستا هاندراوت دەکات.

ئەزمونێکت لەبیرە کە تۆ تێیدا لە لوتکەی هاندانـدابیت؟ بۆ نمونە ڕۆژی تەواوکردنی زانکۆت کە پلەیەکت بەدەست هێنابێت؟ چاوانت دابخە و هەست بەهەمان دۆخت بکەرەوە کەلە لوتکەی متمانە و بەختەوەری و هاندانـدا بویتە. وەکو ئەوەی ئەم ئەزمونە ئێستا ڕوویدابێت وەها بژی، هەوڵبدە هەمووشتێك بەیادی خۆت بهێنیتەوە ئەوەی بینوتە و بیستوتە و هەستت پێکردووە لەو کاتەدا. تێبینی بکە و بزانە لەو کاتەدا چیت بەخۆت

[1] The Neuro-Linguoistic Programming

گتووە؟: کاتێك لەم ئەزمونەدا دەگەیتە لوتکەی پەیوەستەیی، مشتی ڕاستت بنوقێنە، نامەیەك بۆ ئاوەزی هەناویت بنێرە و بەهەمان شێوازی پێشوو هەناسەبدە، هەست بە هەمان هەستت بکە، لەهەمان دۆخدا بژی، بێگومانبە لەوەی هەرجارێك مشتت بەم شێوەیە بنوقێنی هەمان هەستت دەست دەکەوێت، ئێستایش مشتەکانت بکەرەوە و هەوڵبدە دووبارە بینوقێنیتەوە، چی ڕوودەدات؟ گەر بگەڕێیتەوە بۆ هەستکردنت بە هاندان ئەوا سیستمی پرۆگرام سازی زمانەوانیانەی دەمارت بەباشی کاردەکات گەر شتێك ڕوویش نەدات، هەوڵبدە لەگەڵ ئەم ئەزمونەدا هاوڕێیان بە، هەوڵبدە ئەمە بەشێوەیەکی کاریگەربێت، ئەوجا مشتت بنوقێنەرەوە.

**ئێستایش سترتیژییەتێکی هاندانت پێشکەش دەکەم کە کارەکانت ئاسانتر دەکات:**

**١-هەناسەدان:**

هەناسەیەکی قوڵ هەڵبمژە تاوەکو سیت پڕ لە هەوا دەبێت( تاوەکو یەك بژمێرە) ئەوجا هەناسەکەت دەربکەرە دەرەوە( تاوەکو ژمارە چوار بژمێرە بەدرێژەپێدانی) وەکو ئەوەی فوو لە کوژانەوەی مۆمێك بکەیت، دواتر ئەمە پێنج جار دووبارە بکەرەوە.

**٢-وادانان :**

وای دابنێ تۆ لە لوتکەی هاندانی، ئەمەش وەها لێبکە وەکو ئەوەی ڕاستەقینەبێت. وەها هەستبکە کە هیچ شتێك ناتوانێت بتوەستێنێ و سنور بۆ هاندانت دانێت.

**٣-باری ئەندامی:**

هەستە و دانیشە لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە پشتت لەبارێکی ڕێکی دابێت و سەریشت بۆ سەرەوە.

**٤-دووپاتی:**

بەخۆت بڵێ: (( دەتوانم ئەمە ئەنجام بدەم))پێنج جار، ئەجا بە دەنگێکی بەرز ئەو دەستەواژەیە دووبارە بکەرەوە.

**٥-هەستەکان:**

دووپاتییەکانی پێشووتر بکەرە هەستی ڕاستەقینە و هەوڵبدە بەهەموو هەستەکان هەستی پێبکەیت.

**٦-مشتت:**

کاتێك ئەو هەنگاوانەی سەرێ ئەنجام دەدەی مشتت بنوقێنە، دواتر بیکەرەوە، ئەوجا بۆ چرکەیەك دایبخەرەوە، بەردەوام بە لەسەر ئەنجامدانی ئەم تاقیکردنەوەیە تاوەکو دەبێتە بەشێك لەتۆ. ئێستایش کەی ویستت بگەیتە لوتکەی هاندان دەبێت مشتت بنوقێنی" بۆئەوەی هەستی ئەم هەنگاوانەت بۆ بگەڕێتەوە و هەمان هەستت بۆ پەیدابیبێتەوە. وابزانم ئەمە نوێ و باشترین بنەماکانی هاندانە، تۆیش دەتوانی ئەوانی تر هانبدەی، ئەوجا بە دووبارە خوێندنەوەی ئەم بەشە هەموو خاڵەکانی جێبەجێ بکە. کۆنارد هیلتۆن دەڵێت:" **سەرکەوتن بە تەواوەتی پەیوەستە بە کار و کردارەوە، کەسی سەرکەوتوو لەکارەکەی بەردەوام ڕەنگە بکەوێتە هەڵەوە، بەڵام هەرگیز ناوەستێت**". بۆیە بە وریاییەوە بەردەوامی بەکارەکەت بدە و هەرگیزمەوەستە، دەبینی ئەنجامەکانت ناوازە دەبن، وەك جۆن د.ڕۆك فیلیر دەڵێت:" **هیچ شتێکی پێویست بوونی نییە بۆ بەدیهاتنی سەرکەوتن لە کۆڵنەدان گرنگتر بێت" چون بەم هۆکارە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ دەبێت" تەنانەت سروشتیش**". هەوڵبدە سود لەم ستراتیژییەتە کارایانە وەربگری و لەمرۆوە دەست بە کردنەکردارێان بکەی.

**(( زۆرینە ئامۆشیاری وەردەگرن، بەڵام تەنها زاناکان سودی لێ دەبینن))**

**بابلیلیۆس سیرس**

**بڕیاربدە ببیت بە کەسێکی هاندەری ناوازە و تایبەتمەند.**



# کلیلی سێیەم

## گۆڕان..

## کەتواری ڕاستەقینەی ژیان



((ئەوەی دڵەڕاوکێم توش دەکات سەرنەکەوتنە لەبواری کاری خۆمدا، سود لەهەموو ئەوانەش وەرنەگرم کە خوێندومن، نەزانم کام شت باشترین و دروستە، نەتوانم بگۆڕێم بۆئەوەی بەدییهێنم و ببم بە کەسێکی کەم توانا بۆ چارەکردنی شکست و بێدەستەڵاتیەکانم))

کۆنفۆشیۆس

## ١٧-ناوچەی حەسانەوە و گێلێتی نواندن:

(( هەموو مرۆڤ مافی ئەوەی هەیە سەرکێشی بە ژیانیەوە بکات" لە هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی))

جان جاك ڕۆسۆ



گۆڕان ڕاستینەی کەتواری(واقیعی) ژیانە، بۆیە مانەوەیەکی بەردەوامە. گۆڕان هۆکارێکە بۆ گەشە و پیشکەوتن و گەیشتن بە ئاسۆی نوێ. هەرگۆڕانە یارمەتی دامەزراوەکانی داوە بۆ مانەوە و برەودان بە بەردەوامی، ئەو کلیلەیە کە بەهۆیەوە سەرکەوتن و دەستکەوت بەدی دێت، کەواتە گەر گۆڕان ئەم هەموو قازانج و کەڵکەی هەیە بۆچی زۆرینەی خەڵك لێی بەدوور و ترساون؟ بۆچی بەڕێوەبەرەکان گۆڕان بە نەرێنی دەبینن و هەمیشە لە دۆخی بەرگری نەگۆڕاندان؟ بۆچی هۆراسی فەیلەسووف گتویەتی:" **گەر ویستت دوژمنت هەبێت، ئەوا هەوڵی گۆڕینی شتێك بدە"** . وەڵامی ئەم پرسیارانە لە ترسدا خۆی دەبینێتەوە: ترسان لە نادیار، ترسان لە شکست و سەرکێشی. سروشتی ئێمەی مرۆڤ حەزی جێگیربوون و ئارامی بەسەردا زاڵکردووین. زۆرکەس حەزیان بە گۆڕانە، بەڵام زۆرینەی کۆمەڵگە و بەڕێوەبەرانیش لێی دەترسێن؟! چونکە لە ناوچەی حەسانەوە و گێلێتی نواندنیان دووردەخاتەوە، ئەم کەسانە بەردەوام بوونە لەسەر ئەنجامدانی کارگەلێك لەسەر هەمان ڕێچکە و ڕەوتی دووبارەیی و بۆماوەیەکی زۆر، بۆیە دەترسێن و هەست بەدڵەڕاوکێ دەکەن لە گۆڕانکاری و توشی ئەنجامدانی سەرکێشییان دەکات. ئەم کەسانە حەزیان بەوەیە تاوەکو ماون هەمان جۆرە ئیش ئەنجامبدەن، جا گرنگ نییە چەندساڵ و

چەندجاری دووبارە دەکەنەوە هەمان ئەنجامیشیان چنگ دەکەوێتەوە. بۆیە هەموو شتێك دەکەن بۆئەوەی لە گۆڕانیان دووربخاتەوە و هیچ کاتیش ئامادەی هەنگاونان نین بەرەو بەدیهاتنی گۆڕانکاری لەژیانی خۆیان و دامەزراوەکەیاندا.

بەڵام گۆڕان هەرهەیە و ماوەتەوە و تیاناچێت، جا بمانەوێت یانیش ڕقمان لێی بێت. گەر بەجوانی لەدەوروپشتت ڕوانی دەبینی هەمووشت لەگۆڕاندایە، بەردەوام دەگۆڕێن. لە سروشتدا وەرزەکان دەگۆڕێن، کەش دەگۆڕێت.

لەخۆت بڕوانە دەبینی تەمەنت دەگۆڕێت، حەزەکانت دەگۆڕێن، تەنانەت ئاتاجی و ویستراوەکانیشت دەگۆڕێن، کار و پلەکانت دەگۆڕێن، هەموو ئەمانە بەهۆی گۆڕانەوە بەدیهاتووە.

تێبینی گۆڕانی کەرتی تەکنەلۆژی بکە لە بواری کارکردنتدا، ئێستا تۆ تەلەفۆن( دوورژنەوت)ێکی ئاڵۆزترت لەلادا بەردەستە، فاکس، ئامێری وێنەگرتنی بەڵگەکان، دەزگای کۆمپیوتەر[٢]، لەبواری پزیشکیدا دەبینی ڕۆژانە دەیان جۆر لە ئامراز و شێوازی نوێی نەشتەرگەری دێتەبوون، بۆیە گۆڕانکاری شتێکی زۆر گرنگە و دەبێت لەژیاندا بوونی بەردەوام بێت.

ئەلیانۆ ڕۆزفیلت دەڵێت:" **هێز و ئازایەتی و متمانە لەهەر ئەزموونێکەوە بەدەست دەهێنی کە لەسەرەتاوە بە ترساوی لێی وەستاوی**" . دەتوانی بڵێی:" لەماوەی ئەم دۆخە ناخۆش و ترسناکەدا ژیاوم و دەتوانم لەپێشی هەموو ئەگەر و ئاستەنگەکانی

---

٢ کۆمپیوتەر: دەزگای زانینی، زانیاری ڕێکخار، زانینەشرۆڤەکار، دەزگای هونەرکاری زانیاری، دزگای ڕێکخستنی زانیاری، زانینە ڕێکخار، زانین گر، ئامێرەئاوەز، ئاوەزەئامێر.

تەکنەلۆژیا: زانیاری هونەری، دەزگای ڕێکخار، توخمە ڕێکخارە، ڕەگەزەچارەسەر، ئامێرە هونەر، ئامێرەژیرە، ئامێرە وردەژیرە(وەرگێڕ)

فاکس: نامە ئامێرییە کاغەزینە، ئامێرە نامە.

تریشدا بوەستمەوە" ؟ دەبێت ئەوکارە ئەنجام بدەی کە بڕوات وەهایە دەتوانی ئەنجامی بدەی.

لەبیرت بێت تاکە جیاوازییەکی ناوەڕۆکی کە بەڕێوەبەرەکان لەیەکتر جودا دەکاتەوە توانای وەرگرتنی گۆڕانە. بەڕێوەبەری سەرکەوتوو ئەوەیە کە دەست بە گۆڕان دەکات و دەستی لێ هەڵناگرێت، یاخود دەیەوێت خۆی لەگەڵدا بگونجێنێت گەر توشی بوو. ژاپۆنیەکان بە شکست خواردوویی لە جەنگی جیهانی دووەمدا ڕۆیشتنە دەرەوە، ئێستا لەزۆربەی بوارەکانی ژیاندا پێشبڕکێی یەکەمین دەکەن. ئێمە لەچەرخی تەکنەلۆژیاین و پێویستە سەر کەشتی پێشکەوتن بکەوین. بۆیە پێویستمان بەوەیە خێراترین و کشۆک ترین بین بۆئەوەی خۆمان ڕەگەڵ هەموو ئەو دۆخانەدا بگونجێنین کەلە بازاڕکاریماندا توشمان دەبێت. پێویستە سەرکێشی بکەین، لە ئەزمونەکانی پێشوترمانەوە فێربین، لەو کەسانەشی بەر لەئێمە بەم هەنگاوەدا تێپەڕیون. هەوڵی ڕێککردنەوەی ئامانجەکانمان" بدەین بە بەردەوامی دان بۆئەوەی بە ئامانج و ئەنجامی خوزراو بگەین. ڕۆبێرت جۆرڤیتا(سەرۆکی جێبەجێکاری کۆمپانیای کۆکا کۆلا) دەڵێت:" **ڕەنگە شکست بێنی گەر سەرکێشیت کرد، بەڵام بەدڵنیاییەوە شکست دەهێنی گەر سەرکێشی نەکەیت، گەورەترین سەرکێشیش ئەوەیە هیچ نەکەیت"** .

ئامانجی ئەم بەشە ئاشناکردنتە بەو بەهرە و تواناییە کارایانەی کە هانت دەدەن بۆ ڕووبەڕووبونەوەی گۆڕانەکان و خۆ لەگەڵ گونجاندنی، کە ئەمەش کۆمەکت دەکات بۆ ئەوەی بەخێرهاتنی گۆڕانەکان بکەیت و هونەرەکانی فێربیت، هەروەها ئاشنای شێوازەکانی دەستکردن بە گۆڕانت دەکات.

تاوەکو پتر لەبارەی گۆڕانەوە بزانیت ئەوەندەی تر پێی قایل دەبیت، دەیکەیت بە بەشێك لە ژیانی ڕۆژانەت، کاتێکیش هونەری گۆڕانکاری یاد دەگریت، دەتوانی سەرکەوتن و داهێنان بەدیبێنی و دەوڵەمەند و باشتربیت.

## ١٨-پێنج هۆکار وەها لەخەڵك دەکەن ڕقیان لە گۆڕانکاری بێت:

((هیچ شتێك نەماوە بمێنێتەوە تەنها گۆڕان نەبێت))

**هەرقل**



چەندین هۆکار هەن وەها لە مرۆی دەکات خوەشی لە گۆڕانکاری نەیەتەوە، هەست بە نائاسودەیی بکەن لە دووچاربوونیدا، بنچینەی پشت ئەم هەموو هۆکارانەش شێوازی پەروەردەکردن و چۆنێتی ڕەفتارکردنی باوك و دایکە ڕەگەڵ گۆڕانکاریەکاندا. بۆنمونە: گەر کەسێك لە ژینگەیەکدا گەورەکرابێت کە بە گۆڕانکاری قایلبێت، ئەوا ئەمیش ئامادە دەبێت بۆ قایل بوون بە گۆڕانکاری لە داهاتوو، پێچەوانەش ڕاستە، گەر لە ژینگەیەکی تەواو جێگیر گەورەبیێ، کە گۆڕانکاری و چاکسازیی تێدا قبوڵ نەکراوە، ئەوا کاتێك لە داهاتوودا گۆڕانکارییەکی توش دەبێت دووچاری گرفت و دڵەڕاوکێ دەبێت. بۆیە بەها و باوەڕمان کاردانەوەمان بەرامبەر گۆڕانکاریەکان دەست نیشان دەکەن جا ئەرێیی بن یاخود نەرێنی. لە گفتوگۆیەکمدا ڕەگەڵ بەڕێوەبەرێکدا، گوتی: هەست بە خەوشداری ناکەم بەرامبەر گۆڕانەکان، بەڵام هەمدیس کاتێك دووچاری دەبمەوە ترس و بێ متمانەیی بەرۆکم دەگرێت، کاتێك هۆکارەکەم لێ پرسی؟ گوتی: لە ژینگەی ساکاردا گەورەبووم، باوکم هەمووتەمەنی تەنها یەك جۆری کاری تاقی کردۆتەوە و لەیەك دامەزراوەدا کاری کرد، هەرگیز کارەکەی نەگۆڕی، هەمیشە لە سەرکێشی وشیاری دەکردمەوە. هەمیشە دەیگوت: **" چۆلەکەیەك لە دەستتدابێ باشتر لە دە چۆلەکە لەسەر درەخت بێ"** ، ئەم دۆخە ژیانەی تاوەکو

تەمەنی شەست وسێ ساڵی برەوپێدا و لەو تەمەنەدا هەر بەهەمان کارەوە سەری نایەوە، منیش هەمیشە وشەکانی باوکمم لەیاد بوو و نەمدەوێرا توخنی هیچ گۆڕانکارییەك بکەومەوە.

بەها و باوەڕمان کار لە ڕەفتارمان دەکات بەرەو گۆڕان، کاردانەوەمان بەرامبەر گۆڕانەکان دیاری دەکات و پێك دەهێنێ، بۆئەوەی وردتربین ئێستایش پێنج هۆکارت بۆ بەردەست دەخەم کە باون و وەها لە بەڕێوەبەران دەکات خۆیان لە گۆڕانکاری بەدووربگرن، ئەوانیش:

### ١-گومان:



بەڕێوەبەرەکان هەمیشە پێشبینی ڕوودانی زیان و شکست دەکەن لە گۆڕانەکانەوە، هەمیشە ئەمە دەڵێنەوە:" ئەمە سودی نییە" ، یاخود" پێشتر ئەمەمان تاقیکردۆتەوە"، بۆئەوەی چواردووبەری بەهەمان شێوەی ئەم هەست بکەن، بەدووی ئەو وشە و هۆکارانە دەگەڕێت کە ئاماژەی شکستن.

شکسپیر ڕاستگۆبوو کاتێك گووتی:" **گومانەکانمان دەمانترسێنن، وەهامان لێدەکەن ئەوشتانە لەدەستبدەین کە دەتوانین بەردەستی بخەین، گەر لەهەنگاوڵان بەردەوام نەبین".**

## ٢-سەرکێشی:



دەبینین بەڕێوەبەرەکە بەچڕی تیشك دەخاتەسەر کات و پارەی لەدەست دراو بۆ ڕوودانی گۆڕانکاری. بۆنمونە: بڕوای وەهایە بۆ کردنەوەی لقێکی نوێ پێویستی بە ٣ کارمەندی دیکەهەیە، هەریەکەیان ساڵانە ٢٥ هەزار دۆلاری پێویستە، ئەمە لەکاتێکدایە کە هەریەکەیان دەتوانن تەنها ١٥٠٠٠ دۆلار بەرهەمیان هەبێت، بەڕێوەبەرەکە بیر لەم سەرکێشییە دەکاتەوە کە لەخەرجکردنی ئەم پارەیەدا خۆی دەبینێتەوە نەوەك لە خەرج نەکردنی. وەك جۆن ف.کەنەدی دەڵێت:" **هەر وەرنامەیەکی کار تیابوو مەترسی و تێچوونی زۆرە، زیانی ئەو کارانەی ئاسودەبەخش و بێ کێشەن زیادترە لەوانەی سەرکێشی دار و تێچوون فرەی ماوەدرێژن**" .

## ٣-ئالودەبوون:



لە چوارچێوەی کاردا ڕەنگە گوێت لەکەسێك بێت بڵێت:" ئێمە لێرەدا شوێنکەوتەی پێڕەوێکی دیاریکراوین، ناتوانین بیگۆڕین"، یاخود: ئێمە وابۆماوەی ٢٠ ساڵە هەمان کار ئەنجام دەدەین بەهەمان شێواز، کەواتە ئێستا چۆن تۆ دەتوانی ئێستا بیگۆڕین؟ یاخود کۆمپیوتەر بۆ کەسانی تەمبەڵە و ئێمە دەتوانین بەبێ کۆمپیوتەر باشتر کارەکانمان ئەنجام بدەین؟! دەبینی بەڕێوەبەرێك بۆخۆی بێخەم دانیشتووە و هەمان شێوازی کار پێڕەو دەکات، کەچی چاوەڕوانی ئەنجامی باشتر و نوێترە و سەیری لەوەش دێت کە بۆچی دەستکەوتەکانی نەگۆڕاون و بۆباشتر هەنگاوی نەناون؟!

### ٤- ترس:

ترس لە هەستی ئاسایی ڕەنگە زۆر جار بەکەڵك بێت، بەڵام گەر ترس بووبە لەمپەری پێش قۆستنەوەی تواناکانمان، ئەوا پێویستمان بە ڕووبەڕوو وەستانەوە و زاڵبوونە بەسەریدا. هەستکردنی بەڕێوەبەرێك بە ترس ڕێگری لێدەکات لە قایل بوون بە گۆڕانکاری، هەموو شتێك ئەنجام دەدات بۆ وەستانی ئەم گۆڕانە. ئەم بەڕێوەبەرە ئامرازێکی نوێ ناکرێت و هیچ ئەنجام نادات تەنها مەگەر بۆ خۆلادان بێت لەزیانێکی چاوەڕوان کراو، ئەگینا بۆ پترکردنی قازانجی گۆڕانکاری ڕوونادات.

ئەرەستۆ دەڵێت:" **ترس ئازارێکە لە پێشبینی خراپەوە سەرچاوە دەگرێت**".

هۆراس یش دەڵێت:" **ئەوەی لەترسدا بژێت هەرگیز ئازاد نابێت**" .

### ٥- ڕەتکردنەوەی کۆمەڵایەتی:



لە گرنگترین هۆکارەکانی حەزنەکردنی بەڕێوەبەران بە ڕوودانی گۆڕانکاری، ترسە لە بوون بەگاڵتەجاڕ لەپێش چاوی ئەوانی تر، ترسە لە دووچاربوون بە ڕەتکردنەوە و بەدرێوبوون لەپێش چاوی دەستەکەیدا، ئەوجا بەدووی پشتگیری هەمووان‌دا دەگەڕێت بۆ ئەنجام نەدانی گۆڕانکاری.

بڕوای ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانە ئەوەیە کە خەڵکی بڕوایان پێیەتی، گەر دیتی دووکەس پێکەوە قسەدەکەن وەها هەست دەکات بەخراپ باسی ئەم دەکەن و گاڵتەی پێ دەکەن.

ئیمرسۆن دەڵێت:" **ئەو کەسەی دەڵێت ئەمە ئەنجام نادرێت، ئەوا لەناکاو کەسێك قسەکەی پێ دەبڕێت و ئەو ئیشە ئەنجام دەدات**" .

ئامرازێکت لەبیرە کە بەسود بووبێت بۆ پارە ژماردن لە ساڵانی شەست و حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا؟ گەر وەڵامەکەت(NCR ) ە ئەوا تۆ ڕاستگۆیت، بەڵام ئێستاکە پشت پێ بەستراو نییە، دەزانی بۆ؟ چونکە بەکارهێنەرانی ڕەتی بەکارهێنانی دەکەنەوە بەهۆی داهاتنی ئامێری نوێ بۆ ژماردنی پارەی ئەلیکترۆنی، ئێستا کۆمپانیای دیکە هاتونەتە بازاڕی پارەوە و پلەی یەکەمیان لە داهێنانی ئامرازی ژماردندا گرتووە.

لەبواری مایکرۆکۆمپیوتەریشدا پێشتر کۆمپانیایەك دەیتوانی بۆماوەی یەك ساڵ پلەی یەکەم بگرێت بەر لەوەی کۆمپانیایەکی تر بتوانێت پێشی بدات، بەڵام ئێستا چەند ڕۆژێك زیادتر ناخایەنێت و بىرۆکەی بەهێزتر دەخرێتە ڕوو. بێگومان ئێستا هیچ کۆمپانیایەك ناتوانێت بۆماوەیەکی زۆر ببێتە گەورەی بازاڕ، مەگەر بەردەوام لە گۆڕان و نوێکاری پێشکەوتوتردابێت.

IBM زۆر بەناوبانگ بوو، هەمیشە بەرهەمی نوێی هەبوو، گۆڕانی نوێی دادەهێنا و کارمەندانی وەهایان دەگوت کە: IBM کورتکراوەی I Will Be Moving ەوە هاتووە کە مانای من هەمیشە پێش دەکەوم دەدات . کێبڕکێیش لەنێوان کۆمپانیاکانی ئۆتۆمبێل تەواو نابێت، لەنێوان کۆمپانیاکانی ئاوی گازی، ئەم کۆمپانیانە ئێستا زۆر بەهێز و مەزنن و سەرکێشی گەورە ئەنجام دەدەن و بەردەوام لە گۆڕاندان. بێگومان ئەمانیش کەوتونەتە هەڵەوە، بەڵام توانیویانە هەڵەکانیان چاك بکەنەوە و ئامانجەکانیان بەدی بێنن.

سیگمۆند فرۆید دەڵێت:" **کاتێك کەسێك لە هەڵەیەکەوە بۆ هەڵەیەکی تر دەڕوات ئەوکات ڕاستی تەواوی بۆ دیاردەکەوێت" .**

## ١٩- پێنج بنەمای گرنگ لەکاتی ڕودانی گۆڕاندا دەبێت ڕەچاوی بکرێت:

((هەرچییەك مرۆڤ دروستی کردبێت دەتوانێت بیگۆڕێت))

**فریدریك مۆرڤینسۆن**



ئێستایش پێنج بنەمات پێش دەست دەخەم کە پێویستە ڕەچاوی بکەیت و بیگریتەبەر بۆئەوەی بە گۆڕانکاریەکان قایل بیت و بەخێرهاتنی لێبکەیت:

### ١-گۆڕان بکەرە بنەمای سەرەکی ژیانی خۆت و کارمەندانت:

هەوڵبدە بەشێوەی ڕۆژانە و بەردەوام لەبارەی گۆڕانەوە قسەبکەیت، تێبینیەکانت بنێرە بۆ دەستەی کارمەندانت بۆ هاندان لەبۆ داهێنان، هەموو هەفتە یان مانگێك ڕۆژنامەیەکی هەواڵییان بەسەردا دابەش بکە. بەم ڕێگەیە وەها لەکارمەندانت دەکەیت بە گۆڕانکاری قایل بن، فێری چۆنێتی خۆگونجاندنیان دەکەیت لەگەڵ گۆڕانکاریەکاندا.

دواتریش، کاتێك گۆڕانێك ڕوودەدات بە شتێکی ئاسایی دەبینن، بە کردارێکی سروشتی دێتە پێش چاویان، ئەمەش لەوە دوورت دەخاتەوە کە زۆربەی کارمەندانت هەست بە نیگەرانی و ترس بکەن لەو گۆڕانانەی ڕویانداوە.

### ٢-هەستکردن بە ئازادی بە کارمەندانت ببەخشە:

خۆت قەتیس مەکە بە ڕامیارێتی ئاڵۆز و کار و ئەنجامدراوی ماوە درێژەوە، بەڵکو ڕێگە بە کارمەندانت بدە کە چاکسازیی گونجاو ئەنجام بدەن و چی شایەنی گۆڕانە

بیگۆڕن. من بەڕێوەبەرێکی گشتی دەناسم بڕیاری بۆیەکردنی دیوانی ئوتێلەکەی ئەدا تاوەکو پرسی بە پێنج کەسی لەخۆی گەورەتر کرد، پاشی نۆ مانگ بە تەواوەتی ئەو پێنج کەسە ڕامەزاندییان پێدا، بەڵام لەم کاتەدا ڕێژەی قازانجی ئەم ئوتێلە دابەزی بوو بۆ ٧٪ و بەناچاری هەموو ئوتێلەکەیان بۆیەکرد بە ٣ ملیۆن دۆلار، بەڵام بۆ بێبەختی ئەو کاتەی ئەمان سەرقاڵی بۆیەکردن بوون ئوتێلێکی تر هەلەکەی قۆستەوە و بەهۆیەوە ئوتێلەکە بە تەواوەتی داخرا، بۆیە هەموو بڕیاردان و ڕامیارییەکان لای خۆت قەتیس مەکە و نەختێك ڕێگەش بە کارمەندانت بدە کە چی باش بوو ئەوەت بۆ ئەنجام بدەن.

## ٣-جارناجارێك بەپێی شێوازی گونجاو کارمەندانت لەبەشێکەوە بۆئەوی تر بگوازەوە:

کاتێك کەسێك دادەمەزرێنی ڕێژەی قازانجی ساڵی یەکەمی دەگاتە ٦٠٪ و ساڵی دووەمی ٧٠٪ و سێیەم ٨٠٪ – ٨٥٪

پاشی دە ساڵی ئەم ڕێژەیە دادەبەزێت بۆ ٣٠٪ ، ئەمەش هەمان ڕێگەکەی بیتر ی بەسەردا دەچەسپێت کە دەڵێت: مرۆڤ کە گەیشتە ئاستی نەگونجاوی باشتر وەهایە لەبەشێکەوە بۆ بەشێکی تری بگوازیتەوە.

کاتێك کەسێك لێم دەپرسێت: کەی باشترین کاتە کە مرۆڤ شوێنی کارەکەی بگۆڕێت؟

**ئەوا منیش وەڵامەکانم بەم شێوەیە دەبێت:**

- کاتێك وەڵامی هەموو پرسیارەکانت لەلادا دەستەبەربێت و چارەسەری هەموو کێشەکانت بزانی، هیچ کێشەیەك نابینی بۆ هاندانت لەسەر کارکردن.
- ئەوکاتەی ڕەخنەی زۆر لە سیستمی کارەکەت دەگریت.
- ئەوکاتەی هەستت بەتەمبەڵی تەواو دەکەیت کاتێك لەنێو جێگەکەت دێتە دەر حەز ناکەیت بڕۆی بۆسەر کارەکەت.

- ئەوکاتەی پێت باشە هەموو شتێك ئەنجام بدەی بەس ئەم کارە نەبێت، بۆ هەموو جێگەیەك برۆی تەنها بۆ سەر کارەکەت نەبێت.
- ئەوکاتەی لەکاتی خۆ شتنی بەیانیاندا لەگۆرانی چرین دەکەویت و رقت لە رۆیشتنە بۆسەر ئیشەکەت.

گەر هەستت بەم چەشنە هەستانە کرد ئەوا بزانە کاتی گۆڕینی کارەکەت هاتووە، ئەگینا ناچاری و بەناچاری دەیگۆڕیت.

لەهەموو ئەو دامەزراوانەی من بەڕێوەبەری بووم، هەڵدەستام بە گۆڕینی کارمەندان لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر، ئەمەشم کردبووە کارێکی ئاسایی، بۆنمونە: لە ئوتێلدا دەتوانی مەشق بە کارمەندی پێشوازی بکەیت بۆئەوەی ببێتە کارمەندی تەلەفۆن(دووربێژ)، ئەوجا مەشقی کارمەندی دەرەکی، لەهەمان کاتیشدا وەکو ژوور پاقژکاری رابێنە، ئەوکاتەی شارەزایی ئەم هەموبەشانە چنگ دەخات، دەتوانرێت مەشقی کارکردنی لە چێشتخانەدا پێبکرێت... .

ئەم جۆرە جێ گۆڕکێیانە یارمەتی کارمەندانت دەدات بۆ راهاتن لەگەڵ گۆڕانکاریەکاندا. هونەری گۆڕانیان فێردەکەیت.

### ٤- شوێنی شتەکانی دەوروپشتت بگۆڕە:

کات نا کاتێك لۆکەر و دۆلابەکانی دۆسیەکان لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر بگوازەرەوە، شێوازی رێکخستنی ناوماڵەی ژووری نوسینگەکەت بگۆڕە و شێوازێکی تازەی پێ ببەخشە و وەهای لێبکە شێوەی جیاواز وەربگرێت، هەر ساکارترین گۆڕانێك دەتوانێت جیاوازییەکی زۆر دروست بکات.

## 5-شێوازی کۆبونەوەکانت بگۆڕە و شێوازی نوێ بەکاربێنە:

ڕێگە بە کارمەندێکت بدە دەست بە کۆبونەوەکە بکات، یاخود شوێنێکی نوێ بۆ بەستنی کۆبونەوەکانت دیاری بکە..گەر بتوانی بەشێوەی ڕۆژانە گۆڕانکاری ئەنجام بدەیت دەتوانی ڕووبەڕووی گۆڕانی نوێتربیت و خۆگونجاندنیش لەگەڵیدا ئەنجامبدەی.

برناردشۆ دەڵێت: **" پێشکەوتن ڕێگەیەکە لە ڕێگەکانی نەکردەیی لەکاتی نەبوونی گۆڕاندا، ئەوانەی بێ توانان لە گۆڕاندنی ئاوەزیان، ناتوانن هیچ شتێك بگۆڕن"** .

## ٢٠-چۆن وەها لە دەستەی کارمەندانت دەکەیت بە گۆڕانکاری قایلبن؟

((تاکە ڕێگەی گەشە قایل بوونە بە گۆڕان، بۆئەمەش ئەم بنامایە وەربگرە:
( هەنگاوێکی تر بۆ پێشەوە،مرۆڤی سەرکێش مرۆڤی ئازادە) )) .

**پەندی چینی**



١) نەخشەیەکی سەربەخۆ دابڕێژە.

٢) چوارچێوەیەکی کاتی بۆ دانێ.

٣) شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی نەخشەکەت بە ڕوونی و تێگەیشتوویی دیاربخە.

٤) بەشێوەیەکی ئەرێیی ئەم ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەیە ئەنجامبدە.

٥) کاریگەری گۆڕانکاریەکان بەڕوونی لەسەر دامەزراوەکەت دیاربخە.

٦) لەبەرگیراوەیەك لەم وەرنامە و نەخشە ڕێگەیە بە هەموو ئەندامانی دەستەی بەشدارت بدە.

٧) پێشبینی لەمپەرەکان بکە، ئامادەی بەرپەرچدانەوەیان بە.

٨) ئامادەی قایل بوون بە ئەنجامەکان بە، زۆر کەس بە ئەرێییەوە بە ئەنجامەکان قایل دەبن، لەکاتێکدا زۆرێکی تر بە نەرێنییەوە لێی دەڕوانن، تێبینی ڕەفتارەکانیان بکە.

٩) هەوڵبدە خۆیشت لەکاتی دیارکەوتنی ئەنجامەکاندا لە دامەزراوەکەت بیت و دەستی یارمەتی بۆ ئەوانی تر درێژبکەیت و وەهایان هەست بۆ دابین بکەی کە تۆیش هاوبەشە کاریانی.

١٠) بەرپرسیاری ئەنجامەكانبە، جا هەرچۆنێك بێت.

١١) تۆسكە تۆسكە دەست بە بەدواداچوون بكە.

١٢) كشۆك بە و هەوڵی ئەنجامدانی گۆڕانكاری پێویست بدە، بەردەوامبە لەسەر ئەم كارەت تاوەكو دەگەیتە سەركەوتن.

**ڕەنگە ئێستا بزانی كە سەركێشی ئەنجامی باشی بۆتۆ دەبێت..**

لەسەرەتای ژیانی كاركردنمدا قاپ شۆر بووم، ئەوجا بووم بە گارسۆن لەبەشی خزمەتكارانی ژوورەكانی ئوتێلێك، لەم كارەمدا زۆر سەركەوتوو بووم، پارەی باشم دەست دەخست. بەلآم بڕیارمدا ژیان و داهاتووم بگۆڕم، بەوپەڕی توانامەوە كارم كرد تاوەكو توانیم بە ئامانجەكانم بگەم و ببم بە بەڕێوەبەری گشتی ئوتێلێكی پێنج ئەستێرەیی.

كاتێكیش بووم بە پلەدار لە باشترین ئوتێلی كەنەدادا پارە و داهاتم زۆر بوو، بەلآم بڕیارمدا سەركێشی ئەنجام بدەم و هەموو ژیانم بگۆڕم. بۆیە دەستم دایە دامەزراندنی كۆمپانیایەكی تایبەت بەخۆم، یەكەمین كتێبم نوسی بەناوی: (( بەدەم ڕێگەوە هونەری فرۆشتن یادگرتن))، ئەم كتێبە ئێستا بە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی لە كەنەدادا باشترین و بەرزترین ڕێژەی فرۆشی هەیە. گەر سەركێشیم ئەنجام نەدابایە بۆ گۆڕینی ئیشەكەم تاوەكو ئێستایش هەر گارسۆنی ئۆتێلەكان بووم! بۆیە تاوەكو ئێستایش كە ١٦ ساڵە زۆرێك لە هاوڵەكانم هەمان كار ئەنجام دەدەنەوە، گەر بڕوات وەهایە ناتوانی خۆت و دۆخت بگۆڕیت ئەوا ئەم بۆچوونەت بگۆڕە. یانور ڕۆزفلت دەڵێت:" **پێویستە ئەو شتانە ئەنجام بدەی كە بڕوات وەهایە ناتوانی ئەنجامی بدەی**" . هەوڵبدە لەناوچەی ئاسودەیی و ئارامی بەدووربكەویت" چونكە ناوچەی مردووە. لەگەڵ گۆڕاندا خۆت بگونجێنە و فێری بە، هاوڕێی گۆڕانبە، هەوڵی فراوانتركردنی ئاسۆت بدە بۆبەدیهاتنی ئەوەی فێری نەبویتە" بۆئەوەی فێری بیت یاخود بە ئەندێشەتدا هاتووە و بەدی نەهاتووە. كۆنفۆشیۆس دەڵێت:" **چەند ساڵێكم پێ ببەخشە، ئەوكاتەی گەیشتمە پەنجا**

سالّی، ئەوجا کتێبی ڕەبەنەکان کە ناوی (گۆڕانە) دەخوێنمەوە و بەهۆیەوە لە زۆر هەڵەی لەشی ڕزگارم دەبێت" .

## هونەری گۆڕانکاری فێربە ..



# کلیلی چوارەم

## دڵەڕاوکێ و گوشاری کار...

## گرەوەئاستەنگ(تەحەدی)ی مرۆیی سوتەمەنییە بۆ سەرکەوتن



(( هیچ کەس ناتوانێت توڕەیی یان دڵەڕاوکێ لە هەناوتدا چێ بکات، بەڵکو ئەوەخۆتی بەرپرسی بەدیهاتنی ئەمەی" لەڕێگەی کلۆر وێنەکردنی جهانەکەتەوە))

واین و.دایر

## ٢١-هۆکارەکانی پشت دڵەڕاوکێ لەدەستی خۆماندایە!!

((هەموو ئەوەی ئەنجامت داوە هیچ نییە جگە لە ئەنجامی هەموو ئەوەی بیرت لێ کردۆتەوە))

**بودا**



ئێمە بەڕاستی بە درێژایی ژیانمان کاردەکەین لەپێناو ئەوەی هەست بە دڵەڕاوکێ بکەین. ئایا ئەمە سەیرە بەلای تۆوە؟ با نەختێك ڕوونتر قسەبکەم، هەندێك خەڵك دەڵێن: گەر لە ئیشێکی باشتردا کارم کردبایە بەختەوەرتر دەبووم، یاخود گەر ئۆتۆمبێلێکی مۆدێل تازەترم هەبوایە دڵشادتر دەبووم، یاخود گەر خانوو یان پارەی باش و زۆرترم هەبوایە ئەوا ئاسودەتر دەبووم... ئەوجا کاتێك ئەوەی دەیانەوێت بۆیان بەدی دێت، ئەوکات دەگەڕێنەوە خاڵی سەرەتا، داوای زیادتر دەکەن. بۆخۆم کەسێك دەناسم هەموو شتێکی ئەنجامدا بۆئەوەی ئافرەتێك بخوازێت، ئێستایش دەیەوێت خۆی لێی ڕزگاربکات! هاوڕێیەکم هەبوو زۆری حەز بەوەبوو ببێتە خاوەنی منداڵ کەچی ئێستا گازەندەی سێ منداڵەکەی دەکات.

بۆخۆم ویستم ببم بە بەڕێوەبەری گشتی، کاتێك بەم پلەیەم گەیشتم لەخۆمم پرسی: ئایا ئەمە هەموو شتێکە؟ ئایا شتێکی تر نییە ئەنجامی بدەم؟ لەڕاستیدا سروشتی مرۆڤ وەهایە لەگەڵ لەپێش چاوگرتنی ئەوەی کە دڵەڕاوکێ تاڕادەیەکیش بەکەڵکە و گەر سنوری تێپەڕاند کوشندە دەبێت. لەنمونەکانی دڵەڕاوکێی بەکەڵك:

- بەڕێوەبەرێك بەوپەڕی توانایەوە کاردەکات بۆئەوەی ئیشەکەی لەماوەی دیاریکراودا جێبەجێ بکات، بێگومان توشی دڵەڕاوکێ دەبێت و گوشاری کارکردنی لەسەر کۆدەبێت، بەڵام ئەم چەشنە دڵەڕاوکێیە یارمەتی دەدات بۆئەوەی پرۆژەکەی لەکاتی دیاریکراودا تەواوبکات.
- خوێندکارێك بەوپەڕی توانایەوە کاردەکات بۆئەوەی لە تاقیکردنەوەیەکدا بە کۆنمرەی باش دەربچێت، بێگومان شەو درەنگ دەنوێت و ڕۆژیش زوو بەئاگادێتەوە، بۆئەوەی دەربچێت، لەم کاتانەشدا توشی دڵەڕاوکێ دەبێت بۆ بەدیهاتنی ئەوەی بەدویدا دەگەڕێت.
- خانمێك منداڵی دەوێت، لەکاتی سکپڕیدا توشی چەندان جۆر لە گۆڕانی دەروونی و جەستەیی دەبێتەوە، کەئەمەش دڵەڕاوکێی توش دەکات، بەڵام ئەم جۆرە دڵەڕاوکێیە هانی دەدات بۆئەوەی گرنگی بەخۆی بدات و خۆراکی باش بخوات" بۆئەوەی منداڵێکی ساغ و بێ کێشە بهێنێتە دونیاوە.

هەندێك خەڵك، وەرزش گەلێك ئەنجام دەدەن کە توشی دڵەڕاوکێیان دەکات، لەشێوەی: شەڕەبۆکی و زۆرانبازی، یاخود خلیسکانی سەر سەهۆڵ، کەچی چێژی لێ دەبینن و بەهۆیەوە چێژیش لە ژیان دەبینن.

**(( دڵەڕاوکێ بەختەوەری ژیانت تیانابات، بەڵکو بە پێچەوانەوە دڵەڕاوکێ یارمەتیت دەدات بۆ بەدیهاتنی))**

**د.بیترج. هانسۆن**

دڵەڕاوکێ بەپێی جیاوازی ژینگە و پیشەی کەسەکان بە جیاواز کار لە مرۆڤەکان دەکات. هەریەکە لەئێمە لە قۆناغێکی ژیانماندا بوینەتە قوربانی دڵەڕاوکێ، بەڵام کاتێك ئەم دڵەڕاوکێیە دەگاتە مەودای خۆی ئەوا دەبێتەهۆی هەستکردن بە داڕووخان و تورەیی و نیگەرانی و بەرزبوونەوەی گوشاری خوێن و ئازاری سەر و نۆرەی دڵ و نەخۆشیە کوشندەکانی دیکە.

لەساڵی ١٩٧٧ دا دامەزراوەی زانستی نێودەوڵەتی لە هەرێمە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا هەستا بە ئەنجامدانی توێژینەوەیەك و بەهۆیەوە گەیشت بەو ئەنجامەی کە: دڵەڕاوکێ کێشەیەکی سەرەکییە و کارلە ژیانی ڕۆژانەمان دەکات، ڕەنگە ببێتەهۆی دیارکەوتنی خۆبەکەم زانینی دەروونی و جەستەیی و کۆمەڵایەتی، هەروەها زیانی ١٠ ملیۆن دۆلار ساڵانە بە خێزانی نەخۆشەکان دەگەیەنێت کە بەهۆیەوە بێکاردەبن و لە قەرەبووکردنەوەکان بێبەش دەبن و باری مردنی پێش وەختی لێوە بەرهەم دێت.

## ٢٢-کامیان باشترە: زۆرکەم یان زۆر زۆر؟

((ژیان تەنها ئەوە نییە زیندووبیت، بەڵکو ئەوەیشە تەندروستییەکی باشت هەبێت))
**مارشاڵ**



دڵەڕاوکێ بەسودە یان بەزیانە بۆ ئێمە؟ د.بیترج .هانسۆن لە کتێبی (( چێژی دڵەڕاوکێ))دا وای دەبینێت کە: " دڵەڕاوکێی زۆرکەم و زۆر زۆریش زیاناوین"، بەڕێوەبەرێك کە بۆ چەندین کاتژمێری زیادەیش کاردەکات و گوێی بە تەندروستی خۆی نادا، گرنگی بە خێزان و ژیانی تایبەتی خۆی نادا توشی هەمان جۆرە دڵەڕاوکێ دەبێتەوە کەئەو بەڕێوەبەرە توشی دەبێتەوە کە هەمیشتە لەکاردابێت و سەرۆکەکەی هانی نەدات و دەست خۆشی لێناکات و ئەمەیش کاری زۆر قورس و گران دەکات.

دڵەڕاوکێی زیاولەهەد دەبێتەهۆی کەمکردنەوەی بەرهەمی تاك، وەهای لێدەکات چرپیرکردنەوەی نەهێڵێت و متمانەشی بە دەروونی خۆی کەمبکاتەوە، ئەمەش کار لە هەستەکانی دەکات و باری هزریشی تێکدەدات و بەهۆیەوە توشی چەندین نەخۆشی کوشندە دەبێت.

بەڵام دڵەڕاوکێی زۆر کەم، کە لەسایەیدا کەسێك ڕاهاتووە بەدرێژایی ژیانی کاربکات و پاش خانەنشین بوون متمانە و ڕێزلەخۆگرتنی کەم دەبێتەوە و بەهۆیەوە توشی نەخۆشی کوشندەی دەکات، گەر ئەم کەسە لەماوەی دووساڵی خانەنشینیدا توشی

هەندێك گرفت نەبێت بۆئەوەی توشی دڵەڕاوکێی بکات ئەوا توشی نەخۆشیە کوشندەکان دەبێتەوە، بەپێی ڕای د.هانسۆن ە.

گەر دڵەڕاوکێ بەم هێندە مەترسیدارە و ڕەچەتەیەکی ڕاستینە و کەتواری ژیانمانە، کەواتە بۆچیْ خەڵکان نایخەنە جێگەی تێڕوانینیانەوە.

بۆچی خەڵکی ڕەتی ئەوەدەکات بە دڵەڕاوکێدا تێپەڕبووبێت؟ بۆچی بڕوایان وەهایە کە شتێکە و تەنها توشی ئەوانی تر دەبێت و دووچاری خۆیان نابێتەوە؟ ناتوانین دڵەڕاوکێ پتربکەین بەلآم دەتوانین هەڵی بسوڕێنین و فێری چۆنێتی لەناوبردنی شوێنەوارە مەترسیدارەکانی بین. بەڵێ، ئامانجی سەرەکی ئەم بەشی کتێبە ئەوەیە کە فێری چۆنێتی هەڵسوڕاندنی دڵەڕاوکێ بیت و بەهۆیەوە ستراتیژیەتی بەرگری لەخۆکردن دانێی. پێویستە لەسەرەتاوە دڵەڕاوکێ بناسیت و بزانیت کە تۆیش کەوتویتەتە ژێر ئەم بارە قورسەوە.

بۆیە تۆ پێویستت بەوەیە کە ئاوەزی هۆشیارت لەئەمە بەئاگابێت" بۆئەوەی ئاوەزی ناهۆشیارت بتوانێت بۆتۆ لەدژی دڵەڕاوکێ بجەنگێت، ئەمەش بەشێوەیەکی خۆکردە دەبێت، بەم شێوەیەش دەتوانی ژیانی پڕ لەخۆشیت بۆ دەستەبەربێت و مل بە دڵەڕاوکێ نەوی بکەیت" بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکانت و گەیشتن بە سەرکەوتن دەکاری بخەیت.

## ٢٣-هۆكارەكانی دڵەڕاوكێ:

((لەجهاندا دڵەڕاوكێ بوونی نییە، بەڵكو مرۆڤ گەلێك هەن بیرلەشت گەلێك دەكەنەوە ئامازەی نیگەرانی و دڵەڕاوكێن))

**د.واین و .دایر**



ئەو هۆكارانەی هانی تـوش بـوون بـە دڵـەڕاوكێ دەدەن جۆراوجۆرن و دەگۆڕێن بەپێی هەڵوێست و كات و دۆخەكان، ڕەنگە بـەهۆی فاكتـەرێكی ژیـانی تایبـەتی تـۆ و بـاری كـار یـان تەندروسـتی یـاخود دۆخی داراییتەوە لێت سەرهەڵبدات.

لە توێژینەوەیەكدا كەلەسەر ٢٠٠بەڕێوەبـەری ١٢ كۆمپانیـادا ئەنجامـدرابوو، بـۆ د. جـۆن ھ.هـوارد دیاركـەوت كـە: چـوار تایبەتمەنـدی سـەرەكی هـەن كـە هۆكـاری پشـت توشـبوونی بەڕێوەبەرانی جێبەجێ كارین بە دڵەڕاوكێ ، ئەوانیش:

### ١–كەم توانایی:

ڕەنگە بەڕێوەبەرێك هەست بە كەمتوانایی بكات لەبەر ئەوەی كاتێك كێشـەیەكی تـوش دەبێت بۆخۆی دەزانێت چارەی بكات، بەلآم بـەهۆی ناچاری پابەنـدی بـە بەڕێوەبـەرانی سەرووی خۆیەوە ناچارە چاوەڕوانی بڕیاری ئەوان بكات بۆ هـەنگاونان بـەرەو بـەدیهاتنی چاكسـازیی، بۆیـە لـەم كاتـەدا ئـەم بەڕێوەبـەرە توشـی داڕووخـان و هەسـتكردن بـە كەمتوانایی و دواتریش دڵەڕاوكێ دەبێتەوە.

هیرۆدۆت ی فەیلەسوف مەزن دەڵێت: **" تـاڵترین ئـازار لای مـرۆڤ ئەوەیە كـە خـاوەنی زانیارییەكی زۆرە كەچی كەم هێزە"** .

### ٢-گومان و نادڵنیایی:

زۆرجار کێشەی ناسنورداری کار توشمان دەبێتەوە و ئەمەش دەبێتەهۆی ئافراندنی جۆرێك لە گومان، کاتێك بەڕێوەبەرێك ناچاردەبێت بڕیارێك بدات لەسەر کۆمەڵە زانیارییەکی نامتمانەیی یاخود لەسەر بنەمای ڕامیارییەکی ناڕوون ئەوکات دۆخی بەڕێوەبەرەکە گران و قورس دەبێت بۆ دانی بڕیاری دروست و گونجاو، ئەمەش دڵەڕاوکێی توش دەکات.

### ٣-ماندووبوون لەکاردا:

کارێکی ئاسایە کارکردنی بەڕێوەبەر لە هەفتەیەکدا بگاتە ٥٥ بۆ ٦٥ کاتژمێر، زۆرێك لە بەڕێوەبەران تەنها تیشك دەخەنەسەر ئەنجامەکان بە چاوپۆشین لەکاتەکانی کارکردنی، ئەم جۆرە خۆماندوکردنە لەکاردا دەبێتەهۆی دروستکردنی دڵەڕاوکێ، هەروەها هەندێك کێشە و ئاستەنگ لەژیانی خودی بەڕێوەبەرەکەدا دەئافرێنێت.

### ٤-پێداگیری:

د.هوارد دەڵێت:" **بەڕێوەبەر هەر حەوت خولەك جارێك کارێکی نوێ ئەنجام دەدات**"، پرۆژە و ڕاپۆرتە زۆرەکان گوشارێکی زۆر لەسەر بەڕێوەبەرەکە دروست دەکات، ئەمەش وەهای لێدەکات هەست بە دڵەڕاوکێ بکات.

هوارد دەشڵێت:" خراپ بەڕێوەبردن هۆکارێکی سەرەکی توشبونی بەڕێوەبەرە بە دڵەڕاوکێ، گەر سەرۆکەکەی خاوەنی توانا و ژیرییەکی تەواونەبێت بۆ نەخشەدانان، ئەمەش وەها دەکات نەتوانێت بۆچوونێکی دیاریکراوی هەبێت و نەشزانێت بەباشی ڕەفتار ڕەگەڵ ئەوانی تردا بکات" . زێدەباری ئەو چوار هۆکارەی پێشیێ کە د.هوارد خستیەڕوو، بۆخۆم وای دەبینم کە حەوت هۆکاری تریش هەن:

**١-کەم دەستەڵاتی:** کاتێك بەڕێوەبەرێك هەست دەکات بەرپرسیارێتی زۆری لەسەر شانە و لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێت هیچ بڕیارێك بدات بۆ چاکسازیی یاخود بەدیهاتنی گۆڕان، ئەمە لای خۆیەوە وەهای لێدەکات توشی دڵەڕاوکێ بێت.

**٢-پلەبەرزکردنەوە:**

بەڕێوەبەر هەست بە دڵەڕاکێ دەکات گەر دڵنیانەبێت لەپلەبەرزکردنەوە و خەلاتکردنی و دڵنیاش نەبێت لەسەر داهاتووی کارەکەی.

**٣-تەنهایی:**

زۆرێك لە بەڕێوەبەران پێیان باشە هەرچی کێشەیانە تەنها لای خۆیان بێت و بەشداری هاوسەر و برادەرانی ناکات، ئەوەی دەیەوێت ئەوەیە پاشی ڕۆژێك لە کارکردنی قورس بگەڕێتەوە ماڵێ ژەمە خۆراکێکی بەتام هەبێت و بتوانێت نەختێك بحەسێتەوە، بەلام بە پێچەوانەوە توشی چەندین کێشەی ناهەموار دەبێتەوە، وەکو: کێشەکانی منداڵ و خوێندنگە، قیستی مانگانە و بارمتەگیری خانوەکەی و ...هتد .

**٤-ناڕێکخراوەیی:**

کاتێك بەڕێوەبەرێك ناڕێکخراوبێت هەمیشە بەدووی دۆسیەکانیدا وێڵە، ڕاپۆرت و کلیلی ئۆتۆمبێلەکەی نازانێت لەکوێیە، ئەوجا هەموانی دەورووپشتی بە دزی و گەندەڵ تۆمەتباردەکات، ئەمەش وەهای لێدەکات هەست بە دڵەڕاوکێ بکات.

**٥-دیمەن:**

دیمەن و ڕووخساری بەڕێوەبەر کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر هەستکردنی، گەر خووی خۆراکی خراپ بێت و توشی قەڵەوی هاتبێت، ئەوا وەها هەست دەکات کە دیمەنی

ناشیرینە، ناتوانێت دیمەنیشی بگۆڕێت، ئەمەش وەهای لێدەکات هەست بە دڵەڕاوکێ بکات.

### ٦-ئازاری جەستەیی:

بەڕێوەبەرەکە توشی دڵەڕاوکێ دەبێتەوە گەر توشی هەر ئازارێك بێت لەجەستەیدا، لەشێوەی: ئازاری گەدە، یان سەرئێشە، یاخود گەر چاوەڕوانی ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەك بێت، یاخود تەنانەت گەر ئەژنۆی بەر مێزەکەی بکەوێت توشی دڵەڕاوکێ دەبێت.

### ٧-ئازاری دەروونی و سۆزیی:

بەڕێوەبەر هەست بە دڵەڕاوکێ دەکات گەر هەستی بە لەدەستدانی کەسێکی کرد، یاخود توشی ئەزمونی جیابونەوەی هاوسەرگیری ببوو.

### ئێستا تۆ بەهیچ کام لەو دۆخانەدا تێدەپەڕیت؟
### ئایا تۆ هۆکاری پشت دڵەڕاوکێی کارمەندانیت؟

زۆرێك لە بەڕێوەبەرانی جێبەجێکاری دەبنەهۆی دروستکردنی دڵەڕاوکێ بۆ کارمەندانیان" چونکە تەنها تیشك دەخەنە سەر هەڵەکان و گەورەی دەکەنەوە، زۆر بەکەمی پەسنی کارمەندانی ناوازەیان دەدەن.

جۆرێکی تری بەڕێوەبەران ڕەنگە میهرەبان و بەبزەبن، بەڵام کارمەندانی توشی دڵەڕاوکێ دەکات"چونکە تێبینی زۆرە و لەسەر بۆچونێك ناوەستێ و ناشتوانێت بۆخۆی بڕیاری یەکلاکارەوە بدات. بۆیە زۆر وریابە و مەبەرە هۆی دروستکردنی دڵەڕاوکێ بۆ کارمەندانت. هەوڵبدە کێشەکان لەقەبارەی خۆیان گەورەتر مەکە، کاتێك لەگەڵ کەسێکدا قسەدەکەیت هەڵە پێشتریەکانی خۆتت لەیادبێت.

## ٢٤-نيشانەكانى دڵەڕاوكىٚ :

**((گویٚ لە جەستەت بگرە" چونكە هەمووشتێكت پێ دەڵێت" لەبارەی بكوژە بێ دەنگەكانەوە))**

**د.ئیبراهیم فەقی**



ئێستا تۆ هەندێك لەو هۆكارە سەرەكیانەت ناسیوە و زانیوە كە دەبنەهۆی دڵەڕاوكیٚ .

ئێستایش بهێڵە باوەكو پێكەوە ئاشنای نیشانەكانی دڵەڕاوكیٚ بین:

- لەدەستدانی حەزی خۆراك خواردن.
- بەرزبوونەوە و زیاوبوونی لێدانەكانی دڵ .
- زیادەڕەوی كردن لە چێشتخواردن.
- ڕەفتاری دوژمن كارانە.
- ئازاری سەر( سەرئێشە) .
- داڕووخان.
- لەبیركردن.
- گرنگی نەدان بە چالاكی جۆراوجۆر.
- توڕەیی.
- ماندووبوون.
- ئازاری پشت و مل.
- وروژاندن.

ئەم لیستە ڕەنگە درێژە بكێشێت و دیاركەوتەكانی زیادبن، بەڵام دەبێت زۆر بەخێرایی خۆت لەم نیشانانە دەربازبكەیت و سەردانی پزیشكی شارەزای دەروونی بكەیت.

کاتێك هەست بەوە دەکەیت ناتوانی بحەسێیتەوە زۆر بەخێرایی هەڵدەچیت، کاتێك دۆخەکان بەحەزی خۆت نابن و هەست بە ماندووبوون دەکەیت بەکەمترین ئیشکردن، زۆر بەکەمی دەتوانی بەچڕی بیربکەیتەوە و زۆر بەزوویی شتەکان لەبیر دەکەیت، زۆر کاردەکەیت و ئەنجامت باش نییە، نیگەرانی بەگوڕە و جگەرەکێشان و خواردنەوەی مەیشت فرەس.

هەموو ئەمانە ئاماژەن بۆئەوەی تۆ کەوتویتەتە ژێر کاریگەری دڵەڕاوکێوە، پێویستە کارێك بکەیت و خۆتی لێ ڕزگاربکەیت.

## ٢٥-پێکهاتەی بەرگری لەخۆکردن دژی دڵەڕاوکێ:

**((کەسی مەزن دڵنیایە و ئازادە لە دڵەڕاوکێ، لەکاتێکدا مرۆی ئاسۆتەسک هەمیشە گرفتاری دڵەڕاوکێیە))**

**کۆنفۆشیۆس**

ئێستایش هەندێك ڕێگەی زۆر کارات بۆ بەردەست دەخەین لەبۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دڵەڕاوکێ و زاڵبوون بەسەریدا، بۆئەوەیشە بتوانی بۆ ڕاژەی خۆتی دەکاربخەی لەبری ئەوەی بەخراپ ببیتە کۆیلەی باشار وەهایە بیکەت بە داردەستی خۆت.

### ١-پێسپاردن:

کاتێك هەندێك ئیش و کاری ڕۆژانەت بە کارمەندانت دەسپێری، دەتوانی کاتێکی زۆر و هەلی باش برەخسێنی بۆ ئەوەی بە گرنگترەوە ڕەگەڵ دۆخەکاندا بگونجێی.

### 2-ڕێکخستن:

کاتێك سیستمی کاری دەوروبەرت، کات و ئیشە لەپێشییەکانت ڕێك دەخەیت، یارمەتی کارمەندانت دەکەیت بۆ ئەوەی کاروئیشیان ڕێکبخەن، دەتوانی خۆت بەدووربگریت لە کەوتنە داوی زۆر دۆخگەلی وەها کە هانت دەدەن بەرەو دڵەڕاوکێ.

### ٣-کارکردن بە گیانێکی دۆستانەی دەستانەوە:

کاتێك کارکردن بە گیانێکی دەستەیی و هاوبەشییەوە دەبێت بۆ بڕیاردان، ئەمە نەختێك باری سەرشانت سوك دەکات و کەمتر دووچاری دڵەڕاوکێ دەبیتەوە.

### ٤-پێشبینی کردنی ئەو هەڵوێستانەی دەبنە هۆی ئافراندنی دڵەڕاوکێ:

پێشبینی ئەو دۆخ و هەڵوێستانە بکە کە وەهات لێدەکەن دڵەڕاوکێ داربیت، دەبێت پێشتر خۆتت بۆی ئامادەکردبێت، بۆنمونە: ئەنجامدانی کۆبوونەوەی کارگێڕی، کۆبوونەوە لەگەڵ سەرۆکەکەت، یان کارمەندانت.

### ٥-وشیاربە لەقسەکردن لەگەڵ خۆ بە شێوازێکی نەرێنی:

گەر لەخۆتەوە بیستت کە ئەم دەستەواژانە بەخۆت دەڵێیتەوە: ئەمە کارێکی زۆر گرانە، باشە بۆهەموو ئەمانە ڕوو دەدەن؟ باشە سەرۆکەکەم بۆچی وەهام لێ دەکات؟ کارکردن لێرەدا زۆر گرانە، گەر ئەم شتانەت بیست ئەوا بە دەنگی بەرز بەخۆت بڵێ: بوەستە!

ڕووبەڕووی ئەم قسە نەرێنییانەت بوەستەوە و بەم شێوەیە وەڵامی بدەرەوە: من بەدۆخی خراپتر لەمەدا تێپەڕیوم، توانیومە بەسەریدا زاڵبم، من دەتوانم ئەم کارە ئەنجام بدەم" چونکە پێشتر ئەنجامم داوە، دەشتوانم دیسانەوە ئەنجامی بدەمەوە... لەبیرت بێت چی بە ئەندێشەتدابێت بۆئەوەی ئەنجامی بدەیت دەتوانی ئەنجامی بدەیت، بۆیە بە دووی چارەسەردا بگەڕێ و قسە لەگەڵ خۆداکردنەکانت هەڵسوڕێنە، دەتوانی بەسەر دڵەڕاوکێیشتدا زاڵبیت.

### ٦-ئاکامی دڵەڕاوکێ:

**ئەم پرسیارانە ئاراستەی خۆت بکە:**

*خراپترین شت چییە ئەگەری هەبێت لێم ڕوویدات؟

*چیم لێ بەسەر دێت؟

*باشترین چی دەبێت بۆمن ؟



بەخۆت بڵێ: پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ گرنگی بەم دۆخەم دەدەم.

کێشەکەت بنوسەرەوە.. پێنج چارەسەریش بۆهەر کێشەیەکت بدۆزەرەوە.

خۆت بە کێشەیەکەوە سەرقاڵ مەکە کە پاشی مانگێك ڕوودەدات. بەڵکو دڵەڕاوکێکەت بۆ مانگی داهاتوو هەڵبگرە" ڕەنگە لەو کاتەشدا بە بێ کێشە ڕزگاربیت ، بۆیە دیل کارنگی دەڵێت:" **کە ٩٠٪ ی ئەو شتانەی دەبنەهۆی دروستکردنی نیگەرانی و دڵەڕاوکێ ڕوونادەن، بەڵام لە ١٠٪ مەکەش ڕەنگە لە دەرەوەی خوازویستی خۆمانەوە ڕوودات و ئەم ڕێژەیە دەستەڵاتی ئێمەی بەسەردا نەبێت"** .

## ٧-ستراتیژیەتی ئەنجامدراوەکانی ڕۆژانە:

دەتوانی تیانوسێك بهێنیت و لەسەری بنوسیت: (( تیانوسی ئەنجامدراوەکانی ڕۆژانەم))، ئەوجا هەوڵبدە ڕۆژانە بەلای کەمەوە یەك شتی ئەنجامدراوت بنوسیتەوە، بەم شێوەیە فێری ئەوە دەبیت کە چۆن تایبەتمەندییە ئەرێییەکانت بەکاردەهێنی و کاتێك بە دۆخێکی نەخوازراودا تێدەپەڕیت و دونیا بە تاریکی دەبینی تیانوسی ئەنجامدراوانت بێنە و هەناسەیەکی قوڵ هەڵبمژە و بیانخوێنەرەوە، ئەوجا دەبینی نەختێك هەست بە حەسانەوە دەکەیت، کەلە تیانوسەکە دەڕوانی دەبینی کاری زۆرباشت ئەنجام داوە و دەتوانی باشتریش ئەنجام بدەیت، جا دۆخەکان هەرچییەك بن.

## ٨-نمونەی باڵا:

نمونەی کەسایەتی مرۆڤێك وەربگرە کە پێی سەرسامیت، با ئەم کەسە تاڕادەیەکی باش خاوەن زانیاری و دانایی بێت و چارەسەری زۆربەی کێشەکانی لەلادا دەستەبەربێت، ئەم کەسە باوەکو بەجوانی بیناسیت، کاتێك کێشەیەکت تووش دەبێت، وای بێنەپێشەچاوی خۆت کە هەمان کەسیت، بەهەمان ڕێگەی ئەو بیر لەچارەسەری کێشەکانت بکەرەوە.

کۆنفۆشیۆس دەڵێت:" **کاتێك کەسێك لە پێگەیەکی باڵادا دەبینی، وەهابیربکەرەوە کەتۆیش بەوە بگەیت"** .

**٩-شێوازی هەناسەدانی ٤-٢-٨ :**

دانیشە و گرنگی بە هەناسەدانت بدە. دڵنیابە لەوەی هیچ کەسێك بۆماوەی کەمتر لە دە خولەك بێزارت نەکات.

- هەناسەکی قوڵ هەڵمژە" لەڕێگەی لوتەوە باوەکو ٤ چرکە بخایەنێت.
- بۆماوەی ٢ چرکە هەناسەکەت لە هەناوتدا بهێڵەرەوە.
- بە هێمنی تەواوەوە لەماوەی ٨ چرکەدا هەناسەکەت دەربکەرە دەرەوە.
- ئەم مەشقە بەلای کەمەوە ١٠ جار لەسەر یەك ئەنجام بدە.

**١٠-حەسانەوەی هزری بۆماوەی ١٠ خولەك :**

بە ئەندێشەت کاتێك یادی خۆت بخەرەوە کە تۆ لەو کاتەدا لە لوتکەی حەسانەوەدابویتە، لەبیرت بێت لەکوێش بویتە.

بۆنمونە: تۆ لە مۆڵەتێك بوویتە لە باهاما لەسەر لوتکەی چیایەك یاخود باخچەیەك.

- دانیشە و بەئاسودەیی ڕابکشێ.
- مەشقی ٤-٢-٨ ئەنجام بدە.
- چاوانت دابخە.
- بە ئەندێشەت گەشتی ئەو شوێنەبکە کە حەزت لێیەتی،جارێکی تر لەنێو ماوەی مۆڵەتتدا بژی، ئەم جارەیان هیچ خەرج ناکەیت تەنها ئەندێشەت نەبێت.
- بەهەموو هەستەکانتەوە وەهای بێنەپێشەچاوی خۆت کە تۆ لەوێی، ئەوجا تیشك بخەرەسەر شێوازی هەناسەدانت.

## ١١-مەشقى وەرزشى:

بەشى پزيشكى زانكۆى ماساسيۆسچ هەستا بە ئەنجامدانى توێژينەوەيەك لەسەر ٣٠٠٠بەڕێوەبەرى جێبەجێ كار(تەنفيزى) لەبارەى چۆنێتى ڕووبەڕوو بوونەوەى دڵەڕاوكێ، وەڵامى زۆربەيان وەرزش بوو.

ئەنجامەكان بەم شێوەيە بوون:

- ٧٢٪ ڕۆيشتن و پياسەى ئاسايى.
- ٦٤٪ بەكارهێنانى بزوێنەرى جێگير.
- ٦٦٪ڕێكردن و مەلەوانى.
- ٥٧٪بەرزكردنەوەى قورسايى .
- ٢٥٪ تێنس يان ڕاكيت.
- كەمترينيان گوێگرتن بوو لە مۆسيك، ئەنجامدانى تێڕامان بوو.

بۆيە پێويستە بەهەر جۆرێك بێت چالاكى جەستەيى ئەنجام بدەيت، بۆئەمەش ڕەچەتەيەكى ئاسانت بۆ ئامادە دەكەم كە دەبێت بەيانيان پاش ئەوەى بەئاگا دێيتەوە ئەنجامى بدەى:

- بە سيستمى هەناسەدانى وزە هەناسەبدە، هەناسەيەكى قوڵ هەڵبمژە، سييەكانت بە ئۆكسجين پڕبكە، ئەوجا هەواكە وەها دەربكەرە دەرێ وەك ئەوەى مۆمێك وەكوژێنى، ئەمەش ٥ جار لەسەر يەك ئەنجامبدە.
- بۆماوەى ٥ خولەك ڕاكشێ .
- لەو شوێنەدا بۆماوەى ٥ خولەك پياسەبكە.
- هەندێك مەشقى گوشارى ئەنجامبدە" گەر توانيت.

بۆ ئاشنابوونى زيادتر لەبارەى وزەوە دەتوانى بگەڕێيتەوە بۆ كتێبەكەم: (( بەدەم ڕێگەوە هونەرى فرۆشتن يادگرتن)).

## ١٢-گرنگی پێدانی تایبەتی:

زۆر حەزت بە چییە؟ حەزت لە چێشت لێنانە، یان وێنەکێشان، یاو مۆسیك یام خوێندنەوە..هتد، ئەوا ئەنجامدانی ئەم حەزەت یارمەتیت دەدات بۆئەوەی نەختێك چرپیرکردنەوەکانت لەبارەی ئیش کردنەوە بگۆڕێن و نەختێك لە دڵەڕاوکێ بەدووربیت.

گەر هیچ گرنگی پێدانێکی تایبەتیت نەبێت، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بیربکەیتەوە لەحەزێك یان شتێك " بۆئەوەی گرنگی پێبدەی، لەبیرت بێت ئەمە بۆتۆ زۆر بە سوود دەبێت.

بێگومان پێویستت بە ڕاوێژکردنە ڕەگەڵ پزیشکی تایبەتدا" بەر لەوەی هیچ مەشقێکی وەرزشی ئەنجامبدەی.

## 26- سیستمی ((فەقی)) بۆ حەسانەوە:

(( گرنگ نییە تۆ لە کوێوە هاتووی، گرنگ ئەوەیە دەتەوێت بۆ کوێ بڕوی))

لەکاتی کارکردنمدا لە نۆرینگە( عیادە)کەم سیستمێکم دارشتەوە کە هەم بۆ کارئاسانکردن بۆخۆم و هەمیش بۆ چارەکردنی نەخۆشان زۆر بەکەڵك بوو، ئەویش:

### ١-بیرلەکێشەیەك بکەرەوە کە دەتوورِوژێنێ و چاوانت دابخە:

- ژمارەی مۆبایلەکەت بەبیری خۆت بهێنەرەوە، بە دەنگی بەرز بیڵێرەوە.
- جارێکی تر ژمارەی تەلەفۆنەکەت بەدەنگێکی بەرز و بەپێچەوانەی جاری یەکەمەوە بڵێرەوە.
- وشەی کۆنتریاڵ یان هەر شار و وڵات کە تۆ تێیدایت بیری خۆت بخەرەوە.
- بەدەنگی بەرز بیڵێ.
- بەپێچەوانەوەی پیتەکانی بڵێرەوە.

ئایا هێشتاکە بیر لە کێشەکە دەکەیتەوە؟ کەواتە بەباشی مەشقەکەت ئەنجامداوە، وەڵامەکەت دەبێت نەخێر بێت" چونکە ئێمە ناتوانین لەیەك کاتدا بیر لە دووشت بکەینەوە، کاتێك دڵەڕاوکێکانت بۆ چەند ساتێك لەبیردەکەیت، ئەمە هەلێکت دەداتێ بۆئەوەی کەمتر لەو دۆخەدا ڕۆبچیت کە توشی گرفتی کردووی.

### ٢-باڵەکانت بۆپێشی خۆت بهێنە و بەهێزەوە دایبگرە:

بەردەوامبە لەسەر ئەنجامدانی ئەم کارە، جاربەدوای جار هێزی پتری تێدا بەکاربێنە، ئێستایش دەستەکانت دابگرە و بیحەسێنەرەوە، تێبیشنی جیاوازی نێوان گوشار و حەسانەوەبکە.

هـەردوو دەسـتت بخـەرە سـەر کورسـییەك، ئـەوجا بـەهێزەوە بـەرزی بکـەرەوە. بەردەوامبـە لەسـەر ئـەم کـارەت و جـار بـەدوای جـار هێـزی زیـادتری تێـدا بەکاربێنـە. ئێستایش دەستەکانت بحەسێنەرەوە، ئەم مەشقە ٥ جار ئـەنجام بـدە. تێبینـی بکـە کـە چۆن ئـەم مەشـقە یارمـەتیت دەدات بـۆ ڕزگـاربوون لـەوزە نەرێنیـەکانت و حەسانەوە و ئاسودەییت پێ دەبەخشێت.

### ٣-بە شێوازی ٤-٢-٨ هەناسە بدە:

- چاوانت دابخە و بەچڕی تیشك بخەرەسەر هەناسەدانت .
- بە هزرت بگەڕێوە بۆ ئەو ساتەی لـە لوتکـەی حەسـانەوە و ئاسـودەییدا بویتـە، هەوڵبدە چیت لەو ئەزمونەوە دیتـەوە و بیسـتووە و چێشـتوە و بۆنـت کـردووە وهەسـت پێکردووە هەمووی بەیادی خۆت بخەیتەوە.
- کاتێك لەقوڵایی ئەم ئەزمونەی ڕابردوتـدا دەبیـت، پەنجـە گـەورەت بـە پەنجـەی ناوەڕاستی دەستی چەپت بگرە.
- ئەمەش دەبێتە لەنگەرت و کەی پێویستت بـە وەڵام بـوو بـۆتی ئامـادە دەکـات، باوەکو ناوی لانکەی حەسانەوەی لێ بنێین.
- بەشێوازی ٤-٢-٨ هەناسە بدە.
- بەرگی پرسەت داکەنە و مێشکت ئاسودە بکە.

### ٤-ستراتیژیەتی حەسانەوە:

**لـەکاتی هەسـتکردن بـە حەسـانەوە و وەرگرتنـی توانـدنی حەسـانەوە لەڕێگـەی دەستەکانتەوە، تیشك بخەرەسەر ئەمە:**

- بە تەواوەتی هەموو پارچەکانی لەشت ئاشنابە، لە پەنجەی پێیەکانتەوە دەست پێبکە و بەدەنگی بەرز بەخۆت بڵێ: ئەم بەشەی لەشـم بـە تـەواوەتی حەساوەتەوە.

بۆنمونە: پێیەکانم بە تەواوەتی حەساونەتەوە، ئەوجا لەسەر ئەم کارەت بەردەوامبە تاوەکو هەموو لەشت دەحەسێتەوە.

- بڵێ من بە تەواوەتی حەساومەتەوە.

٥-ئێستایش دەتوانی شوێنێك بۆ حەسانەوەت هەڵبژێری، چاوانت بە هێمنی بکەرەوە، دەست لەو شوێنەبدە کە تێی دەحەسێیتەوە، دەبینی کە ئەمە کار لە شێوازی هەناسەدانت دەکات، ئەوجا کار لە حەسانەوەی هەموو لەشت دەکات.

٦-گەر ئەو شوێنەی لێی دەحەسێیتەوە نەبووە هۆی حەسانەوەت، جارێکی تر بگەڕێوە هەنگاوی ژمارە ٣، بەڵام ئەم جارەیان هەوڵبدە چڕبیرکردنەوەت لەهەناوەوە پتر قوڵتربێت وەك لەجاری پێشووتر.

٧-ئەم کردارە بەردەوام ئەنجام بدەرەوە" بۆئەوەی هەمان ئەنجامی ئاسودەکارت چنگ بخات و بەپێی توانات کەڵکی لێ وەربگرە.

٨-ئەم کردارەیە ڕۆژانە ئەنجام بدە تاوەکو دەبێتە شتێکی ئاسایی بەلاتەوە" دەبێتە بەشێك لە سروشتت. ئێستایش تێدەگەیت لەوەی دڵەڕاوکێ چی دەئافرێنێت لە مەترسی و نەهامەتی، هەروەها ئەوەش دەزانیت کەلە ڕێگەی نیشانەی جۆراوجۆرەوە ئاشنای دڵەڕاوکێ دەبیت. هەروەها چۆنێتی هەڵسوڕاندنی و کەڵك لێ بینینی ئاشنا دەبیت و دەزانیت چۆنیش بەسەریدا زاڵدەبیت و دەیقۆزیتەوە" بۆ خزمەتکردنی خۆت.

تەنها ئەوە بەس نییە بزانی ڕەگەڵ دڵەڕاوکێدا چۆن ڕەفتار دەکەیت، بەڵکو دەبێت ئەوەی لەبارەیەوە ئەنجامی دەدەی ئەرێیی بێت.

**هەرئێستا بڕیاربدە کە تێبینی کار و هەڵسوڕێنەری دڵەڕاوکێ بیت.**



# کلیلی پێنجەم

## توانایی و بەهرەکانی پەیوەندی دابەستن...

## ڕێگەیەك بەرەو هێزی خوددی



((جۆری ئەو ژیانەی دەژین پەیوەستە بەو ڕێگەیەی مامەڵەی خۆمانی پێدەکەین و ئەو ڕێگەیەی کە بۆ مامەڵەکردنی ئەوانی تر دەیگرینەبەر))

**د.ئیبراهیم فەقی**

## 27-پەیوەندی دابەستن جگە لە جۆرێك پەیهەست(ئیدراك) هیچی دیکـە نییە:

((پەیهەست ئاوێنەیە و ڕاستی نییە، ئەوەی من لێی دیاردەکەوم ئـەو وێنەیەیـە کـە لـە ئاوەزمدا هەیە و بەرپەرچکراوەتەوە بۆ سەر دیمەنی دەرەوەم))

A Course in Miracle



کاردانەوەت چۆنە کاتێك کەسێك ڕەخنەت دەکـات لـەپێش چـاوی ئـەوانی تـر؟ ئایـا هـەرگیز ڕوویـداوە لەبەرچاوی کەسانی تر ڕەخنە لەیەکێك بگریت و وای دابنێی کەبۆ بەرژەوەندی خۆی قسەدەکەیت کەچی ئەو بەرگری لەخۆی بکات و بەگژتدا بچێتەوە؟

وەلآمدانــەوەت بۆئــەم پرســیارە کاردانــەوەی سروشــتی پەیهەســتت دەبێــت. جارێکیــان لــە بەڕێوەبـەرێکی بازارکـاریم پرسـی لـەبارەی ئـەو شـێوازەی دەیگرێتەبـەر بـۆ ڕووبـەڕوو بوونەوەی هەڵوێستە ئاڵۆزەکان و ڕەفتارکردن ڕەگەڵ ئەو کەسانەی کێشـەی بـۆ دروست دەکەن، وەلآمەکەی بەم شێوەیە بوو:" من هەمیشە خۆمیان لێ بێ ئاگا و گێـل دەکـەم، بۆتۆ بڕوات وەهایە ئەوەندە کاتم هەیە بۆ خەڵکانی تر ڕۆڵی دایەن ببینم؟" .

بۆیە پەیهەستی بەرامبـەر دۆخـەکان وەهـای لێکردبـوو خـۆگێلکردن بەباشـترین ئـامراز دانێت بۆ خۆلادان لەو جۆرە کەسانە، بەلآم ئەمە وەکو ئـەوە وەهایـە کـە میلـی کاتـژمێر بوەستێنی بۆئەوەی کات نەڕوات، یاخود خۆراك نەخۆی بۆ دوورکەوتنەوە لە زێدەکێشی، یان لێنەخوڕینی ئۆتۆمبێل بۆ خـۆدوورگرتن لـە فـەتارەت، لەڕاسـتیدا ئەمانـە کـەتواری و ڕاستینەن و بەخۆگێلکردن کێشە و ناسۆری و ململانێکان چارەسەر نـابن، هـەروەها هـیچ شـتێکیش ناگۆڕێـت، بـەڵکو بـە پێچـەوانەوە هەڵوێسـتەکان خراپتردەکـات" چـونکە

بڕواپاستی(مسداقیەت)ت وەکو بەڕێوەبەر لاواز دەکات، کارمەندانت وەکو بەڕێوەبەر متمانەت پێ ناکەن، ئەمەش لای خۆیەوە کاردەکاتەسەر ئەنجامی کارەکانت.

ڕۆبێرت شۆلر دەڵێت:" **گەر کێشەیەکت توش بوو، ئەوا کێشەکە دەستت لێ هەڵناگرێت بەڵکو هاوڕێ و ئاراستەکارت دەبێت یان بۆ سەرکەوتن یان بۆ شکست**".

تۆ پێویستت بەوەیە هەنگاوی ئەرێیی بنێی بۆئەوەی هەست بە ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە هەڵوێستەکانتدا بکەیت، بۆیە دەبێت ئەو کێشانەت دیاری بکەیت کە کار لە ئەنجامی نواندن و ڕەفتارەکانت وگیانی دەستەکاریانت دەکات، ڕەفتارکردن ڕەگەڵ ئەوانی تر ئەوەنییە زمانی ئەوانی تر بزانی و ئاشنای ئەو وشانەبیت کە دەری دەبڕیت، گرنگ ئەوەیە بزانیت چۆن ئەمە دەڵێی، بێگومان سەرکەوتنت وەکو بەڕێوەبەر تاڕادەیەکی زۆر وەستاوەتە سەر تواناکانت" چونکە ڕەفتارکردن ڕەگەڵ هەرکەسێك لە هەر دۆخێکدا پەیوەستە بە شێوازی ڕەفتارکردنتەوە.

**((هەریەکێك لەئێمە کێبڕکێ دەکات و ڕەگەڵ ئەوانی تردا ڕەفتار دەکات، پرسیار ئەوەیە: چۆن و چی ڕوودەدات لەئەنجامی ئەمەدا؟))**

**فرجینا ساتێر**

وشەکان مانای جیاوازی هەیە بۆ کەسانی جیاواز، بۆنمونە گەر لە ١٠ کەس بپرسیت کە تێگەیشتنیان لەبەرامبەر وشەی **سەرکەوتن** چییە؟ ئەوا دەبینیت هەریەکەیان بۆچونێکی دیاریکراوی جیاوازی هەیە. ڕەنگە سەرکەوتن بە لای کەسێکەوە دابینکردنی خۆشگوزەرانی بێت بۆ خێزانەکەی، بەلای پیاوێکی سەرمایەدارەوە بەدیهاتنی قازانجی باش بێت، بۆ کەسی بفرۆش زیادبوونی فرۆشەکانیەتی لە بازاڕەکان و دۆزینەوەی بازاڕی نوێیە، سەبارەت بە خوێندکاریش دەرچوون لە تاقیکردنەوەکان سەرکەوتنە، بۆ وەرزشوان بەدەستهێنانی ملوانکەی زێڕینە لە یاریە نێودەوڵەتیەکاندا...بەم شێوەیە.

بۆنمونە: ئەو شێوازەی خەڵکان ڕەفتاری پێدەکەن ئەوا دەبێتە هۆی دروستکردنی کاردانەوەی جۆراوجۆر و لەیەك جودا بەرامبەریان.

هەرتاکێك بە پشت بەست بە سیستمی بەهایی و باوەڕەکانی ڕەفتارت ڕەگەڵ دەکات، وەك لە پەڕتوکی (( پەرچوەکان))دا هاتووە:" **تۆ لەگەڵ ئەو شتانەدا کاردانەوەت دەبێت کە پەیتێدەبەیت، ئەو ڕێگەیەش بەهۆیەوە پەیدەبەیت بە شت ودۆخەکان ڕەفتارەکانت دیاری دەکات)).**

جارێکیان لەگەڵ سێ کەسدا لەبەشی فرۆشەکان قسەم دەکرد، نوکتەیەکم بۆ گێڕانەوە، دوانیان پێکەنین و سێیەمیشیان هەستی بە سەرزەنشتکردن دەکرد!

وەك دەبینی شتەکان هەمیشە بەو شێوەیە نابن کە ئێمە پێمان وایە، شتەکە پەیوەستە بە خەڵك و ڕەوتارکردن ڕەگەڵیاندا، بۆیە تۆیش پێویستت بەوەیە کشۆك بیت، لەخەڵکیش تێبگەیت، وەك ئەوەی هەن پێیان قایل بیت. پێویستە لە تێڕوانینی ئەوانی ترەوە لە دۆخەکان بڕوانیت، نەوەك لەڕوانگەی خۆتەوە و بەس" کە لەگەڵ ئاتاجی و بەرژەوەندیەکانتدا گونجاوە. تۆماس ئا.کیمپ دەڵێت:" **تورەمەبە گەر نەتتوانی ئەوانی تر وەها لێبکەی کە دەتەوێت" چونکە تۆیش ناتوانی خۆت بیت و هیواناخوازیت خۆت بیت"** .

هەوڵبدە بە هاوئاستی کەسەکان بیاندوێنی، وەهایان لێبکە هەست بە ڕێزگرتن و قایل بوون بەوەی هەن بکەن، هەرکەسێکیش وەها ڕەفتاری لەگەڵدا بکە وەك ئەوەی تەنها خۆی هەبێت و تاك و ناوازەبێت. بابلیلیۆس سیرس دەڵێت:" **ناتوانی وەها لەهەمان تاکی پێڵاوبکەیت کە بۆ هەردوو پێت بگونجێن"** .

لەم بەشەدا باشترین توانایی و بەهرە و کاراترینیان لە هونەری پەیوەندی دابەستن و ڕەفتارکردن ڕەگەڵ ئەوانی تردا فێردەکرێیت. ئاشنا دەبیت بەوەی کەچۆن ڕەگەڵ ستراتیژیەتی ئەوانی تردا خۆت ڕابێنی و ڕەفتاریان ڕەگەڵ بکەیت، چۆنیش لەگەڵ کەسانی هەمەجۆر و سەرسەختدا دەجوڵێیتەوە، هەروەها فێری ئەوەش دەبیت کە چۆن

ڕەچەتەی ڕەفتاركردنی كۆتا بەكاردەهێنی" بۆ ئافراندن و بەدیهاتنی هۆگری و كەوی بوونی ئەوانی تر .

وەرە باپێكەوە دەست بكەین بە خستنەڕووی بابەتی ڕێگەمان بۆئەوەی بگەین بە باشترین ئاستی پەیوەندی كردن ڕەگەڵ ئەوانی تر.

## ٢٨-نهێنی هۆگربوون:

((پوختەی پەیوەندی دابەستن ڕەگەڵ ئەوانی تردا دروستکردنی جۆرێك لە هۆگرییە ڕەگەڵ ئەوانی تردا))

**فرجینا ساتیر**



هەرگیز لێت ڕوویداوە کە جاری یەکەمبێت و کەسێك ببینی و هەر لەیەکەم چرکەی چاوپێکەوتنتەوە بەخۆتت گوتبێت: ئەم کەسەم خۆش ناوێت؟ ئایا پێچەوانە ڕوویداوە کە تازە چاوت پێی کەوتبێت و دەسودەم وەهات هەست کردبێت تەواو پێوەی پەیوەستی؟

دەتوانی کاتێك یادی خۆت بخەیتەوە کە هەستت بە بوونی هۆگری لەنێوان خۆت و کەسێکی دیکەدا کردبێت؟ ڕەنگە ئەم کەسە هاوڕێیەکت بێت، یان کڕیارێك، تەنانەت تاکێکی خێزاننەکەشت. چیت کردووە بۆ بەدیهاتنی ئەم هۆگرییەی نێوانتان؟

کە هەستت کرد تۆ پەیوەستی بە کەسێکەوە لەو ساتەوەی بینوتە، ئەم کەسە شتێکی کردووە یان گتووە کە تۆ لەبیرت بێت، ئەوەتا کاری لە هەستەکانت کردووە، ڕەنگە لەکەسێك بچێت کە دەیناسیت، یان کەسێکی ترت بیربخاتەوە. ئەم دیارکەوتەیە کاری لە ئاوەزی هەناویت کردووە و هەستەکانی ناوەوەتی جولاندووە، جا بەباش بووبێت یان خراپ بووە و تۆیش پێیەوە پەیوەست بوویتە، بەهۆی ئەوەی هەستت بە هۆگری ڕەگەڵ ئەو کەسەدا کردووە، جا یان ئەوەتا وشەکانت گونجاوبوونە و ئاوازی دەنگت شیاو بووە، ئاماژەکانی ڕووخسار و زمانی جەستەت باشبووە، هەمو ئەمانە جۆرە لەیەك نزیك بوونەوە و هۆگرییەکی لەنێوانتاندا ئافراندووە. تۆ زۆر بەئاسانی دەستت بە هەموو دوگمە ڕاستەکاندا ناوە، گەر هۆگری لەنێوان خۆت و کەسانی تردا ڕووینەدا ئەوا ڕەنگە بەهۆی

ئەوەوە بێت کە تۆ پێشتر بڕیارت لەسەر ئەو کەسە داوە و دەستت بە هەموو دوگمە هەڵەکاندا ناوە، لەناکاو وشەی نەگونجاوت بۆ هاتووە و تۆنی دەنگی و ئاماژەکەلی ڕووخساری نەشیاوت نواندووە.

**((خەڵکی ئەوانەیان خۆش دەوێت کە لە تایبەتمەندیەکانیاندا هاوچەشن و ڕان"**

**مایکل برۆکس**

هۆگری چییە؟ گرنگترین ڕەگەزی ڕەفتارکردنە ڕەگەڵ ئەوانی تردا. هۆگری ئەوەیە کە هەمان ئاواز و تۆنەدەنگی و ئاماژەکەلی ڕووخساری و جوڵەی جەستەیی و تەنانەت شێوازی هەناسەدانی ئەوانی تر ئەنجامبدەی. ڕێك وەکو کەسەکەی تر. بۆئەوەی هۆگری ڕەگەڵ کەسێکدا بەدیبێنی دەبێت ڕۆبچیتە نێو جیهانی تایبەتمەندیەکانی ئەو کەسەوە. دەبێت وەهای هەست لەلادا دروست بکەیت کە تۆ ڕێزی تەواوی دەگریت، وەکو نمونەیەکی ئاوازە لێی دەڕوانی، ئەمەش بۆئەوەیە کە کەشێك لە متمانە و ڕێز لە نێوانتاندا دروست بکەیت.

هیچ مەوئیدێکی سۆزداریت لەبیرە؟ لەبیرتە چۆن هەموو شتێکت ئەنجامداوە بۆئەوەی هۆگرییەك لەنێوان خۆت و کەسی بەرامبەرتدا چێ بکەیت؟ لەبیرتە تۆنی دەنگ و ئاماژەکەلی ڕووخسارت چۆن بوونە؟ ئەمەیە کرۆکی هۆگریی.

کاتێك لە مۆنتریال سەرقاڵی کۆرگێران بووم، ئافرەتێکم بینی لە دیدەنگە(هۆڵ)ی میوانخانەکە ڕەگەڵ منداڵێکدا یاری دەکات، ڕەفتاری وەها دەکرد کە زۆر پێکەنیناوی بوو، دەزانی بۆ؟ چونکە دەیویست هۆگرییەك لەنێوان خۆی و منداڵەکەدا بئافرێنێت و تاکە ڕێگەیش بۆ بەدیهاتنی ئەمە دابەزین بوو بۆ ئاستی جهانی منداڵەکە. دەزانی چی ڕوویدا؟ منداڵەکە دەستی دایە پێکەنین. بەڵێ ئەمەیە هێزی هۆگری و هەرئەمەش ئامانجی پشت نوسینی ئەم بەشە یە.

## (أ) سیستمی خۆنواندن:

### ((لەڕێگەی هەستەکانمانەوە جهانی تایبەتیمان دەنوێنین))

**د.میلتۆن ئاریکنسۆن**

ئێمە وەکو مرۆڤ لەڕێگەی هەر پێنج هەستەکانمانەوە ڕەگەڵ جهانی چواردوبەرماندا پەیوەندی دەبەستین و بەسیستمی خۆنواندن ئاماژەی بۆ دەکەین، ئەمەش پەیهەستەکان دەگۆڕێت بۆ جفرە و ئەوجا هەڵدەستێت بە ڕێکخستن و داکردنی، ئەوجا دەیگەیەنێت بە پاڵێوەرەکانی پەیهەستەکانمان. ئەم سیستمە پێنج شێوە یان سیستم لەخۆ دەگرێت، بینین، بیستن، هەستکردن، بۆنکردن، چێژتن.

لەگەڵ ئەوەی ئەم پێنج سیستمە هەمیشە پێکەوە کاردەکەن، بەلاّم بۆهەر کەسێك یەکێك لەم سیستمانە بالاّیە و ئەوانی تر کەمتر لەسەری کاریگەرن.

ئەوکەسەی گرنگی بە سیستمی بینایی دەدات بەزۆری بە شێوە و وێنەکردن پشت بەستە، ئەوکەسەشی دەبیستێ گرنگی پشتر بە دەنگ و وشەکان دەدات، بەلاّم ئەوەی پشت بەستە بە هەستەکان ئەوا گرنگی بە هەست و سۆزەکان دەدات.

. فەرموو ئەمەش سێ جۆرە تایبەتمەندی خۆنواندن:

### ١-کەسی بینایی:

بەخێرایی و بەدەنگی بەرز قسەدەکات، هەناسەی کورت و خێرا هەڵدەمژێت و پتر دەکەوێتە ژێر کاریگەری دیمەنەکانەوە وەك لە دەنگ و هەستەکان.

### ٢-کەسی بیستۆکەیی:

خاوەنی دەنگێکی خۆشی مۆسیکییە، بەسنگ فراوانی و ئاسودەییەوە هەناسەدەدات، حەزی لە گوێگرتنە لە دەنگەکان و پتر دەنگی بەلاوە کاریگەرە وەك لە دیمەن و هەستەکان.

### ٣-كەسی هەستی:

هێورە و دەنگێكی كزی هەیە، بە لەسەرخۆیی لەناوچەی سكەوە هەناسەدەدات، هەستكردنەكانی بەر لە وشە و دیمەنەكانە.

## (ب)چاو و ئاماژە ناوازەكانی :

**((چاوانت جگە لە كاردانەوەی بیرۆكەكانت هیچی دیكە نین))**

**د.ئیبراهیم فەقی**



تۆ هەمیشە چاوانت بەكاردێنی، بەتایبەت بۆ چنگ خستنی زانیاری، ئەزموونێكت بیری خۆت بێنەرەوە، یان بیرۆكەیەك كە بیرت دێتەوە یاخود وەلامدانەوەت بۆ پرسیارێك.

جوڵەكانی چاو زۆر بەسودە بۆ دیاریكردنی ئەوەی چی لە هزری هەر مرۆڤێكدا لەوساتەدا دەگوزەرێت.

ئەوكاتەی دەتوانی زانیای نا دەربڕاو كۆبكەیتەوە یاخود بۆ ئاستی ستراتیژیەتی كەسێكی تر دابەزیت، ئەوا تۆ دەتوانی بەهەمان ئاست ڕەفتاری ڕەگەڵدا بكەیت و بەمەش هۆگرییەكتان لەنێواندا دروست دەبێت.

### ١-شێوازی بینایی:

**پونیات نانی شارەزایی و ئەزمونی بینایی:** كاتێك چاو بەرەو سەرەوەی لای ڕاست ئاراستە دەكرێت، لەم كاتەدا كەسەكە وێنە گەلێك دادەكات كە پێشتر لەیادگەیدا داینەكردووە.

**شارەزایی و ئەزمونە بیرۆبۆزەییەکان یاددەخاتەوە:** ئەوکاتەی چاو بۆ لای سەرەوەی لای چەپ بێت کەسەکە ئەزمونێکی یاد دەکەوێتە کەپێیدا تێپەڕیوە.

**٢-شێوازی بیستۆکەیی:**

**پونیات نانی ئەزمونی بیستۆکەیی:** چاو بەئاراستەیەکی ڕێك بۆلای ڕاست دەبێت، لەم کاتەدا کەسەکە ئەزمون و شارەزایی گەلێك چێ دەکات کە پێشتر لەیادگەیدا نەبووە.

**یادخستنەوەی ئەزمونە بیستۆکەییەکان:** هەروەها ئاراستەی چاو بەڕێکی بۆلای چەپ دەنگ گەلێکی یاد دەکەوێتەوە کە لەیادگەیدا داکراوە.

**ژمارەی بیستۆکەیی:** چاو بۆ خواری لای چەپ دەبێت و لەم کاتەدا کەسەکە هەڵدەستێت بە شیکردنەوەی زانیاریەکان یاخود ڕەگەڵ خۆیدا قسەدەکات.

**٣-شێوازی هەستۆکەیی:**

**هەستی:** چاو بۆ خوارەوەی لای ڕاست دەبێت و لەم کاتەدا کەسەکە زانیاری وەردەگرێت. زانیاری بە هەموو هەستەکانی و بە چێژتن و لوتیشەوە وەردەگرێت .

**(ج)زاراوەکان :**

**(( هەوڵی پاراستنی هەموو دێڕەکانی نێوانمان دەدەم، ئەوجا ئەم دێڕ و ڕستانە لە کۆگای یادگەی وێژەمدا دەپارێزم" چون لەداهاتوومدا سودی زۆری دەبێت))**

**ئەنتۆن بۆلۆفیچ چیکۆف**

زاراوەکان ئەو وشە و دێڕانەن کەلەڕێگەی سیستەمەکانی نواندنەوە بەدووبارەیی بەکاردەبرێت، ئەمانە ئەو وشانەن کە خەڵکی بێهۆشانە بەکاری دێنن، بۆیە بە گوێگرتن و ڕوانین لەوەی کەسەکە دەیڵێت دەتوانی بزانی ئەم کەسە چی جۆرە زاراوەگەلێکی

تایبەتی بەكاردەهێنێت و ئەوجا دەتوانی جۆرێك لە هۆگری تەواو ڕەگەڵ ئەم كەسەدا بئافرێنی.

**ئەمەش هەندێك نمونەی زاراوەی بەكاربراوە..**

| بینایی | بیستۆكەیی | هەستی | چێژی | بۆنی |
|---|---|---|---|---|
| بڕوانە | گوێبگرە | هەست دەكەم | قوت دەدات | بۆن دەكات |
| دیاردەكەوێت | ببیستە | بەركەوتن | دەچێژێت | بۆن |
| ڕوونە | قسەبكە | دەست لێدان | دەخوات | بۆنی دوكەڵ |
| بڕوانە | هاواركردن | سارد | دەلێسێتەوە | بۆنڕێژ |
| وێنە | گریان | گوشار | هەرس دەكات | پاقژ |
| بینین | ژاوەژاو | بحەسێرەوە | تەڕە | هەڵدەمژێت |
| هەوڵبدە ببینە | بڵێ | ئازارلووییە | لیك دەردەدات | بۆگەن |
| سەیربكە | ئاواز | دڵەڕاوكێ | گاز دەگرێت | گوڵاو |
| وای دابنێ | دەنگی بەرز | بگرە | شیرین | موخوڕ |
| ڕەنگ | دەنگ | هەستەكان | تفت | بۆنی خۆش |

ئەمەش كۆمەڵێك نمونەیە بۆ پتر ڕوونكردنەوە و باشتر تێگەیشتن:

## ١-بینایی:

- بەڕوونی دەبینم .
- دەتوانی بۆچونم ببینی؟
- بیرۆكەكەت بۆمن ڕوون نییە.
- بهێڵە باڵەم شتە بڕوانم.
- من ئەمە بە شێوەیەكی جیاواز دەبینم.

**2-بیستۆکەیی:**

- ئەم قسەیە باوە.
- گوێت لێبوو ئێستا چیم گوت..؟
- گوێبگرە بیرۆکەیەکی مەزنم هەیە.
- گوێم لێ نەبوو، چیت گوت؟

**٣-هەستی:**

- ئەوەی ئێستا گوتت بەڕاستی جولاندمی.
- من مرۆڤێکی هەستیارم.
- واهەست دەکەم دۆخم زۆر باشە.
- کاتێك هەست بەباشی دەکەم دەست بە جێبەجێکردن دەکەم.

**٤-چێژی:**

- بیرۆکەکەت چێژێکی تایبەتی کاری پێ بەخشیم(واتە هانی دام).
- بهێڵە با ئەم ساتە بچێژم.
- تامی ئەم وشانەت ناخۆش دیارن.

**٥-بۆنی:**

- بۆنی ئەم دۆخە ئاسودەبەخش نییە..
- ئەمە بۆنی ماسی لێ دێت، واتە گوماناوییە.

کاتێك ئاشنای سیستمی خۆنواندنی کەسێك دەبیت تێبینی دەکەیت کە هۆگری ڕەگەڵ ئەم کەسەدا بەخێراییەکی تەواو چێ دەکەیت، بەجۆرێك دەتوانیت ڕەگەڵ زاراوە و جیهانی تایبەتی ئەو کەسەدا خۆت بگونجێنی، بێڵە باوەکو نمونەیەکت پێ ببەخشم، بۆئەوەی باشتر تێی بگەیت:

نمونە:

**ئەو:** گوێم لێ بگرە . **تۆ:**من گوێت لێدەگرم.

**ئەو:**دەزانی مەبەستم چییە؟ **تۆ:** بەڵێ، بێگومان دەزانم مەبەستت چییە.

**ئەو:**دەتوانی گریمانەی ئەمە بكەی؟ **تۆ:**بەڵێ دەتوانم گریمانەی بكەم.

**ئەو:**ئەوەی گوتت هەستەكانی جوڵاندم. **تۆ:** دەزانم، منیش هەمان هەستم هەیە.

ئێستا لە بیرۆكەكە تێگەیشتی ؟ دەبێت تێبینی زاراوە بەكارهێنراوە تایبەتییەكانی كەسی بەرامبەرت بكەیت، هەوڵبدە ڕەگەڵیدا هاوتابیت، ئەوەی هەیە ئەوەیە كە بەچڕی گرنگی بە شتەكان بدەی، كاتێك بە دوورژنەوت قسان دەكەیت باش گوێبگرە و بدوێ، كەلە وێنەدەنگ گوێزەرەوە(تەلەفزیۆن) دەڕوانی بە جوانی و دیقەتەوە بڕوانی. هەوڵبدە لە سیستمی خۆنواندنی بەرامبەرت تێبگەیت و ئەوجا لەگەڵیدا خۆت بگونجێنی. لەسەر ئەنجامدانی ئەم مەشقە بەردەوامبە و بیكەرە ئامرازێك بۆ چێژبینینت. بەمەش دەتوانی بكەویتە سەر ڕێگەی دروستكردن و ئافراندنی هۆگری قوڵ ڕەگەڵ خەڵكاندا.

## (د) مشتومڕی ڕێككەوتن، سەركردایەتی:

((هاوڕێكان لەهەموو شتێكدا بەشدارن))

**ئەفلاتون**



### ١-مشتومڕ:

كــرداری چاكســازیی و گونجانــدنی خــودت و ڕەفتــاری دەرەوەتــە لەگــەڵ كەســێكی تــردا. كردارەیەكی سازاندنی بەردەوامە لەپێناو ئافراندنی هۆگری لەگەڵ خەڵك و پاراستنی.

## 2-ڕێککەوتن:

کردارەی ئەنجامدانی ڕێککەوتن بەزمانێکی درکێنەر و نادرکێنەر ڕەگەڵ کەسی تردا ئەنجامبدە" بۆئەوەی بتوانی جۆری هۆگری کەسەکە لەسەر ئاستی هۆشیاری و ناهۆشیاری بدۆزیتەوە و ئاشنابیت.

## ٣-سەرکردایەتی:

کاتێك هەستکردن بە هۆگری لەسەر ئاستگەلی هۆشیاری و ناهۆشیاری دێتەبوون دەتوانی مەودای کاریگەری ئەم هۆگرییە تاقیبکەیتەوە بەوەی جۆرێك لە گۆڕان لە ڕەفتارتدا بەدی بهێنیت، تێبینی کەسەکانیش بکە گەر لاسایی تۆیان کردەوە و ڕەفتارەکانت کاردانەوەی لەسەر دورست کردبوون، بەومانای لەگەڵ تۆدا سازاون.

**نمونە:**

گەر دانیشتوویت و لاقەکانت لەسەر یەك داناوە، دۆخەکەت بگۆڕە و پێیەکانت بۆ زەوی درێژبکە. گەر کەسەکەی تریش هەمان کاری تۆی ئەنجامدا ئەوا هۆگری نێوانتان بالأیە، هەروەها جۆرێکی نایاب بە هۆگری لەنێوانتاندا دروست بووە و لەم کاتەدا تۆ دەتوانی ئاراستەی ئەم کەسەبکەیت بۆکوێ بتەوێت و ئەوجا هەنگاوی پێ بنێی بەرەو بەدیهاتنی ئەنجام .

## نەخشەی ڕێککەوتن و گونجان

**(١)گونجاندنی ڕاستەوخۆی نادرکێندراو:**



١) هەموولەش: دۆخی لەشت ڕێك بەهەمان شێوەی کەسەکەی تر لێبکە.

٢) نیوەی لەش: خۆت ڕێکبخە بۆئەوەی نیوەی خوار یان سەرەوەت لە کەسەکەی تر بچێت.

٣) گۆشەی سەر/شان: سەر و شانەکانت ڕێك

بەهەمان شێوەی کەسەکەی تر بجولێنە.

٤) ئاماژەکانی ڕووخسار: تێبینی ئاماژەکانی ڕووخسارت بکە و لە برۆ و لێوەکانتدا تەواو لاسایی بکەرەوە.

٥) ئاماژەکان: هەوڵبدە ئاماژەکانی ڕەفتارت هاوشێوەی کەسەکەی تربێت" بە ڕێزەوە.

٦) هەناسەدان: بۆئەوەی هاوشێوەی سیستمی کەسەکەی تربیت ئەوا بەهەمان شێوەی ئەو هەناسەبدە، جوڵە بە سنگ و شانەکانت بکە.

٧) دەنگ/ئاواز/خێرایی قسەکردن: هەوڵبدە لەگەڵ شێوازی دەنگی/ئاوازی/کەسەکەدا خۆت بگونجێنی.

٨) هەندێك بەشی لەش: هەوڵی لاسایی کردنەوەی هەندێك جوڵەی دووبارەیی کەسی بەرامبەر بدە.

**(٢)گونجاندنی نادرکێندرلو و ناڕاستەوخۆ:**

هەوڵبدە ڕەفتارت گونجاوبێت لەگەڵ ڕەفتاری کەسەکەی تر. بۆنمونە گەر چاوانی دەپرتێنێت تۆیش بەهێمنی سەرێکی بۆ بجولێنە، گەر لاقەکانی خستبوە سەر یەکتر، تۆیش دەتوانی دەستەکانت بنوشتێنیتەوە.

**(٣)ڕێککەوتنی زارەکی-درکێندراو:**

أ-سیستمی نواندن: هەمان شێوازی زاراوەی کەسی بەرامبەر بەکاربێنە.

ب-دەستەواژەی دووبارە: تێبینی پێکهاتەی دەستەواژەکانی بکە و بیکەرە بۆتەیەك بۆ قسەکانت .

**زاراوەی تایبەتمەند:**

**بۆنمونە:**

ئایا دەبینی؟ ئایا دەزانی؟ - تاقی بکەرەوە، ئەمە زۆر گونجاوە.. هتد.

**٢-بیرۆکە و پێشنیار:**

بیرۆکەی سەرەکی لە قسەکردنیدا بزانە و لە تاوتوێکردنی خۆتدا لەکاتی قسە لەگەڵ کردنیدا بەکاری بێنە.




لەمڕۆوە دەستت پێبکە و تێبینی هەموو شتێك بکە لەکاتی ڕەفتارکردنت ڕەگەڵ ئەوانی تردا. سیستمی خۆنواندیان و جۆری ئەو زاراوانەی زۆری بەکاردێنن بزانە و تێبینی جوڵەکانی چاویشیان بکە" بۆ ناسینەوەی ئەوەی کە چۆن ڕەگەڵ زانیاریەکاندا ڕەفتاردەکەن و سازانیان لەگەڵیدا چۆنە.

بەردەوامبە لەسەر تێبینی کردنی ڕەفتاریان، (لەگەڵیدا بسازێ) بکەرەوە، لێرەدا پەندێکی بەناوبانگ هەیە کە دەڵێت:**"مەل بەشێوەی خۆی دەکەوێت"** .

كاتێك لاسایی ڕەفتاری كەسێكی دیكە دەكەیتەوە ئەوا تۆ لە جیهانی تایبەتی ئەودا پێی دەگەیت و هەست بەبوونی دەكەیت بەجۆرێك وەهایە كە تۆ لەئاوێنەیەك بڕوانی و ئەو ببینی، هەوڵبدە لەكاتی چاوپێكەوتن و ڕەفتارەكانی ڕۆژانەتدا ئەم لاسایی كردنەوەیە بكەیتە كردار، ئەوجا بۆخۆت ڕادەمێنی لەو توانایی و هونەر و بەهرەییەت كە لەكاتی ڕەفتاركردن دەگەڵ ئەوانی تردا بەكاری دەخەیت.

مایكل برۆكسی نوسەری پەڕتوكی:" هۆگری ڕاستەوخۆ" دەڵێت: (( **هۆگری بە پێچەوانەی مەزنترین یاسای فیزیاوە كاردەكات ئەویش ئەوەیە كە: لەبری ئەوەی دوو دژ یەكتر كێشبكەن كەچی لە هۆگریدا دووجەمسەر یەكتر كێش دەكەن**)).

## تێبینییەكی گرنگ

سازاند و ڕێككەوتن مانای لاسایی نادات..

لاسایی= گاڵتەكردن بەوانی تر و بەسوك پیشاندانیان.

سازاندن=ئافراندنی هۆگری لە نێوانتاندا.

## ٢٩-کەسانی کارگران دەوروبەرتیان تەنیوە:

((خودا پاقژی پێ بەخشیوین بۆ ئەوەی ئەو شتانە وەربگرین کە ناتوانین بیانگۆڕین، ئازایەتیش بۆئەوەی ئەو شتانە بگۆڕین کە دەتوانین بیانگۆڕین، دانایییش بۆ ئەوەی جیاوازی لەنێوان ئەو دووشتەدا بکەین)).

**فرجینا ساتیر**



هەمیشە حەزم لە خستنەڕووی ئەم پرسیارەیە" لەو کۆڕانەی دەیگێرم: کەسێك دەناسیت بەلاتەوە کارگران بێت؟ وەلآمەکە هەمیشە بەڵێ دەبێت.

جارێکیان کابرایەك هەستایەسەرپێ و گوتی: ئەم پرسیارە چییە؟ من نەك تەنها یەك کەسی کارگران دەناسم بەڵکو بڕوام وەهایە هەموو خەڵك کارگرانن!!

ئایادەزانی هەموو دامەزراوە و کۆمپانیایەك خاوەنی یەك کەسی کارگرانە، ئەم کەسانە وەها خۆیان پیشان دەدەن هەمووشتێك دەزانن، هەمیشە سکالآکارن، کێشە دروستکارن، سەرزەنەشتکار و لە بۆسەدان.

لەم بەشەدا ئەم کەسایەتیانەت بۆ ڕوون دەکەمەوە، بۆئەوەی کاتێك توشیان دەبیت دووچاری شێتی نەبیت و بەئاسایی لێیان ئاشنا و ڕزگاربیت.

**کەواتە باوەکو ئێستایش بیان ناسین..**

## ٣٠-چۆن لەگەڵ نۆ تەرزەکەی کەسانی کارگراندا ڕەفتاردەکەیت؟

((ڕەفتارکردن گۆڕینەوەی ماناکانە، دان و ستەندنە لەنێوان دووکەسدا))

**فرجینا ساتێر**

### دەستەی دوژمنگێر:



#### ١-شۆڕشچی:

کەسێکی چەقەچناوەی جنێودەرە و لێزانە لە بەکارهێنانی هونەری گەمە و فێڵکردن. زۆرجار دەنگی بەرزدەکاتەوە، هاواردەکات و هەڕەشەئەنجام دەدات و دەکێشێت بە مێز و کورسیەکانی دەوروپشتی دا و زۆرجاریش لەناکاو پەلامارت دەدات لێت دەدات.

#### ٢-تەقینەوەیی:

زۆر بەگومان و هەڕەشەکارە، ناتوانرێت بەسەریدا زاڵبیت، سەرباری ئەوەی هەستی ناسکە کەچی زۆر دەقیرێنێ و هاواردەکات، زۆر هەستیارە، گەر ئیش و تواندنەکانی توشی ڕەخنەهاتن ئەوا بە ڕەخنەی کەسێتی و تایبەتی دەیگرێت.

### چۆن لەگەڵ کەسانی شۆڕشچی و تەقینەوەییدا ڕەفتار دەکەیت؟

کاتی تەواوی بدەرێ بۆئەوەی هێمن بێتەوە، هەوڵبدە بەشێوازی ئەرێیی وەڵامی کاردانەوە نەرێنیەکانی بدەیتەوە، بۆنمونە: بەناوی خۆیانەوە بانگیان بکە، بیرۆکەکانیان

بیچڕێنە بەوەی قەڵەمێك لەدەست دەکەوێتە سەر زەوییەکە. دیق بەچاوت لەناوچاوی بڕوانە و مەهێڵە تورەمەی ترست تێدا دیاربکەوێت. داوایان لێبکە دانیشن، گەر ڕەتیان کردەوە ئەوا بۆماوەی ٣٠ چرکە تۆ بەپێوە بوەستە و دواتر داوای لێبکەرەوە دانیشێت، بە ڕاستی بۆچوونەکەت بخەرە ڕوو و دەمەقاڵەی لەگەڵدا ئەنجام مەدە. گرنگی پێدانی خۆتیان بۆ دیاربخە و هاوبەشی بۆچونیان بۆ دووپات بکەرەوە. باسی چارەسەرکردنی کێشەکانیان لەگەڵدا گەلاڵە بکە بەبێ تێکدان و ئاڵۆزاندنی ڕەوشەکە.

### ٣-دانەپاڵکار:

ئەم جۆرە کەسانە هەمیشە لەدۆخی بەرگریکردندان و بڕوایان وەهایە هەموان هەڵەن و ئەنجامی خراپی شتەکان دەدەنە پاڵ هەموانی تر، ئەم کەسانە زوو تورەدەبن و هەوڵی تۆڵەسەندنەوە دەدەن و دەیانەوێت بەهەرجۆرێك بێت ماف و یەقی خۆیان وەربگرنەوە.

### ٤-گازندەچی:

بلیمەتە لەدۆزینەوەی هەڵەی هەمووشتێك( کارگێڕی، دەوڵەت، ڕێکخراو،کەش..هتد)، گرنگی بە دۆزینەوەی چارەکانیش نادات و زۆرکات ئەم وشانە بەکاردەهێنێت: هەمیشە، بەردەوام، هەرگیز، گشت، ئەوان.

### ٥-نەرێنی:

ئەم جۆرە مرۆڤە خاوەنی تایبەتمەندییەکی نەرێنی و زۆر خەماوییە، کارلێك لەگەڵ ئەرێ یاخود هەر بیرۆکە و گۆڕانێکی نوێدا ناکات. هەمیشە هەڵە لەشتەکان دەدۆزنەوە و دەڵێن: ئەمە سودی نییە و پێشتر تاقیمان کردۆتەوە، یاخود: واز لەم کارە بێنە، دەستی لێ هەڵبگرە، ئەمەش دەبێتەهۆی ئافراندنی ئەنجامی نەرێنی و زیاناوی.

## چۆن ڕەگەڵ ئەم كەسانەدا ڕەفتاردەكەيت؟

بەباشى گوێيان بۆ بگرە، بۆچوونيان وەربگرە و پێيان قايل بە، بەلأم لەگەڵيان مەسازێ" چون گەر بسازێى ئەوا بەڵگەى ڕاستێتى قسە و ڕەفتارەكانى بۆ دووپات دەكەيتەوە و ئەمەيش لاى خۆيەوە دۆخى نەرێنى ئەوكەسە خراپتر دەكات.

تووڕەى مەكە و سەرمەخەرەسەرى و داواى لێبوردنيشى لێ مەكە. ڕەفتارە نەرێنيەكانى بچڕێنە بە ئەنجامدانى ڕەفتارگەلێك كە كردنى ئاسان نييە. بۆنمونە بپرسە: دەبێت چى بكەيت؟ چۆن ئەم كێشەيە چارە دەكەيت؟ تۆ چارەسەرى ئامادەى بۆ بەردەست مەخە، بەڵكو دڵنيابە لەوەى كە ئەم كەسە بەتەواوەتى لەدۆخەكە بەئاگايە و هەمووشتێك وەردەگرێت.

كەى دڵنيابويتەوە كە ئامادەيە بۆ هەنگاونان بۆ بەديهاتنى چارەسەر ئەوا دەتوانى تۆيش يارمەتى بدەيت و ڕێنمايى ئەنجامدانى هەنگاوە چارەسەرييەكەى بكەيت.

## دەستەى دەم كوت/بێدەنگى داپڵۆسێنەر:

### ٦-زۆر ناسكۆڵە:



كەسێكى ناسك و ميهرەبانە، حەزى لە گەمە و سوحبەتە، دەيەوێت خۆشەويستى و قايلمەندى هەمووان چنگ بخات و هەمووان پێى قايل بن، هەرچييەك دەڵێى ڕەگەڵتدا هاوقسەيە" چون دەترسێت هاوڕێيەتيت لەگەڵيدا بپچڕێت يان بەهۆيەوە تووڕەبێت، ئەم كەسانە هەستەكانى خۆيان دەشارنەوە و هەميشە داواى لێبوردن لەسەر زمانيانە، تەنانەت لەو كاتانەشى كە پێويستى بە داواى لێبوردن نييە، بۆنمونە: كەش لەدەرەوە زۆر خۆشە، دەڵێت: داواى لێبوردنت لێدەكەم.

## چۆن لەگەڵ کەسی زۆر ناسکدا ڕەفتاردەکەیت؟

هەوڵبدە وەهای لێبکەیت بەشێوەیەك هەستبکات کە تۆ خۆشت دەوێت بەچاوپۆشین لەهەرچییەك ڕوویداوە و ڕاستگۆبە لە پیاهەڵدانت بۆئەو، هانی بدە بۆ دیارخستنی بۆچوونی ڕاستەقینەی و کاتێك ئیشێکی باش ئەنجام دەدات هەمیشە پیرۆزبایی لێبکە و پرسیاری سنورداریشی ئاراستەبکە و ئیشەکانی وەکو ئەندامێکی دەستەی کارت پەسنبدە.

## ٧-بکوژی بێدەنگ:

ڕەنگە هەست بە بەهای خۆی نەکات و ڕێزی خۆی نەگرێت و خۆی بە خاوەنی بۆچوونی تایبەتی نەزانێت و دەترسێت لەکێشەوە تێوەبگلێت، بۆیە دەڵێت:" تۆ ڕاست دەکەیت. من هەڵەم"، هیچ کات لەبارەی بۆچوونی خۆیەوە قسە ناکات تەنانەت کاتێك تۆ داوای بۆچوونی تایبەتی ئەوی لێدەکەیت شتێکی وەهات پێنادات لێی بگەیت.

## چۆن لەگەڵ بکوژی بێدەنگدا ڕەفتار دەکەیت؟

وەهای لێبکە هەست بەوەبکات کە هەرچییەکیش ڕووبدات تۆ لەگەڵیدا بە نەرێنی ڕەفتارناکەیت، هانی بدە بۆ قسەکردن، پرسیاری ئازاد و گەرم و گوڕی وەهای ئاراستە بکە کە کۆتاییەکەی کراوەبێت، کە قسەت بۆ دەکات بەجوانی گوێی لێبگرە و مەیپچڕێنە و گەر وەڵامی نەدایەوە دیسانەوە پرسیاری لێبکەرەوە.

ئەوجا بێدەنگبە بۆئەوەی هەل و کاتی هەبێت لەبۆ وەڵامدانەوەت، ئەوجا پێیدا هەڵبدە وقسەکانی بەجوان بخەرە ڕوو، گرنگی پێبدە.

## ٨-خوێندەوار:

کەسێکی ڕۆشنبیر و بەهێز و چالاك و کارامەیە، وادەزانێت هەمووشت دەزانێت و بۆچوونەکانی باشترینن و پێشنیار بۆ ئەوانی تر دەکات، لەکاتێکدا ئەمانە تەنها قسەی لابەلان. بۆیە ناتوانێت بە بۆچوونی ئەوانی تر قایل بێت و گەر قسەت لەگەڵدا کرد و بۆچوونەکانیت ڕەت کردەوە، ئەوکات ئەم شکستەی دەخاتە ئەستۆی کەسانی تر.

## چۆن لەگەڵ كەسى خوێندەواردا ڕەفتار دەكەیت؟

خۆتی پێدامەكێشە گەر بە تەواوەتی خۆت بۆی ئامادی نەكردووە، بەجوانی گوێی لێبگرە، بۆچوونی ئەوانی تری بۆ ڕوون بكەرەوە، ئامادەبە بۆ ئافراندن و وەرگرتنی چارەسەری ناوەندی، بەڵام لەگەڵیدا مەش سازێ" ئامانجی تۆ قۆستنەوەی ئەم كەسەیە بۆ بەرژەوەندی خۆت.

### ٩-هەستەدرۆینە:

وەها ڕەفتاردەكات كە تەواو ئاشنا و شارەزای دۆخ و ڕەوشەكانە لەكاتێكدا هیچی لێ نازانێت، حەزی لێیە هەمووان پێی قایل بن و پەسنی ئەنجامدراوەكانی بدەن، ئیشە باشەكان دەكاتە موڵكی خۆی وبەدرۆ ئیشی خۆی بەڕێ دەكات.

## چۆن لەگەڵیدا ڕەفتاردەكەیت؟

لەسەرەتاوە تێی بگەیەنە كەنابێت بۆچوونەكانت بە قسەی تایبەتی و كەسێتی شكێن وەربگرێت، ڕاستیەكانی بۆ ڕوون بكەرەوە و بەڵگەی دۆخە ڕاستیەكانی بۆ بێنەوە. كاتی تەواوی پێبدە بۆ زاڵبوونی بەسەر ئەم گرێ دەرونیەیدا" هاوكاری بكە گەر لەم بوارەدا پێویستی پێت بوو.

ئایا تۆ خۆت لەنێو یەك یان دوو جۆر لەو كەسایەتیانەدا دەبینیتەوە، یاخود كەسێك دەناسیت ئەم تایبەتمەندیانەی بەسەردا بچەسپێت؟ گرنگ نییە پێشتر چۆنت ڕەفتار لەگەڵدا كردووە، بەڵام گرنگ ئەوەیە كە ئێستا بزانی چۆن بە ئەرێیی ڕەوتاری دەگەڵ دەكەیت.

بەباشی ئەم بەشە بخوێنەرەوە، دەست بكە بە تێبینی كردنی ڕەفتاری ئەوانی تر، ئەوجا ئەم شارەزاییە نوێیانەت بەكاربێنە بۆئەوەی ببیتە خاوەنی توانایی و ژیری تەواو بۆ بڕیاردان و ڕەفتاركردن لەگەڵ ئەوانی تر.

## ٣١-بیست قەدەغەکراوەکەی کاتی پەیوەندی بەستن ڕەگەڵ کەسانی تردا:

((پەیوەندی دابەستن لە پەیوەندییە مرۆییەکاندا وەکو هەناسەدانی مرۆڤ وەهایە، هەردووکیان ئامانجیان بەردەوامی دانە بە ژیان))

**فرجینا ساتیر**

**ئێستایش لیستی بیست باشترین ڕێگەت بۆ دەخەینەبەردەست، بەمەبەستی باشتربوونی بەهرە و هونەری پەیوەندی دابەستنت:**



١) هەرگیز کەس مەپچڕنەو بهێڵە باوەکو بە ئازادانە قسەبکەن.

٢) هاوارمەکە، هێمن بە و لەگەڵ تۆنی دەنگیدا خۆت بگونجێنە.

٣) کاردانەوەکانت باوەکو زیادەڕۆیی و هەڵچوونی تێدا نەبێت، بەڵکو تیشک بخەرەسەر ئەنجامەکانت.

٤) گازندە مەکە، بەڵکو ڕوو لەکەسی گونجاو بکە و کێشەکەتی ڕەگەڵ باسبکە و بەدووی چارەدا بگەڕێ.

٥) جاڕی زانابیت لێ مەدە لەبارەی هەستەکانی خەڵك و داواکاریەکانیانەوە.

٦) گریمانەی ئەوە مەکە خەڵکی بزانن چۆن هەست دەکەیت و چیت دەوێت؟ بەڵکە پێویستە خۆت تێیان بگەیەنیت.

٧) گاڵتە بە هیچ کەس مەکە و ڕێز لە بۆچوونی ئەوانی تر بگرە.

٨) ڕەخنە و شکاندنەوە بەکار مەهێنە(بەتایبەت لەپێش چاوی ئەوانی تر)، بەڵکو بەشێوەیەکی تێگەیشتوانە و تایبەتی قسەی ڕەگەڵ بکە.

٩) شەڕەقسەمەکە بەڵکو گوێ لەوانی تر بگرە و ئەوجا بۆچوونت ڕوونتر بکەرەوە.

١٠) هەڕەشەی ئەوەمەکە کە هیچ کەسێك لە سەر کارەکەی وەدەر دەنێی" چونکە ئەمە لەماوەیەکی درێژدا ئەنجامی خراپی لەسەرت دەبێت.

١١) نەرێنی مەبە، بەڵکو هەوڵبدە بۆ پێشنیارە نوێیەکان کراوەبیت.

١٢) قسەی زۆر لەگەڵ کارمەندانتدا مەکە، دەبێت هەلی قسەکردن بەوانیش بدەیت.

١٣) هەرگیز لایەنگیری مەکە، دادگەربە، یارمەتی چارەکردنی کێشەی نێوان کارمەندانت بدە بە دادگەریی.

١٤) سەرزەنەشتی هیچ کەسێك مەکە، وەکو بەڕێوەبەر بەرپرسیارێتی خۆت هەڵبگرە و بەدووی چارەدا بگەڕێ.

١٥) کاتێك کەسێك قسەت بۆدەکات جێی مەهێڵە، بەڵکو بوەستە و گوێی لێ بگرە و کاتێکی تری بۆ قسەکردن لەگەڵدا بۆ دیاری بکە.

١٦) وشەی گشتاندن(وەکو: هەمیشە، گشت، هەرگیز) زۆر بەکارمەهێنە" چون ئەمە وەهات لێ دەکات بە درۆزن دیاربکەویت" لەبەرئەوەی هیچ کەسێك نییە هەمیشە هەڵەبکات، بۆیە وریابە و بە وردی و دیاری کراوی قسەبکە.

١٧) وشەکانی وەکو: پێویستە، دەبێت بەکارمەهێنە، بەڵکو لەبریدا وشەگەلی وەکو: کاتێك، هەرچۆنێك .. بەکاربێنە.

١٨) ئەم چوار دەستەواژە نەرێنییە بەکارمەهێنە:

**بەلام...** دەبێتە هۆی ڕەتکردنەوەی هەموو قسەکانی پێشترت، بۆیە لەبریدا (و) بەکاربێنە.

**بۆچی...**چونکە بەدووی هۆکارەکاندا دەگەڕێت لەبری چارەسەر، لەبریدا وشەی(چی)بەکاربێنە.

**گەر...**بۆگومانکردن بەکاردێت، لەبریدا (کاتێك) بەکاربێنە.

**هەوڵدەدەم..** مانای ئەوەیە کە پابەندی دۆخەکە نیت، بۆیە لەبریدا بڵێ: ئەنجامی دەدەم.

١٩) کەسانی تر بەکەم مەزانە و ڕێزیان بگرە.

٢٠) کێشە تایبەتیەکانی کارمەندانت لەبیرمەکە و سۆزیان بۆ دەربڕە، گرنگییان پێبدە.

٢١) ئەم ئامۆشیارانە بەلای تۆوە ئاشنان؟ بیان خوێنەرەوە و بەو کارانەتدا بچۆرەوە نەخشەی ئەنجامدانیت دارشتووە، لەبیرت بێت گەر لەو بیست هەڵەیەی پێشووتر بەدووربیت ئەوا نایاب دەبیت لە ڕەفتارکردن لەگەڵ ئەوانی تردا.

## ٣٢-دە ئامۆژگاری پێویستە بەکاریان بهێنی..لەبیریان بکەی ئەنجام لەئەستۆدەگریت:

((ڕێگەی من لە ئەستۆگرتنی ئەهامەتییە قورسەکانە تا دۆزینەوەی وشەیەکی گونجاو ئەوجا زۆر بە هێمنی و لەسەرخۆیی دەری دەبڕم)).

**جۆرج بێرناردشۆ**

ئێستا دەزانیت دەبێت لەڕەفتارەکانتدا خۆت لەچی بەدووربگریت، ئێستایش پێویستت بەوەیە فێری ئەوانەش بیت کە دەبێت ئەنجامیان بدەیت. لەم بوارەشدا لیستێکی دە خاڵیت پێشکەش دەکەین، بۆئەوەی پێوەی پابەندبیت:

١- خەڵکان بەناوی خۆیانەوە بانگ بکە" چونکە خۆشترین و ویستراوترین دەنگ ناوی خاوەنەکەیەتی.

٢- بەباشی گوێبگرە و هانی ئەوانی تریش بدە بۆ دەربڕینی بۆچونەکانیان.

٣- نواندنی باش پەسەندبکە و بەپێی باشیەتی باشتر پێیدا هەڵبدە.

٤- هەمیشە هەست بەچی دەکەیت و چیت دەوێت دەری بڕە، منگە منگ مەکە.

٥- لێبوردەبە و لەبیربکە، واز لە ڕابردووبێنە با بەخێرایی بڕوات.

٦- پێبکەنە تەنانەت گەر هەستت بە پێکەنینیش نەکرد.

٧- بەسۆز و میهرەبانبە، لەکاتی ئیشکردندا بیر لەکێشە تایبەتیەکانت مەکەرەوە.

٨- گەر پێویستی کرد زانیاریەکانت باوەکو تەنها لای خۆت بێت.

٩- سەردانی کارمەندانت بکە لەکاتی کارکردندا، ئەمە پتر هانیان دەدات بۆ باشتر کارکردن.

١٠- جارجارە بانگێشتی داوەتیشیان بکە.

**هەوڵبدە باشترینی بەڕێوەبەران بیت..**

# ٣٣-ئايا دەزانى چۆن لەگەڵ مرۆڤى دوو ڕوودا ڕەفتار دەكەيت؟

((پێكەنینەكەی هەموو چواردەوبەری بۆخۆی كێش دەكرد، بەڵام ڕەفتارەكانی تری هەمووانی لێدەكرد))

**جۆرج س.سكۆت**



دووزمانە دووڕووەكان لە دەوروپشتتن و زۆریان حەز بەوەیە لەكاتی ئامادە نەبوونی كەسانی تردا قسەی پێ بڵێن. لێرەدا شێوازی ڕەفتاركردن ڕەگەڵ ئەم كەسانە دەخەینەڕوو:

١- ڕووبەڕوو ببینە و لەبۆچونی بپرسە لەبارەی كارەكەیەوە، زۆربەی جارەكان وەڵامەكەی بەڵێ و باش دەبێت.

٢- لەبارەی خۆتەوە لێی بپرسە، ئەمیش دیسانەوە بە ئەرێیی دەبێت.

٣- ئەوجا ئەوەی دەتەوێت پێی بڵێی بە جوانییەوە پێی بڵێ: بیستومە وەها و وەهات گتووە، ئەوجا پێی بڵێ: پێویستە دەست لەم ڕەفتارە ناشیرینانەت هەڵبگریت. لەم كاتەدا چاوت بخەرە نێو چاوی و ئەوجا لێی بپرسە: تۆ گوێت لێمە؟ ئەوجا پێی بڵێ: گەر لێرە بەدواوە ویستت شتێكم پێ بڵێی ئەوا ڕاستەوخۆ وەرە و پێم بڵێ.

٤- گەر جارێكی تر ئەم كەسە دووڕوویی ئەنجامدا و هەستت كرد كاری كردۆتەسەر كار و كارمەندانی كۆمپانیا و دامەزراوەكەت ئەوا جارێكی تر بانگی بكەرەوەو لێپرسینەوەی لەگەڵدا بكەو لەم كاتە بەدواوە چیتر ناوێرێت كاری وەها ئەنجام بدات، گەر دووڕەویشی كرد ئەوا لەدەرەوەی سنوری تۆوە ئەنجام دەدات.

## ٣٤-ئایادەزانی چۆن ورتەورت و واتەوات چارەسەر دەکەیت؟

((باشترین درۆزن ئەوەیە کە دەتوانێت درۆیەکی کەم بۆماوەیەکی زۆر وەك ڕاستی پیشان بدات))

**سامۆیل بتلر**



ئەوکاتەی بەڕێوەبەری میوانخانەیەك بووم، ڕاهاتووم کە ببمە ئامانجی واتە واتەکان. ئەمەت بۆیە پێ دەڵێم، بۆئەوەی نەختێك کاریگەری ئەم کێشە و دۆخە نەخوازراوەت بۆ سوك بکەمەوە ، لەبیرت نەچێت کەتۆ بەڕێوەبەریت و سەرەکترین ئامانجی ویتوواتی و هەربۆیە ئێستایش ڕێگەی زاڵبوونت بەسەریدا بۆ دەخەمە بەردەست:

١- لەگەڵ دەستەی کارتدا کۆبوونەوەیەك ڕێك بخە.

٢- لەبارەی دەنگۆ و واتەواتەکانەوە قسەیان لەگەڵدابکە و تێیان بگەیەنە کە ئەمە هەمووی قسەی هەڵبەستراوی ناڕاستە و ڕاستییەکەیش ئەوەیە.

٣- بەمەش دەتوانی کاردانەوەیەکی ئەرێیی و دووپاتی بنوێنی و ئەم واتەواتانە بوەستێنی.

٤- گەر واتە واتەکە زۆر مەترسیداربوو، ئەوا کۆبوونەوەیەکی گشتی بۆ هەموو کارمەندانت ببەستە و ڕاستیەکەیان بۆ ڕوون بکەرەوە.

هەروەها وەکو چارەسەرێکی جێگرەوە دەتوانی گوێت لەم واتەواتانە کەڕبکەیت" گەر مەترسیدارنەبوو.

# ٣٥-چۆن ململانێی نێوان کارمەندانت چارەدەکەیت؟

((ڕاستترین بگرە و پێشبخە، بەمە هەندێك قەزارت دەبن و ئەوانی تریش لێت ڕادەمێنن))

**مارك توین**



وەك دەزانیت لەکاردا زۆرجار کێشە ڕوودەدات و ئەمەش لای خۆیەوە کاردەکاتەسەر دەستەی کارت، گەر ئەمە نەوەستێنی ئەوا خراپ کارت دەکاتەسەر، لێرەشدا چۆنێتی ڕەفتارکردنت لەم کاتەدا بۆ دەخەمە ڕوو:

١- دەبێت لەسەرەتاوە هانی هەردوو کەس و بەرە بدەیت بۆئەوەی بە گفتوگۆ چارەیەك بدۆزنەوە.

٢- گەر ئەمە بۆخۆیان چارە نەکرا، داوایان لێبکە کەسێکی متمانە پێکراو بێننە نێو کیشەکەیانەوە بۆ دۆزینەوەی چارەسەر، بە پێشنیار و چارەخراوە ڕووەکانی قایل بن.

٣- گەر ئەمەش شکستی هێنا ئەوا بانگێشتی نوسینگەکەی خۆتیان بکە و بۆچوونی خۆتیان لەبارەی ئەم کێشەیەوە پێ بڵێ.

٤- باسی باشی ڕابردوویان بکە.

٥- کێشەکەیان بۆ ڕوونبکەرەوە لەوەی بەچی شێوەیەك کار لە ڕۆڵ نواندنەکانی دەستەی کارکردن و ئەنجامەکان دەکات.

٦- بەبێ پچڕان گوێیان لێبگرە. ئەوجا داویان لێبکە هەردوولایان ڕێز لەقسە و ڕەفتارەکانی یەکتر بگرن.

٧- داوایان لێبکە بەزووترین کات چارەسەرێکی باش بدۆزنەوە، ئەوجا بۆچوونی خۆتیان لەبارەوە بخەرە ڕوو.

٨- دەستی یارمەتییان بۆ درێژبکە و دڵنیابە لەوەی هەموان تێگەیشتوون و بە چارەسەرەکە قایلن و دڵنیابەرەوە لە قایل بوونیان. سوپاسی گوێڕایەڵ بوونیان بکە.

٩- لەنزیکەوە بەدواداچونیان بۆبکە" لەبارەی چارەبوونی کێشەکەوە.

## ٣٦-ڕەچەتەی كارا بۆ پەیوەندی سەركەوتوو:

((هەموومان كێبڕكێی یەكتردەكەین، ڕەگەڵ یەكتردا ڕەفتاردەكەین..گرنگ ئەوەیە چۆن ئەمە ئەنجام دەدەین و بەرئەنجامەكەشمان چی دەبێت))

**فرجيناساتير**



لێرەدا كاراترین و سەركەوتوترین ڕێگەت پێش دەست دەخەم بۆ بەدیهاتنی هۆگری ڕەگەڵ ئەوانی تر، لەگەڵ گەشەپێدانی پەیوەندیت دەگەڵ ئاڵۆزنترین كەسانی خراپ خوو:

### ١-تێبینی/خۆگونجاندن/سەركردایەتی:

دەست بكە بە تێبینی كردنی ئەو زاراوانەی كەسی بەرامبەرت بەكاری دەهێنێت، جوڵەی لەشی و تۆنی دەنگی و زمان و ئامازە تایبەتیەكانی لەقسەكردنیش یادبگرە و ئەوجا هەمان شت ئەنجام بدەرەوە و سیستمی خۆنواندنی ئەو بەكاربێنە، گەر تێبینیت كرد كەسێكی بینایی، بیستۆكەیی، هەستی...یە، دەبێت تۆیش وەكو ئەو ڕەفتار بكەیت. هەوڵبدە بۆماوەیەكی كەم ڕەگەڵیدا هاوقسە و بۆچوون بیت ئەوجا نەختە نەختە لەسەركردایەتی دایبگرە خواری و خۆت ببە بە سەركردە بۆبەدیهاتنی هۆگری تەواو لەنێوانتاندا" لەسەر ئاستی هۆشیاری.

### ٢-باش گرنگی پێدان و نەپچڕاندن:

هەرگیز ڕوویداوە كەسێك لەكاتی قسەبۆكردنیدا تۆ بپچڕێنێت" وەك تەواوكارێك بۆ قسەكانی تۆ؟ لەو كاتەدا هەستت بەچی كردووە؟ ڕەنگە بزانیت خواوەند یەك دەم و

دوو گوێی بۆ دروستکردوین بۆئەوەی هێندەی دەبیستین نیوەی بدوێین. بابلیلیۆس سیرس لەم چوارچێوەیەدا دەڵێت:" **کاتێك قسەدەکەم هەست بە پەشیمانی دەکەم، نەوەك کاتێك بێدەنگ بم**" ، هەروەها دەشڵێت:" **گەر بەکەسێکی کەمژەت ڕاگەیاند هیچ قسەنەکات ئەوا خەڵکی بە زانای دەبینن**" ، گوێگرتن گرنگییەکی زۆری هەیە" چونکە یارمەتیت دەدات بۆ تێگەیشتن لەکەسی بەرامبەر نەوەك تەنها ئەمە و بەس بەڵکو یارمەتیشت دەدات بۆ بەدیهاتنی هۆگریی. هەربۆیە پێویستت بە باش گوێگرتن و نەپچڕاندنی قسەی ئەوانی ترە، هەوڵبدە هانی ئەوانی تربدەی بۆ قسەکردن لەڕێگەی ئاراستەکردنی پرسیاری گشتی و کراوەوە و گرنگی بە تێبینی شتی ناپێویست مەدە، تەنها مەگەر بزانیت ئەمە زۆر پێویستە، دانتی دەڵێت:" **ئەوەی بەباشی گوێبگرێت دەتوانێت تێبینی پوخت بەرهەم بهێنێت**" .

### ٣-پێکەنین:



هەوڵی هێشتنەوەی زەردە خەنەی گەرمی سەر ڕووخسارت بدە" بۆئەوەی لایەنی بەرامبەر هەست بە ئاسودەیی و دڵنیایی بکات. پەندێکی چینیش هەیە دەڵێت:" **ئەوەی نەزانێت پێبکەنێت نابێت فرۆشگا دابنێت**"، بۆیە هەرچییەك ڕوویدا، زەردەخەنەت بپارێزە، دەزانم کارێکی ئاسان نییە بەڵام هەوڵێکی بۆبدە.

**((وەها ڕەفتاربکە وەك ئەوەی دەتوانی، ئەوجا بەکردە دەتوانی))**

**ولیام جیمس**

## ٤-گرنگی دان بە چاولەچاو خستن:



زۆر کـــەس بەهەڵـــە لـــە چـــاو خستنەناوچـــاو تێگەیشتوون، هەندێك بە كارێكی نەشیاوی دەزانن كە چاو لەناوچاوی بەرمبەریان بخەن، بەوەی دەبێتەهۆی پەرێشانكردنی لایەنی بەرامبەر، لەكاتێكدا هەندێكی تـر بەكارێكی باشی دەبینن بەتایبەت گەر كەسی بەرامبـەر سەیری ناوچاوانی تۆی دەكرد، ئەمـەش ڕاسـتە، بـەڵام گەر كەسی بەرامبـەر بەچـاوانی یـاری دەكـرد و هـەرجارە و لەجێگەیـەكی دەڕوانـی ئـەوا بەپێی یاسای تێڕامان دەبێت كە دەڵێن: لە چاوی سێیەمی بڕوانە، لە ناوەڕاستی تەوێڵی. بەڵێ ئەمەباشترینە بۆ دروستكردنی پەیوەندی و دواتریش هۆگری.

## ٥-چرتیشك خستنەسەر مەرامەكان:



گریمانەیـەك لـە بەرنامـەی زمانەوانیانـەی دەماریـدا هەیە دەڵێـت: هـەموو ڕەفتارێـك مەبەسـتێكی ئـەرێیی لەپشـتە، گـەر لـەدزێك بپرسـیت بۆچـی دزی كـردووە؟ ئـەوا ڕەنگـە وەڵامەكـەی وەهابێـت: چـونكە ویسـتومە ئۆتۆمبێلێك بكرم، گەشـتێك ئـەنجام بـدەم، خانویـەكی باشتر بكڕم و بەختەوەربم.

تۆیش هاوڕای من نیت بەوەی هەرچی مرۆڤ دەیكات بۆ بەدیهاتنی بەختەوەرییە و نێتی ئـەو دەزەش كـارێكی بـاش بـووە، بـەڵام ڕەفتارەكـانی و ئەوڕێگـەی بـۆ بـەدیهاتنی ئـەم بەختەوەرییە گرتویەتیەبەر هەڵەبووە و وەهای لێكردووە تەڤلی بەندیخانەبێت.

لێرەدا پێویستە تیشك بخەیتەسەر نێت و مەرامی ئەوانی تر تەنانـەت گـەر لەگەڵیشـیدا نـاكۆك بیـت، یـاخود گـەر یـەكێك قسـەیەكی پـێ گـوتی نەكەویتـە داوی وشـەكانیەوە.

ئەلبێرت مۆربیان دەڵێت:" **وشەکان تەنها ٧٪ ی تێکڕای پەیوەندی کردن و مامەڵە پێك دەهێنن".**

### ٦-سۆزگۆڕین:

جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان سۆزگۆڕین و هاوسۆزی، سۆزگۆڕین مانای لە هەناوەوەیە، بەڵام هاوسۆزیی مانای لەدەرەوەوەیە. بۆیە کاتێك هاسۆزدەبیت ڕەچاوی سۆزی ئەوانی تر دەکەیت، بەڵام کاتێك لەدۆخی سۆزگۆڕیندا دەبیت ئەوا لە هەناوەوە کاری بۆدەکەیت و دەتوانیت بەکەسی بەرامبەر بڵێیت: من لەدۆخی تۆ تێدەگەم و ڕێزیشت دەگرم، هەروەها دەتوانی بڵێی: ڕەنگە هۆکارێکی مەزنت هەبێت کە پاڵت پێوەبنێت بۆئەوەی بەم شێوەیە ڕەفتاربکەیت.

### ٧-ڕوونکردنەوە:



بەزۆری خەڵکی پەنا بۆ بەکارهێنانی گشتاندن دەبەن کاتێك هەست بە تەنگەتاوی دەکەن، بۆنمونە دەیانبینیت وشەکانی وەکو: هەمیشە، هەرگیز، گشت بەکاردێنن. یاخود دەستەواژەگەلی وەکو: ئەوان هەمیشە وەهام لێدەکەن، هەموو کارمەندان بەهەمان شێوە بیردەکەنەوە...بەکاردێنن، بۆیە لەسەرتۆ پێویستە هانی کەسانی لەم جۆرە بدەی بە دیاریکراوتر بدوێن و گشتاندن بەکارنەهێنن. دەتوانی بە پرسیارکردنی: بەدیاری کراوی چی وەهات لێدەکات بەم شێوەیە هەست بکەیت؟ ئاراستەی دیاریکردنیان بکەیت و لە گشتاندنیان وەدووربخەیت، کاتێك زاراوەی بەتایبەت و بەدیاریکراوی بەکاردەهێنی ئەوکات دەتوانی زانیاری دیاری کراو و ورد بەدەست بێنی.

## ٨-دووبارە دارِشتنەوە:

دووبـارە دارِشـتنەوە مانـای دووبـارە وتنـەوەی دێڕەکـانی کەسـی بەرامبـەرە، بـەڵام بەشێوازی تایبەتی خۆت و بەوشەکانی خـۆت، ئەمـەش یارمـەتیت دەکـات بـۆ دڵنیـابوون لەوەی تۆ لەوە گەیشتووی گتویەتی، هەروەها ئەمە هەلێکیش بە لایەنی بەرامبـەر دەدات بۆئەوەی بەباشـی گـوێ بـۆ بیرۆکـەکانی خـۆی بگرێـت و دڵنیابێتـەوە لـەوەی دەیڵێـت و مەبەستیەتی، بۆنمونە: لەوەی دەیڵێیت من وەها تێدەگـەم کـە تـۆ زۆر گرنگـی دەدەیـت بە...ئەوجا بوەستە تاوەکو وەڵامت دەداتەوە.

## ٩-دابرِین!!:



کاتێك کارمەندێك کێشەیەکت بـۆ دەخاتـەڕوو دەبێـت کار بـۆ دابرِینـی بکـەیت. پرسـیاری ئـەوەی لێبکـە گـەر کێشەی تریش هەبێت لەگەڵ ئەم کێشـەیەدا بیخاتـەڕوو، دەشتوانی لەم کێشانەشی دابرِێنی بەوەی لێی بپرسیت: سەرباری ئەم کێشانە کێشەی ترهەن؟ گـەر وەڵامەکـەی بەڵێ بوو، ئەوا لە کێشەی تریش لێی بپرسە و گـەر وەڵامەکـە نـەخێربوو ئـەوکات هـەوڵی ڕووبەڕوو بوونەوەی کێشەکە و دۆزینەوەی چارەسەربدە.

## ١٠-داواکردنی چارەسەر:

کاتێك کارمەندێکت کێشەیەکت بۆدەخاتەڕوو پێویستە بـەدووی چارەسـەریدا بگـەڕێت، نابێت خـۆت ڕاسـتەوخۆ چارەسـەری ئامـادەی پێشـکەش بکـەیت" چـونکە ئەمـە وەهـای لێدەکات هەرکاتێك بچوکترین کێشەی توش بێت هانا بۆ چارەکانی تۆ بەرێت و پشت بـە تۆ دەبەستێ و خۆی لەبیردەکات و تۆیش توشی گرفت دەکات. لێی بپرسـە: ئایـا ئێسـتا دۆخەکە بە جیاوازتر لەپێشـووتر دەبینـی یـاخود بۆچـوونت چـیە لـەبارەی چـارەکردنی کێشەکەتەوە؟

### ١١-درێژکردنی دەستی یارمەتی:

دەتوانی دەستی یارمەتی بۆ کارمەندانت درێژبکەیت، بۆئەوەی لەگۆشەی جیاوازەوە لەشت و دۆخەکان بڕوانێت، بۆنمونە: ڕەوچاوی ئەمەت کردووە؟ دەتەوێت ڕێگەیەکی ترت بۆ بخەمەڕوو؟

### ١٢-کۆتایی هێنان بە دۆخەکە و بەدواداچوون:

کاتێك کەسەکە بەدۆخ و هەڵوێستەکە قایل دەبێت پێویستە ڕێگەی پێبدەیت بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری چارەسەریی، دڵنیابە لەوەی کە تێی گەیشتووە و دواتر سوپاسی ئاراستەبکە.

**نمونە:**



بێژە: بهێڵە باوەکو دۆخەکەت بۆ کورتبڕ بکەم، ئەوجا بڵێ:" سوپاست دەکەم بۆئەوەی کە ئاگادارت کردمەوە"، ئینجا دەبێت ئەوەی لەسەری ڕێککەوتوون ئەنجامی بدەی، کاتێکیش بۆئەمە دیاری بکە، تێبینی مەودای کارلێکی ئەم کەسە ڕەگەڵ هەڵوێستەکانی لەداهاتوودابکە.

کاتێك بەهەموو ئەو زانیاریانە کاردەکەیت کەلەم بەشەدا وەرت گرتووە، دەبینی بەباشتر دەتوانی پەیوەندی بەوانی ترەوە بکەیت، لەم کاتەشدا تۆ هێمن تردەبیت، ئەبیتە خاوەنی هەڵبژاردنی فرەتر و بەژیرانەترەوە دەتوانی ڕووبەڕووی دۆخەکان بوەستیتەوە. د.جۆن گرندەر ی دامەزرێەری پرۆگرامسازیی زمانەوانیانەی دەمار دەڵێت:" **ئەو کەسەی خاوەنی توانای کشۆکییە دەبێتە خاوەنی پێگەی سەرکردایەتی**" .

**بڕیاری دەستپێکردنی ئەمەبدە، بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن...**

# کلیلی شەشەم

## دیاری کردنی ئامانج..

## ڕێگەیەك بەرەو بەختەوەری و سەرەنج ڕاکێشی



((لە نوکتەکانی ژیان ئەوەیە کە: گەر هاتوو تەنها بە باشترین قایلبی بەدەستی دێنی))

**سومرست مۆم**

## ٣٧-ئایا دەزانی تۆ بەرەو کوێوە دەڕۆیت؟

((جهان ڕێگەی فراوان دەکات بۆئەو کەسەی بزانێت بۆکوێ دەڕوات))

**ڕالف و.ئیمرسۆن**

ئالیس پرسی:" شیشەری پشیلە ، بەیارمەتیت دەتوانی پێم بڵێی دەتوانم بۆکوێ بڕۆم؟"، پشیلەکە وەڵامی دایەوە و گوتی:" ئەمە بەشێوەیەکی گشتی پەیوەستە بەوەی دەتەوێت بۆکوێ بڕۆی"، ئالیس گوتی:" ئەمە بۆمن زۆر گرنگە"، شیشەری پشیلە گوتی:" کەواتە گرنگ نییە بۆکوێ دەڕۆی".



لویس کارۆل لە سەرکێشیەکانی ئالیس لە نیشتمانی سەمەرەکاندا.

دیاریکردنی ئاراستەکانت یەکەمین هەنگاوە لەسەر ڕێگەت بۆ ئەوەی بگەیت بەو جێگەیەی دەتەوێت، کەواتە باوەکو پرسیارێکت لێبکەم: ئامانجت هەیە؟ ڕەنگە سەیرت بە پرسیارەکەی من بێت و بڵێی: بەڵێ ئامانجم هەیە. بەڵام لێرەدا ئەوەی من مەبەستمە ئەوەیە: ئایا بەرنامەیەکی دیاریکراوت هەیە بۆ دیاریکردنی ئامانجەکانت؟ ئامانجەکانت تۆمارکردووە و نوسیوتنەتەوە؟ کاتێکت دیاریکردووە بۆ بەدیهاتنی ئەو ئامانجانە و بەدیهاتنی؟

گەر وەڵامەکەت بەڵێ یە، ئەوا تۆ یەکێکی لەو ٣٪ی خەڵکی کە باشترینن.

گەر وەڵامەکەشت نەخێر بوو ئەوا بزانە کە تۆ لەنێو ٩٧٪ی کەسانی ئاسایی و بێ ئامانج و بێ وەرنامەی دیاریکراوی، ئەم قسانەش پشت بەستە بە توێژینەوەکانی زانکۆی هارفەرد. هەموو مرۆڤێک خەونێکی هەیە، ئامانج و ئەندێشەی تایبەت بەخۆی هەیە،

هەندێك كەس دەتوانن خەونەكانیان بگۆڕن بۆ كردە و هەندێكی تریش خەونەكانی تەنها لەمێشكیدا بۆخۆی دەیهێڵێتەوە و هیچ هەنگاوێك نانێت بۆ بەدیهاتنی و گەیشتن بە دۆخی ڕاستەقینەی خەونەكانی، ئەو كەسانەی دوێنێ ڕۆیشتوون بۆسەركار ئەمڕۆیش دەڕۆن" چون ژیان لای ئەوان ڕێگەیەكە بۆگەیشتن بە بەختەوەری. ئامانجی گەورەش كە ئەم كەسانە بەكاردەخات ئەوەیەكە:" چۆن بتوانم قەرزەكانم بدەم؟ ئەمڕۆ لەتەلەفزیۆن چی پیشان دەدرێت؟ ئێوارێ دەبێت چی بخۆین؟ " ، ئەمانە بڕوایان وەهایە كە سەركەوتن پەیوەستە بە بەختەوە و هەركەسێك سەركەوتنی مەزنی چنگ خستووە ئەوا كەسێكی بێ ئابڕووە ! ! ئەمانە بەدرێژایی ژیانیان لە لاڵانەوە و هەوڵدان بۆ ئەوەی ژەمەنانیان چنگ بخەن لەبری ئەوەی نەخشەیەكی ماوەدرێژ بۆ ژیانیان دانێن.

زاناكان توێژینەوەكیان لەسەر دوومشك ئەنجامدا و بۆماوەی دووهەفتە بەبرسێتی هێشتنیانەوە و دواتر خستنیانە نێو شوشەیەكی پێچداری خانەخانەیی و لەكۆتایی ڕێگەكەدا پارچە پەنیرێك دانرابوو.

كێبڕكێی نێوان ئەم دوومشكە بۆ گەیشتن بە پارچە پەنیرەكە دەستی پێكرد، كامێكیان ژیرتر و خێراتربێت ئەو دەتوانێت زووتر بە پەنیرەكە بگات. بێگومان خێراترین و ژیرترینیان توانی پارچە پەنیرەكە بەدەست بێنێت، ئەمەش بۆ مرۆڤ هەمان شتە.

مرۆڤەكانیش بەردەوام لە هەوڵ و تێكۆشاندان بۆ گەیشتن بە پارچە پەنیرەكە. وزە و توانا شاراوەكانیان بەكارناخەن، بەڵكو تەنها هەمان كاری ڕۆژانەی پێشووتریان ئەنجام دەدەن.

**((كارمەندگەلێكم پێبدە لە كۆگادابن و ئامانجیان هەبێت منیش پیاوانێكت پێدەدەمەوە مێژوو دروستبكەن.. پیاوانی بێ ئامانجم بدەرێ منیش كارمەندی كۆگاكانت پێدەدەم))**

**ج.س.بینی**

جارێکیان لە بەڕێوەبەرێکم پرسی: ((ئایا پێشتر مۆڵەتت وەرگرتووە؟))، گوتی:" ساڵی پار ڕۆیشتم بۆ مەکسیك، دوو هەفتەی خۆشم بەسەربرد"، لێم پرسی: (( چۆن پلانت دارشتبوو بۆئەوەی بەم خۆشییەوە مۆڵەتەکەت بەسەر بەریت؟))، گوتی:" من و ژنەکەم شوێنێکی گونجاومان دیاریکرد و دواتریش پارەی پێویست، پەیوەندیمان بەسێ ڕێبەرکارەوە کرد بۆئەوەی نرخ و کرێ و چۆنێتیەکان بزانین، بێگومان گونجاوترینمان هەڵبژارد و ڕۆیشتین بۆ مەکسیك" . پێم گوت: (( ڕەنگە تۆ لەو کەسانەبیت کە نەخشە بۆهەموو شت دادەنێی))، پێکەنی و گوتی: ((بەڵێ، بەتایبەت لەکاتی مۆڵەت و پشوەکاندا. گرنگی بە هەموو وردەکاریەکان دەدەم بۆ دوورکەوتنەوە لە شتی لەناکاو))، ئەوجا لێم پرسی: (( کەتۆ لەکاتی پشوەکاندا گرنگی بەهەموو وردەکاریەکان دەدەیت، ئەی لە بارودۆخەکانی تری ژیانیش هەمان شت پێڕەو دەکەین؟))، ئەوجا وەلامی دایەوە گوتی:" نەخێر" چونکە ئەمە کاتی زۆری دەوێت و منیش زۆر سەرقاڵم، ئەوجا من دەزانم چیم دەوێ و بۆکوێ دەڕۆم، هەمووشتێکم لەنێو مێشکمدا داکردووە". ئەم بەڕێوەبەرە گرنگی بە ڕێکخستنی پشوەکانی دەدات، بەلأم کاتێك شتەکە پەیوەست بێت بە هەموو ژیانیەووە ئەوا کاتی نابێت بۆ نەخشەدانان ! !

لەچاوپێکەوتنێکمدا ڕەگەڵ بەڕێوەبەرێکی گشتیدا لێم پرسی: گەر بەرنامە و نەخشەیەکت هەبێت بۆ دیاریکردنی ئامانجەکانت، ئەویش گوتی:" بەڕاستی بڕوام بەم شتانە نییە و بەکات بەفیڕۆدانی دەزانم. ئامادەی زۆر کۆڕ و کۆبوونەوە بووم لەبارەی ئامانجەوە و کتێبی زۆریشم خوێندۆتەوە لەبارەیەوە، هەولی جێبەجێکردنیم دا بەلأم سودێکی نەبوو". لێم پرسی:" بەبێ بوونی نەخشەڕێیەك دەتوانی دەست بەگەشت بکەیت؟" .

وەلأمی دایەوە و گوتی:" ئەوەی وەهابکات شێتە، بۆچی کاری وەهابکەم و خۆم بخەمە مەترسییەوە"، ئەوجا هەمدیس لێم پرسییەوە:" کەواتە لەم دۆخانەدا چی دەکەیت؟" .

گوتی:

یەکەم: من بۆکوێ برۆم دیاریدەکەم و دەشزانم بۆچی دەرۆم، ئەوجا نەخشە ڕێگەیەك ئامادە دەکەم و هەموو زانیارییەکی پێویستیش لەبارەی مەودا و کات و پارەی پێویستەوە دەست نیشان دەکەم.

لێم پرسی:" چی ڕوودەدات گەر ئەم ڕێوشوێنانە نەگریتە بەر و خۆت ئامادە نەکەیت؟"، گوتی:" بێگومان ڕێگەکەم ون دەکەم، هەرچۆنێك بێت ئەمە هەرگیز ئەنجام نادەم و بەبێ نەخشەڕێ ناکەومەڕێ". ئەم کەسە ڕەتی گەشتکردن دەکاتەوە بەبێ خۆئامادەکردن و نەخشەیەکی دیاریکراوی ڕێگە. بەڵام گرنگی بەوە نادات کە نەخشە ڕێگە بۆ ژیانی دابنێت و بەخۆشی بژێت. بەڕێوەبەرانی لێهاتوو ئەوانەن کە نەخشە بۆ هەموو شت و ئەگەر و پێشهاتێك دادەنێن، نەخشەی بازاڕکاری، نەخشەی ستراتیژی، نەخشەی ڕاگەیاندنی و پارەدارکردن و فراوانکاری. ئەمانە هەمیشە کۆبونەوە ئەنجامدەدەن بەمەبەستی پێداچوونەوە بە نەخشەکانیان و دڵنیابونەوە لەڕاستی ئەو ڕێگەیەی گرتویانە، هەروەها بەردەوامیش دەبن لە چاکسازیی کردن بۆ زامنکردنی سەرکەوتنی.

گەر هەر هەڵەیەك ڕوویدا، ئەوا ئاڵای سور بەرزدەکەنەوە و دەست دەکەن بەگەڕان و ڕاوێژکردن تاوەکو دەگەن بە خاڵی شکست و کێشەکانیان، ئەوجا دیسانەوە لە نەخشەکانیان دەڕواننەوە. گەر لە یەکێك لەم بەڕێوەبەرانە بپرسیت: دەتوانیت بەبێ دیاریکردنی بودجە و نەخشەی بابەتی کاربکات؟ دەبینی تۆ بەشێت دێتە پێش چاوی و بە تەواوەتی نەخشەی گەشتکردن دادەنێ، بەڵام گرنگی نادەن بەهیچ نەخشەیەکی ژیانیان.

## ٣٨-پێنج هۆکار وەها لە ٩٧٪ی خەڵکی دەکات ئامانجیان دیاری نەکەن:

((مرۆڤ بەبێ ئامانج وەکو کەشتی بێ سەوڵ وەهایە، هەردووکیان بە خۆکێشان بەبەردا کاریان تەواودەبێت))

**تۆمارس کارلیل**



پێنج هۆکارت بۆ پێش دەست دەخەم کە وەها لەزۆرینەی خەڵکی سەر زەوی دەکات نەخشە بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکانیان دانەڕێژن:

**١-ترس:**

ترس سەرسەخترین دوژمنی مرۆڤە(ترس لە شکست، ترس لە نادیار،ترس لە ڕەتکردنەوە، ترس لەسەرکەوتنیش).

ترس بەهەموو جۆرەکانیەوە یەك ئاراستەی دەبێت ئەویش ئازارە-مرۆڤەکان ئامادەی ئەنجامدانی هەمووشتێکن بۆ دوورکەوتنەوە لە ئازار، زۆرینەی خۆیان لە توشبوون بەئازار بەدووردەگرن تەنانەت گەر ئەم ئازارە لەبەرژەوەندی خۆشیاندابێت، وەرە باوەکو پرسیارێکت لێبکەم:

بڕوات وەهایە منداڵێکی سێ ساڵان لەهیچ شتێك بترسێت؟ ڕەنگە بڵێی لەوانەیە، کەچی وەڵامەکە نەخێرە، تەنانەت گەر لەگەڵ ئەمەشدا ناکۆك بێت.

لەڕاستیدا منداڵەکە لەهیچ شتێك ناترسێت تەنها مەگەر بیئەزموێت بکات. منداڵ هەموو شتێك ئەنجام دەدات گەر یەکێك نەبێتە ڕێگری. دەست دەخاتە نێو ئاگر، لە لێژیدا باز دەدات.. هەموو شتێك ئەنجام دەدات بەڵام کاتێك کە گەورەدەبن و پێ دەگەن فێری ترسان دەکرێن.

ئەودەمەی پێ دەگەن ترسەکانیان ڕێگلایان دەبێت لە ئەنجامدانی هەرشتێك" چون دەترسن لە شکست. شکست بۆخۆی لە ڕابردوودا توشیان بووە و دەترسن دووبارە دووچاری ببنەوە، بۆیە فێربوونە بەبێ هیچ بەرنامەیەکی تایبەت بۆ دیاریکردنی ئامانجانیان بژین و بگوزەرێنن.

وەك زج. زیجلار دەڵێت :" **ترس بەڵگەیەکی درۆیینەیە بەلأم وەکو ڕاستی دیاردەبێت**"، هۆراسیش دەڵێت:" **ئەوەی بەترساوییەوە بژیێت هەرگیز نابێتە مرۆڤێکی ئازاد**".

گەر فێرنەبین چۆن شکست بە ترسی هەناومان دێنین ئەوا ناتوانین لە گومان و ترس و ئەندێشەپوچەڵەکانمان خۆمان ڕزگاربکەین، وەك فرانکلین ڕۆفیلت دەڵێت:" **گومانی ئەمڕۆمان تاکە لەمپەرمانە بۆ گەیشتن بە سبەی**" .

## ٢-خۆ وادنان:



د.جۆیس براورز دەڵێت:" نواندنت نەشیاودەبێت گەر لەگەڵ شێوازی خۆ وێنەکردنتدا نەگونجێت". کاتێك مرۆڤ خۆی بە داڕووخاو دەبینێت، ئەمە کار لەسەر ڕووخسار و پەیوەندی و نواندنەکانی و تەنانەت شێوازی پێ ژیاویشی دەکات. کە لە دەوروپشت دەڕوانێت وەها هەست دەکات کە سەرکەوتن بۆ ئەوانی تر ئافرێندراوە و ئەم لێی بێبەشە. ئەم مرۆڤە لەم کاتەدا بەوشێوەیە دەبێت کە زج زیجلار دەڵێت:" **زۆرینەی پیاسەکار(بێزاری سەرلێ شێواو)ان بیرۆکەیەکی تێکدراویان هەیە لەبارەی ئەوەی دەیانەوێت**" .

بەلأم باشی ئەمە لەوەدایە ئەم چەشنە ڕەفتارانە وەرگیراون و دەتوانرێت بگۆڕێن. گەر مرۆڤ کاری نەکردەسەر وادانانە هەڵەکانی بەرامبەر بەخۆی ئەوا بە هەموو شتێك قایل دەبێت و پێی ڕازییە لەوەی لەداهاتوودا بەسەری دێت، هیچ دیاریکردنێکی ئامانجیشی بۆ

دیارناکەوێت و نایەوێت ئامانجەکانی بپێکێت. وەك د.لاری کیمسری دەڵێت:" **شکستی مەترسیدار ئەوەیە کە مرۆڤ لەهەوڵدان بوەستێت**"، وەك جۆن کەنەدیش دەڵێت:" **ئەوکاتەی ڕۆژێك تۆ بەخۆت دەڵێی کە دەبێتە پلە دوو. ئەوا لەژیانتدا ئەمەت لێ ڕوودەدات**".

### ٣-دواخستن:

ئیدوارد دۆینگ دەڵێت:" **دواخستن دزی کاتە**"، کاری ئەمڕۆ بخەیتە سبەی دەیخەیتە هەفتەی داهاتوو، هەفتەی داهاتوو بڕیاردەدەیت ئامانجەکانت دیاری بکەیت کەچی بیانووی زۆر دەهێنیتەوە و دەیخەیتە هەفتەی داهاتووتر، لەو کاتەشدا دەڵێی: کەشی ئەمڕۆ خۆشە و دەبێت لەدەرەوە بیگوزەرێنم و دواتر کار بۆ ئامانجەکانم دەکەن... لەمەبەستم تێدەگەیت؟ تۆ بڕوات وەهایە تەنها لەیەك ژیاندا دەژیت و پێویستت بە دیاریکردنی ئامانجە لەم ژیانەتدا، بەڵام کەچی هیچ دەست پێشخارییەك نانوێنی بۆ دیاریکردنی ئامانجەکانت و کار بۆ بەدیهاتنی ناکەیت.

### ٤-بڕوا و باوەڕ:



زۆرکەس باوەڕیان بە بەهای دیاریکردنی ئامانجەکان نییە، بڕوایان وایە کات کوشتنە، ئەمانە بۆ پشتگیری قسەکانیان بیانووی زۆر دەهێننەوە و تەنانەت نمونەی زۆریش بۆ خەڵکی دەخەنەڕوو کەبەبێ دیاریکردنی ئامانج سەرکەوتووبوونە، هێشتاکەیش لەسەر لوتکەی سەرکەوتندان. لەونمونانەش: باسی کەسێکت بۆ دەکات کە تەمەنی ١٠٠ ساڵە و بەردەوام جگەرە دەکێشێت، بێگومان ئەمەش ڕاستە و

مەرج نییە ئەو ٩٧٪ ی مرۆڤایەتی کە ئامانجیان دیاری ناکەن شکست خواردووبن، بەلآم زۆرینەی زۆریان هەمیشە توشی گرفتی زۆر و جۆراوبۆر دەبن. ولیام شکسپیر دەلێت:"**شتێك بەناوی باش یان خراپ بوونی نییە، بەڵکو ئەوە بیرکردنەوەیە وەهای لێکردووە ئەم یان ئەو بێت**" .

شێوازی بیرکردنەوەت لە دیاریکردنی ئامانجت وەهات لێدەکات لەژیانتدا بەبێ ئامانج بژیت.

## ٥–زانیاری:

زانیاری هۆکارێکە وەها لەو ٩٧٪ ی دانیشتوانی سەرزەوی دەکات کە ئامانجەکانیان دانەرێژنەوە. مەبەستم ئەوەیە ئەم کەسانە حەزیان بە ئەنجامدانی شتەکانە، بەلآم نازانن چۆنی بەدەست بێنن، ئەوجا هەنگاوی پێویست نانێن بۆ فێربوونی چۆنێتی بەدەستت هێنانی.

گوێم لە هاورێیەکم بوو چەندان جار پێی دەگوتم کە دەیەوێت ببێتە خۆنوێن(ئەکتەر)ێکی بەناوبانگ، کەچی نەم بینی هیچ هەنگاوێك بۆ بەدیهاتنی بنێت، ئەنجامەکەشی ئەوەبوو کە خەونەکەی بە خەونی مایەوە و بەدرێژایی ژیانی نەیتوانی بیکاتە ڕاستینە.

ئەوکاتەی لێم پرسی کە بۆچی هیچ شتێك ناکەیت بۆئەوەی ببیتە خۆنوێن، لەوەمدا گوتی کە نازانم چۆن وەهابکەم. گەر نەزانی چۆن ئامانجەکانت دەست نیشان دەکەیت و چۆنی بەدی دەهێنی ئەوا تۆیش دەبیتە ئەندامی یانەی( نازانم چۆن). زج زجلار دەلێت:"**ئەوانی تر دەتوانن بەماوەی کاتی تۆ بوەستێنن، بەلآم ئەوە خۆتی کە دەتوانی بەشێوەیەکی بەردەوام خۆت بوەستێنی**".

لەم بەشەدا فێری هەموو ئەو هەنگاو و شتانە دەبیت کە پێویستتە بۆ دیاریکردنی ئامانجەکانت و بەدیهێنانی ئەوەی شایەنیت... ملوانکەی زێڕین.

## ٣٩-پێنج سوودی پشت دیاریکردنی ئامانجەکان:

((ئامانج تەنها پێویست نییە بۆئەوەی هاندەرمان بێت، بەڵکو بنچینەی ڕاستەقینەیە بۆ هێشتنەوەمان لەژیان))

**ڕۆبێرت شۆلر**

### ١-هەڵسوڕاندنی خوود:

کاتێك خاوەنی بەرنامەیەکی ڕێکخراو و هاوسەنگ دەبیت بۆ دیاریکردنی ئامانجەکانت بەگشتی ئەوکات هەست بەوە دەکەیت پتر دەتوانی ژیانت هەڵبسوڕێنی جا هەرچییەکیشت لێ ڕوویدات.

ئەوە تۆی بڕیاری ئەوە دەدەیت کام ئاراستتە هەڵدەبژێری و کەی بەئامانجی خوازراوت دەگەیت، هەستکردن بە هەڵسوڕاندنی دۆخەکانت یارمەتیت دەکات بۆ زاڵبوون بەسەر لەمپەرەکانی پێشتدا و گەر سەرکێشیت ئەنجامبدەی بە توانا و خاوەن ڕێگەدەبیت. وەك والتر جاگهات دەڵێت:" **بەختەوەری گەورە لەژیاندا ئەوەیە کە ئەو شتانەی خەڵکانی تر دەڵێن ناتوانین تۆ بتوانی و ئەنجامی بدەی**" .

### ٢-متمانەبەخۆکردن:

کاتێك باشتر خۆت ڕادەگری و هەڵدەسوڕێنی، متمانەت بەخۆت پتر دەبێت، هەروەها پتر متمانە بە سەرکەوتنت دەکەیت و ئەرێیانەتر بیردەکەیتەوە و ئەنجامی مەزنتر چنگ دەخەیت، هەروەها وەهات لێدەکات باوەڕت وەهەبێت کە دەتوانی ئامانجەکان بە گشتی بکەیتەڕاستی و خەونەکانت بۆ ڕاستینە و کەتواری بگۆڕی.

## ٣-بەهای دەروون/خوود:

گەر ئامانجێکت پێکا، ئەوا پتر متمانە بەخۆت دەکەیت و هەستەکانت بەرامبەر بەخۆت باشتر دەبێت، هەروەها خاستر سیقە بە توانایی و لێهاتوییەکانت دەکەیت و کاتی زۆریش تێپەڕنابێت تاوەکو تێبینی گرنگتربوونی خودت دەکەیت.

کاتێك ئاستەنگێکی کاتیت دووچاردەبێتەوە، ئەوا کەڵك لەم ئەزمون و شارەزاییەت وەردەگریت و تواناداراتریش دەبیت بۆ ڕووبەڕوو وەستانەوەی ئەو دۆخانەی لەوانەیە لەداهاتوودا بەقەت بگرنەوە، بۆئەوەی لەم ڕێیەوە بتوانی ئامانجە بالاکانت بپێکی، هەروەها ئەمە هەستپێکردنت فراوانتردەکات و ئاوزیشت بەدانایی گۆشتن دەکات، وەك ئۆلیڤرندل هۆلمز دەڵێت:" **ئاوەزی مرۆی گەر بە بیرۆکەیەکی نوێ فراوانتربوو هەرگیز بۆ ڕەهەندە بنچینەییەکانی ناگەڕێتەوە دواوە**" .

## ٤-جوان کات بەکارهێنان:




گەر کاتێك بۆ بەدی هاتنی ئەم ئامانجە دیاری بکەیت ئەوا باشتر و وردترکاردەکەیت و دەبیت بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانت، هەروەها تاوەکو ئارەزووەکانت گرگرتوتربن" بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکەت ئەوا باشتر پابەندی بەدیهاتنی ئامانجەکانت دەبیت" لەسایەی کاتی دیاریکراودا. ((**پێویستە ئامانجەکانت کاتی دیاریکراویان هەبێت، بەکاتی دیاریکراو دەتوانیت ئامانجەکانت بەدی بێنیت، بوونی کات و ئامانج وەکو ئەستێرە و ئاسمان وەهاتان و لەتەنیشتی یەکەوە کارا و یەکتر تەواوکارتر دەبن**)).

**ئیبراهیم فەقی**

### ٥-باشترکردنی دۆخی ژیانت:

گەر بەرنامەیەکی ڕێکخراو و هاوسەنگت هەبێت بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکانت ئەوا بەچڕتر تیشك دەخەیتەسەر ئامانجەکانت، کە دەبێتەهۆی بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانت و هاندراوتردەبی و دەبیت بە خاوەنی وزەی باشتر و دۆخی خاستر و لەوەش گرنگتر ئەوەیە تۆ بەختەوەرتر دەبیت. فرانکلین ڕۆفلت دەڵێت:" **بەختەوەری لەچێژی ئەنجامدراوەکان و بەرهەمی کۆششی داهێنان کارانەوە سەرچاوە دەگرێت"**.

## ٤٠- چواربەشەكەی دیاریكردنی ئامانج:

((گەر نەزانی بۆكوێ دەڕۆی ڕەنگە لەناوچەیەكی تر كۆتایی بەگەشتەكەت بێت))
**دایڤدكامبڵ**

ژیانی هاوسەنگ لە ٤ بەشی سەرەكی پێكدێت و گەر یەكێكیان توشی گرفتاری بێت ئەوا هەموو بەشەكانی تری دووچاردەبن، لە كتێبی (( چێژی دڵەڕاوكێ)) د.بیترە.هانسۆن دەڵێت: " **سەركەوتن مانای خەباتكردنە بۆ بەدیهێنانی پلەی بالآ لەهەر چوار بەشەكەی ئامانجدا، گەر شكست توشی هەر یەكێك لەم بەشانەبێت ئەوا بێگومان كار لەتەمەنت دەكات**" .

**ئێستایش باوەكو تاوتوێی چواربەشەكەی دیاریكردنی ئامانج بكەین:**

**١-بەشی كەسێتی:**

لەنێو ئەم بەشەدا شت گەلێكی وەكو پەیوەندی، خێزان،هاوسەرگیری، پشوەكان، هاوڕێیەتی، ئۆتۆمبێلی نوێ، گەشت و سەیران.. هتد هەن.

**٢-بەشی پیشەیی:**

لەنێویدا نواندن و پلەبەرزكردنەوە و بەدەستهێنانی ڕێزی هاوڕێیانت و فێربوونی بەهرەی نوێ هەن، مەبەست لێی بەدەست هێنانی كارێكی نوێ و گۆڕانی پیشەكەت و زیادتر فێربوونتە.

**٣-بەشی دارایی:**

لێرەدا جێگیری داراییت، نەخشەی خانەنشینی، وەبەرهێنانەکانت، کڕینی کۆمپانیای نوێ..هتد دەبینین.

**بەشی تەندروستی:**

لەم بەشەدا تەندروستی لەش، شێوازی ژیان و مەشقە وەرزشییەکان و سیستمی خۆراکی و توانا بۆ ڕەفتارکردن و دڵەڕاوکێ و تەندروستی هزریش دەگرێتەوە.

وەرە باوەکو نمونەیەکت بۆ بخەمەڕووو بۆئەوەی ڕوونتر تێبگەیت: ئەلڤێس بریسلی خاوەنی توانایەکی زۆری هونەری و ناوبانگ باشی و کەشخەیی و پارەداریش بوو، دەیتوانی چی لەژیاندا بویستایە چنگی بخات، بەپێی پێوەرە گشتیەکان دەبوو کەسێکی بەختەوەربایە، سەرباری ئەم هەموو تایبەتمەندییە باشیەی کە تێیدابوو، کە خاوەنی تەندروستییەکی زۆریش باش بوو، بەڵام بەشی کەسێتی و تایبەتی ژیانی بەخراپ کاری لێی کردبوو، بۆیە ژیانی تاڵ ببوو، ئەنجامەکەشی وەك دەیبینی ئەوەبوو کە ئەلڤێس لەنێوانماندا نەماوە! هەمان شتیش بەسەر مارلین مۆنرۆ و دالیدای ئەستێرەی گۆرانی ئەورووپا و زۆری تریشدا هاتوون، بەتێکچوونی بەشێك لەم بەشانە ژیان لە ترۆپکی خۆشییەوە بۆ بنکی ناخۆشی تاڵی وەردەچەرخێت.

بۆنمونە: کەسێك لەسەر کورسیەکی سێ پێ دانیشتووە ، کە پێی چوارەمی شکاوە، بۆیە هەرچەندە خۆی بە هاوسەنگ ڕابگرێت هەر دەبێت ڕۆژێك بێت و بە زەویدا بکەوێت.

**((ئەو ئاراستەیەی لەگەڵ فێربونتدا دەست پێدەکات داهاتووت دیاری دەکات))**

**ئەفلاتون**

بۆئەوەی بەختەوەربیت پێویستە دڵنیابیت لەوەی هەر چواربەشەکەی ژیانت هاوسەنگن. ڕەنگە بپرسی چۆن دەتوانم ئەم هاوسەنگییە بەدیبهێنم؟ وەڵامەکە بەم شێوەیە دەبێت:

## ١-تێبینی بكە و چاودێریش بە:

بۆخۆمـان زۆرجـار بەشـێوەیەكی ئامێركردە(ئـالی) و بـێ هەسـتكردن دەجولێینـەوە و تیبینی ئەنجامدراوەكانمان ناكەین.

وەرە باوەكو پرسیارێكت ئاراستە بكەم: ئایا ڕوویداوە كلیلـەكانت لەجێگەیـەك دانێـی و دواتر لەبیرت كردبێت لەكوێت داناوە؟ ئەمەیە پێی دەگوترێـت نائامـادەیی ئـاوەز، وەك هاری بـوراین دەڵێـت. لەكاتێكـدا تـۆ لەهـەموو كـون و قـوژبنێكی ماڵەكەتـدا دەگـەڕێیت لـەناكاو بـیرت دەكەوێتـەوە كـە كلیلەكـەت لـە چێشـتخانەكە دانـاوە، كاتێـك دەڕۆیتـە چێشتخانەكە و ەبینی كلیلەكەت دیارنییە، ئەوكاتیش ژنەكەت لێت دەپرسێت كە بەدووی چـیدا دەگـەڕێی؟ تـۆیش بـەدەم هەڵچـوونەوە دەڵێـی: كلیلەكـەم لێـرە دانـابوو، بـەڵام دیارنەماوە، لەوانەیە یەكێك بردبێتی. ئەوجا ژنەكەت دەسـت دەكـات بـە گـەڕان بـەدووی كلیلەكەدا و دواتر دەیدۆزێتەوە. ئایا هەرگیز دۆخی وەهات لێ بەسـەر نـەهاتووە؟ ئـەی ئەگەر هەمان شت لەكاتی كاردا لێت ڕوویدا و دۆسیە و ڕاپۆرتێكت ون بوو، چی دەكەیت؟ پزیشـكانی دەروونـی بـەم دۆخـە دەڵـێن:" Seatoma"، نمونـەی ئەمـەش بینینـی كلیلەكەیە لە ئـاوەزی ناهۆشـیارتدا، بـەڵام خـۆت لـەناكاو بـڕوا بـەخۆت دەهێنـی بـەوەی نایدۆزیتەوە، ئەمەش لە ئاوەزی هەناوتدا وێنە دەكێشرێت، بۆیە نـاتوانی كلیلەكـە ببینـی سەرباری ئەوەی لەپێشتدایە. هـەموو ئەمانـە ڕوویانـدا تـەنها لەبەرئـەوەی گرنگیـت بـەو شوێنە نەداوە كە ئەو كلیل یان دۆسیانەت تێیدا داناوە.

ئێمەی مرۆڤ بە چوار قۆناغدا تێدەپەڕین" بۆئەوەی فێربین:

### (١) كەمتوانایی ناهۆشیاری:

لەم ئاستەدا دەبینی ئاوەزی هـەناویت نازانێـت چـۆن كـارێكی دیـاریكراو ئەنجامبـدات. سەبارەت بە ئاوەزی هەناویت ئەم ئەزمونە بوونێكی نییە.

### (٢) کەمتوانایی هۆشیاری:

لەم قۆناغەدا هەست بە بوونی هەوڵێك دەکەیت بۆ فێربوونی چۆنێتی ئەنجامدانی ، بەڵام بەهۆی نەبوونی ئەزمونی پێشترەوە، ئەوا هەوڵەکانت بۆ چۆنێتی فێربوون بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە لە برەودا دەبێت.

### (٣) توانایی هۆشیاری:

لەم ئاستەدا ، فێری چۆنێتی ئەنجامدانی ئەم کارە دەبیت، دەتوانی بەئاسانی ئەنجامی بدەی، جار ناجارێکیش ئەنجامی دەدەی، بەڵام دەشزانیت بەرەو شوێنێکت ئاراستەدەکات و تاوەکو بەردەوامبیت لەدووبارە ئەنجام دانەوەی ئەوەندەی تر توانایی و لێهاتوویت پتر دەبێت.

### (٤) توانایی ناهۆشیاری:

لەم ئاستەدا ئاوەزی هۆشیارت تواناداره، وەرنامەکان لە داتاگەی یادگەی ماوە درێژتدا داکراون، ئەمەش وەهات لێدەکات بێ هۆش و ئاگاداریش بتوانی هەمان کار ئەنجام بدەیتەوە. باوەکو نمونەیەك وەربگرین: بۆنمونە لێخوڕینی ئۆتۆمبێل. ئەوکاتەی دەستت داوەتە لێخوڕینی ئۆتۆمبێل نەت زانیوە چۆنی لێ بخوڕیت، بەڵام ئێستا بەبێ بیرکردنەوەش دەتوانی لێی بخوڕی و هەموو هەنگاوە پێویستەکانی ئەمە بە شێوەیەکی خۆکردە ئەنجام دەدەیت.

زۆر شت هەن لەژیاندا لەدەستمان دەردەچێت" چونکە گرنگی بە تێبینی کردنی بوونی نادەین. کاری قورس بەدرێژایی ڕۆژ وەهات لێدەکات گرنگی بە تەندروستیت نەدەیت و پەیوەندیت بە ژن و منداڵەکانتەوە لاواز دەکات، بەڵام پێویستە بزانی کە نابێت هیچ کام بەشێکی چوار بەشەکەی ئامانج لەسەر هساپی ئەو بەشەکانی تر برەوپێبدەی، ئەگینا

ئەوەی دەستت دەکەوێت ئەوەیە هیچت دەست ناکەوێت، یاخود ئەوەی بەدەستی دەهێنی کەمتردەبێت لەوەی لەدەستی دەدەیت.

**((مرۆڤی بەختەوەر ئەویە کە هۆکاری شتەکان دەزانێت))**

**ڤێرجیل**

**٢-ئەم پرسیارانە ئاراستەی خۆت بکە:**

وەك چۆن پرسیار لەخۆت دەکەیت لەبارەی نەخشەی بازارکردنەوە، دەبێت بەهەمان شێوە پرسیار لەبارەی کەسێتیتەوە لەخۆت بکەیت، بەم شێوەیە:

**(أ) ئێستا من لەکوێم؟**

گەر لەهەموو شتێکدا باش بویت جگە لە پەیوەندییەکانت، تەندروستی یان پیشەت یاخود لەڕووی دۆخی داراییتەوە، ئەوا هەوڵی تێبینی کردنی ئەم دۆخەت بدە و دواتر بەرەو قۆناغی ب هەنگاو بنێ.

**(ب) چیم دەوێت؟**

کاتێك وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەیتەوە ئەوا دەستت داوەتە هەنگاونان بۆ بەدیهێنانی چارەسەری گونجاو و لەئێستادا لە ڕێگەدا دەبیت بۆ بەدیهێنانی هاوسەنگی لەنێوان هەر چوار بەشەکەی ژیانت، ڕەنگە وەڵامەکەت: دەمەوێت لەڕووی تەندروستییەوە باشتربم ، یاخود دەمەوێت پەیوەندیم ڕەگەڵ ژنەکەم یان منداڵەکان یان سەرکارەکەمدا خاستربێت و باشتریش ڕەگەڵ کارمەندانمدا هەڵسوکەوت بکەم، یاخود دەمەوێت پارەی زۆر چنگ بخەم، ئۆتۆمبێل بکڕم، یاخود هەر ئیشێکی نوێتر بدۆزمەوە، کاتێك ئەم پرسیارە لەخۆت دەکەیت ئەوا هەنگاو بەرەو قۆناغی ت دەنێیت.

**(ت) کەی ئەمەم دەوێت؟**

ئێستایش چرپیرکردنەوەکانت ئاراستەی کەی یان کات کراون، ڕەنگە بڵێی: **هەرئێستا** یان **هەفتەی داهاتوو**، یاخود لەماوەی یەك مانگدا، لێرەدا گرنگ ئەوەنییە چەندە کاتی بۆ دادەنێی گرنگ ئاراستە وەرگرتنە بەرەو ڕێگەی ڕاست، ئەمەش وەهات لێدەکات باشتر پێش بکەویت و بگەیتە دوورترین خاڵی دەست پێ نەگەیشتوو.

**ئەم پرسیارانەش ئاراستەی خۆت بکە:**

**(پ) چۆن دەتوانم بگەم بەو جێگەیە؟**

ئێستایش بیر لەو ئامراز و ڕێوشوێنانە بکەرەوە کە بەهۆیەوە دەتوانی بە ئامانجەکەت بگەیت، ڕەنگە بڵێی: پێویستم بە وەرگرتنی خولێکی وتاربێژییە، یاخود لەبارەی چۆنێتی بەستن و بەڕێوەبردنی کۆڕگەلی سەرکەوتوو. ڕەنگە ژنەکەت بۆ گەشتێك بەریت، یان سەرۆك کارەکەت بانگێشتی نان خواردنی ئێواریێ بکەیت بۆ باشتربوونی پەیوەندیەکانت، ڕەنگە لەیانەیەکی تەندروستیدا بەشداربیت و هەفتەی سێ جار مەشق ئەنجام بدەی، گرنگ نییە چی دەکەیت، گرنگ ئەوەیە لەسەر ڕێگەی ڕاست بیت. ئەوەی پێویستت پێی ماوە بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکەت ئەوەیە کە پرسیاری (ج) ئاراستەی خۆت بکەیت.

**(ج) ئێستا چی دەکەم بۆ بەدیهێنانی ئەوەی دەمەوێت؟**

کاتێك ئەم پرسیارە ئاراستەی خۆت دەکەیت ئامادە دەبیت بۆ دەستکردن بەکار بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەت، بۆیە هەرئێستا پەیوەندییەکی دوروبێژی ئەنجامبدە بۆ بانگێشتکردنی سەرکارەکەت یاخود شوێنگرتن بۆ گەشتەکەت کە دەتەوێت دەگەڵ ژنەکەتدا بەسەری بەریت، یاخود گەرەکتە ببیتە ئەندامی یانەیەکی تەندروستی هەرئێستا پەیوەندییان پێوەبکە، **دیاری کردنی ئامانج زۆر گرنگە بەدیهێنانی گرنگترە.**

ئەمڕۆ دەست پێبکە، تێبینی بکە و ببینە و ژیانت بنەزمووە. وەك ئەفلاتۆن دەڵێت:"**ئەو ژیانەی نەت ئەزمواندوە شایەنی ئەوەنییە تێیدا بژیت**" . ئەو پرسیارە بەهێزە لەخۆتبکە و دواتر هەنگاو لەبۆ جێبەجێکردنی بنێ و لەپشتەوەی خۆت مەڕوانە و کاتێك ئەمانە ئەنجام دەدەیت دەبینی ڕۆیشتویتەتە نێو ریزی سەرکەوتوترین کەسانی جهانەوە، خەڵاتەکەت ژیانێکی هاوسەنگ و پڕلە خۆشی و تەواوکراو دەبێت. کۆنفۆشیۆس دەڵێت:" **بەسروشت مرۆڤەکان وەکی یەکن، بەڵام بە ئەنجامدان جیاوازی گەورە دەکەوێتە نێوانیانەوە**".

## ٤١-سێ شێوەکەی ئامانج :

((هیچ شتێکی مەزن بەبێ کەسی مەزن بەدینایات، کەسانیش مەزن دەبن کەی ویستیان بەڕاستی مەزن بن))

**شارل دی گۆل**

کاتێك دەست دەکەیت بە وەرنامە داڕشتن لەبارەی جێبەجێکردنی ئامانجەکانتەوە ئەوا پێویستە جیاوازی نێوان ئامانجە کاتی و بەردەوامەکانت بکەیت. ئامانجی کاتی وەکو هەوڵدان بۆ کەمکردنی پێنج کیلۆ لە گۆشتی لەش یاخود هەوڵدان بۆ چنگ خستنی ئیشێکە و بە دەستکەوتنی کۆتایی پێدێت، بەڵام ئامانجی بەردەوام وەکو ڕێکخستنی سیستمی ژیان یان پلاندانان بۆ دهاتووی پیشەییت یاخود دامەزراندی پەیوەندییەکی هەمیشەییە ئەمە کۆتایی نایات، بۆیە وریابە و پێویستە ئامانجەکانت بەو شێوەیەبن کە بەدەستکەوتنی کۆتایی نەیات و هەمیشە پلانی ماوەدرێژ دابڕێژە.

**سێ شێوە سەرەکیەکەی ئامانج:**

**١-ئامانجی ماوە کورت:**

ئەم ئامانجە بەزۆری ماوەیەکی کەم دەخایەنێت لە ١٥ خولەکەوە دەست پێدەکات تاوەکو ساڵێك دەگرێتەوە. ئەم جۆرە ئامانجانە وەکو ئەوەیە کە: لە کۆبونەوەکاندا چی دەکەیت یاخود لەبارەی پرۆژەیەکەوە چی دەڵێی، یان ڕاپۆرتێکی گشتی چۆن بنوسی، خولێکی مەشقەوانی بتەوێت ئامادەی بیت، پشوویەك گەشتی تێدابکەی، بڕێك پارەی دیاریکراو بتەوێت بەدەستی بهێنیت...

ئەم جۆرە ئامانجە ماوە كورتانە بۆتـۆ زۆر نـاوازەن لـەبۆ ڕاهـاتن بـەرەو ديـاريكردنى ئامانجە مەزنەكانت.

## 2–ئامانجى ماوە ناوەندى:

ئەم جۆرە ئامانجە ماوەى يەك ساڵ بۆ پێنج ساڵ دەخايەنێت. لـەم ماوەيـەدا هـەوڵ دەدەيت كە بڕوانامەيەك بەدەست بێنى، يان پلەيەكى زانستى، ياخود هـەنگاو بـەرەو باشتركردنى دۆخى پيشەييت بنێى، ئەو ئۆتۆمبێلەى هەتـە بيگۆڕيت..ئامـانجى تـرى لـەم شێوەيە. ئەم جۆرە ئامانجە ماوە ناوەنديانە هۆكارێكن بۆ بـەردەوامى دان بـە ئامانجـە ماوە كورتەكان و هەنگاونان بۆ بەديهاتنى ئامانجى ماوە درێژ.

## ٣–ئامانجى ماوەدرێژ:

ئەم ئامانجە لـە ٢٥ سـاڵى داهـاتوودا بەردەست دەبێت و چنگ دەخرێت. ئامـانجى ڕێكخستن و نەخشەڕێژكردنى تەواوى ژيانتە، بۆنمونە: ديارى كردنـى ئـەو شـوێنەى تێيـدا دەژيت، پەيوەنديت ڕەگەڵ ژن يان خێزانەكەتدا.

ئێستايش باسى چۆنێتى بەكارهێنانى ئەم ئامانجانەنەت بۆ دەكـەم لەلايـەن خۆمـەوە، تاوەكو گەيشتم بە پلەى بەڕێوەبەرى گشتى:

## ئامانجى ماوەكورت:

- لەسـەرەتاوە لـە ئـوتێلێكى پێـنج ئەسـتێرەيى بـە قـاپ و دەفـر شـشـتن دەسـتم پێكرد.
- دەستم دايە خوێندن لەبارەى ئوتێلكاريەوە، ئەوجا پاشـى يـەك سـاڵ لـە كيوبـك بووم بەخاوەنى بڕوانامەيەك.

**ئامانجی ماوە ناوەندی:**

- ئامانجم بوو کە ببم بە بەڕێوەبەری بەشێك، بووم بە بەڕێوەبەری بەشی خۆراك و خواردنەوەی ژوورەکان.
- ئامانجم چنگ خستنی دبلۆم بوو لەبارەی ئوتێلەکانەوە چنگم خست.
- بڕوانامەی دبلۆم لەبارەی ڕەفتاری مرۆڤەوە بەدەست بێنم، بەدەستم هێنا.
- بە ئینگلیزی و فەڕەنسی بە پاراوی قسەبکەم، ئەمەش فێربووم.

**ئامانجی ماوە درێژ:**

- ئامانجم بوو ببم بە بەڕێوەبەری گشتی ئوتێلێك.. لەساڵی ١٩٨٧ دا بووم.
- سێ پۆست لە کارگێڕی ئوتێلێکدا بەدەست بێنم، دەستم خست.
- بەناوبانگ و ناسراوبم، بەخاوەنی خەلاتی زنیاری بم..لەساڵی ١٩٨٧ دا بووم بە خاوەنی بڕوانامەی باشترین خوێندکاری توێژینەوەی ماڵەوەیی لە دامەزراوەی ئەمەریکی بۆ ئوتێلکاری.

بەردەوامبووم لەسەر توێژینەوە و خوێندن و لەڕووی کارگێڕیشەوە پلەم باڵاتر دەبوو، تاوەکو بڕیارمدا کە کۆمپانیایەکی تایبەت بەخۆم دابنێم و سەرلەنوێ دەست پێبکەم، ئێستایش خاوەنی زانیاری و ڕێز و پلە و شارەزاییەکی زۆرباشم و دەتوانم لە ڕاستینەی خەونەکانمدا بژیم، سەرباری ئەوەی هەموو ڕۆژێك ئاستەنگە گرەوی خۆی پێبووە بۆمن ، بەڵام من گوێم لێ نەداون و بەدووی چارەیدا گەڕاوم. ئامانجەکان بەدی نایەن مەگەر هەوڵی تەواوی بۆ بدەیت و ئاوای کۆڵدان نەزانیت و ڕووخان و نەتوانینیش لەبیر بکەی.

واشەنتۆن ئیرڤینگ دەڵێت:" **ئاوەزی مەزن ئامانجی هەیە، بەڵام ئەوانی تر ئاواتیان هەیە)).** ئامانجت دەست نیشان بکە، نەخشەی بۆ دارێژە و مەهێڵە بە فیڕۆ بڕوات.
وینستۆن چرچڵ دەڵێت:" **هەرگیز خۆت بەدەستەوە مەدە، هەرگیز، نەکەیت خۆت بەدەستەوەبدەیت هەرگیز".**

## ٤٢-چۆن ئامانجەکانت دەست نیشان دەکەیت-سیازدە بنەما:

((بۆئەوەی بەختەوەری چنگ بخەین پێویستە دڵنیابینەوە لە بوونی ئامانجی مەزن))
**ئێریل نیتنگال**

### ١-بزانە چیت دەوێت:



دۆگلاس لۆرتم دەڵێت:" **کاتێك دیاری دەکەیت چیت دەوێت ئەوکات تۆ گرنگترین بڕیارتداوە لە ژیانتدا**"، لەپێشی هەر هەنگاونانێکدا دەبێت بزانیت چیت دەوێت" چونکە ئەمە گرنگترین ئەنگاوە بۆ بۆبەدیهاتنی ئامانجەکەت. هەموو مرۆڤێکی سەرکەوتوو لەسەرەتادا خەونی بینیوە، ئەوجا خەونەکانی دەخاتە بواری جێبەجێکردنەوە. کەواتە خەونی تۆ چییە؟ دەتەوێت چی بیت؟ دەتەوێت لەژیانتدا زۆرتر لەهەموو شتێك چی ئەنجامبدەی و بەدی بهێنیت؟ دەتەوێت پەیوەندی باشتر دابەستی؟ هاوسەرگیری باشتر، یان دەتەوێت کارێکی تایبەتی ئەنجامبدەی؟ گرنگ نییە چیت دەوێت، گرنگ ئەوەیە بزانیت و ڕەفتاربکەیت لەسەر ئەو بنەمایەی چیت دەوێت؟ وەك بنیس واتلی لە: کتێبەکەی((چێژی کار))دا دەڵێت:" **بۆئەوەی بگەیەیت بەشوێنێك پێویستە لەسەرەتاوە بزانیت تۆ بۆ کوێ دەڕۆی**".

### ٢-دەبێت ئامانجەکەت ڕاستەقینە و ڕوون و دیاری کراوبێت:

چیرۆکی ئەو پیاوەت لەبیرە کەلە پێشی ئاگردانێك دانیشت و بە ئاگردانەکەی دەگووت: گەرمیم پێ ببەخشە کۆترەدارت پێ دەبەخشم. سەرباری ئەوەی زۆر وەستا بەڵام هیچ گەرمییەکی چنگ نەکەوت، هەرچەندە ئامانجەکەی دەستکەوتنی گەرمی بوو،

کەچی لەبیری کردبوو پێویستە لەسەرەتادا ببەخشێت ئەوجا وەربگرێت، واتا ئامانجەکەی کەتواریانە نەبوو، بۆیە گرنگ نییە ئامانجت چییە پێویستە ڕوون و دیاریکراو و کەتواریانەبێت.

## ٣-ئارەزووی بەهێز:

جارێکیان گەنجێك لەبارەی نهێنیەکانی سەرکەوتنەوە لە دانایەکی پرسی، ئەویش قاپێکی پڕ لەئاوی ساردی هێنا و ئەوجا داوای لە گەنجەکەکرد لە ئاوەکە بڕوانێت لەکاتێکدا گەنجەکە لەئاوەکەی دەڕواتی داناکە سەری گەنجەکەی گرت و کردی بەنێو قاپەئاوەکەدا، لەسەرەتاوە گەنجەکە هیچ بەرگری نەنواندن، بەلأم دواتر دەستی دایە قورلەفرتکێ و کاتێك گەیشتە کەناری خنکان پاڵێکی بە داناکەوە نا و خۆی لێی ڕزگارکرد و دواتر بەسەریدا هاواری کرد و گووتی:

((ئەوەچیتە بۆچی وەهام لێدەکەی، دەتەوێت بم کوژیت؟)) .

داناکە بە پێکەنینەوە وەلأمی دایەوە و گوتی: (( لەمەوە چی فێربوویت؟))، گەنجەکەش گوتی: (( هیچ شتێك)).

داناکە گوتی : (( بێگومانم لەوەی شتێك هەر فێربوویت، لەچەند چرکەی سەرەتادا ویستت سەرکەوتووبیت لە خۆ لێ ڕزگارکردنم، بەلأم هاندەرت بەهێز نەبوو بۆ ئەم کارەت، بۆیە کاتێك وەخت بوو بخنکێیت پاڵنەری ڕاستەقینە و مەزنت لادروست بوو و هەموو هێز و هونەری خۆتت بەکارهێنا بەمەبەستی خۆڕزگارکردن. کوڕم لەمەوە فێربە کە نهێنی سەرکەوتن جولأنی ئارەزووی گڕگرتووە بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتن)) .

دەبێت بزانیت چیت دەوێت و ئامانجەکانیشت باوەکو بەهاداربن و هیچ کەسێك- تەنانەت خۆیشت-نەتوانێ ببێتە ڕێگرت لە بەدیهێنانی .

## ٤-وادانان و ئەندێشەكردن:



كاتێك بیرۆكەی ئـەوەت لـەلادا دەستەبەردەبێت كـە چـیت دەوێـت و ئـارەزووی گڕگـرت لـەلادا هەسـت پێكـراوە ئـەوا پێویسـتت بەوەیـە بیرۆكـەكانت بـەرەو ئـاوەزی هـەناویت ئاراسـتە بكـەیت. وادانـان هەڵقـەی پەیوەندی نێوان ئاوەزی هۆشیار و ئـاوەزی هەناوییـە. ئـالبێرت ئینشـتاین دەڵێـت:" **ئەندێشـەكردن لـە زانـین گـــرنگترە**"، جـــۆرج بێرنـــارد شـــۆیش دەڵێـــت:" **ئەندێشەكردن هـەنگاوی یەكەمـە بـەرەو داهێنـان**". بۆیـە بـە وشـیارییەوە ئامانجـەكانت ئەندێشەبكە و باوەكو هەمیشە لەپێش چاوانت بن و بیكە بەڕاستی ڕوون، تاوەكو بتـوانی ئامانجـەكانت بـە ڕوونـتر ببینـی و خـۆت ببینیتـەوە لـەوەی ئامانجەكـەت بـەدیهێناوە ئامانجەكانت بەرەو ئاستێكی قوڵتر لە ئاوەزی هەناوتدا ئاراستەدەبن و بەهێزتریش دەبن.

زانستی پشت سروست پێداگیری لەسـەر ئـەوەدەكات كـە: ئـاوەز وەكـو موگناتیسـە، كاتێك خۆت وەها دەبینیت كە ئامانجەكانت بەدی دەهێنیت ئـەوا خـەڵكی بۆخـۆت كێش دەكەیت، دۆخ و هەلۆیستەكانیشت بەشێوەیەك دەبێت وەك ئـەوەی ئامانجـەكانت بـەدی هاتبن و یارمەتیت دەدەن بۆ بەدیهاتنی. وریابە و بەباشـی ئامانجـەكانت لـە ئەندێشـەتدا ببینەوە بۆئەوەی بەڕاستی ببێتە بەشێك لەو كەتواریەی ژیانت.

## ٥-بڕیار:



بـاوەكو وەهـای دابنـێین كـەتۆ دەزانیـت چـیت دەوێـت و متمانـەت بەخۆتـە كـە ئامانجەكـەت ڕوون و دیـاریكراو و كەتواریانە و بەهادارە، هەروەها ئارەزوویەكی مـەزنت هەیـە بۆ بەدیهاتنی، دەتەوێت وەها خۆت ببینیتەوە كە تۆ بەڕاستی بەدیت هێنـاوە، ئێسـتایش

کاتی ئەوە هاتووە کە بڕیارێکی هۆشمەندانە بدەی و جارێ ئەوەبدەی کە تۆ هەوڵی بەدهاتنی دەدەیت. لەبارەی خۆشویستنی ئامانجەکانتەوە ئاگاداری دەورووبەرت بکەرەوە و لەبارەیەوە بۆیان بدوێ، دەبینی ئەوانیش بەپێی توانای خۆیان دەستی یارمەتیت بۆ درێژ دەکەن، لەبیرت بێت بڕیاردانت لەبارەی ئامانجەکانتەوە دیاری کردنی شێوازی چارەنوستە، ئەو ساتەی بە وشیارانەوە بڕیاری لێ دەدەی ئەوکات ڕێگەت بەرەو بەدیهاتنی ئامانجت دروست دەکەیت.

## ٦-دەبێت ئامانجەکەت بنوسیتەوە:

لی ئایا کوکا دەڵێت:" **نوسینەوەی ئامانجەکانت یەکەمین هەنگاوە بۆ بەدیهاتنی**".

براین تراس دەڵێ:" **شتەکە بە خامەیەك و کاغەز و تۆ دەست پێدەکات**".

کاتێك دادەنیشی بۆ نوسینەوەی ئامانجەکانت ئەوا دوو هێزی مرۆییت بەکاردەخەیت:

أ-ئەندامەکانی لەشت..تۆ خامەیەك بەدەستەوە دەگریت و دەستەکانت دەجولێنیتەوە.

ب-چڕبیرکردنەوەی هزری..تۆ بیر لە ئامانجەکانت دەکەیتەوە دەیان بینیت، لەسەر پارچە کاغەزێك دەیان نوسی و دەیان خوێنیتەوە، لەم کاتەشدا هەست بە دووبارە بوونەوەی دەنگی خۆت دەکەیت لە هەناوتەوە و هەموو هەستەکانت دەوروژێنێ و هەموو هەستەکانت لە لوتکەدا دەبن، بەم هەنگاوەت شەقاوێکی تر لە بەدیهێنانی ئارمانجەکەت نێزیك کەوتویتەوە.



## ٧-کات بۆ ئامانجەکەت دیاریبکە:

ئامانج بەبێ کاتی دیاریکراو هیچ نییە جگە لە ئاوات، دەتوانی یاری تۆپی پێ گریمانە بکەی بەبێ بوونی کاتی دیاریکراو؟ یاریکارەکان

بەردەوام دەبن لەسەر یاریكردن و یاریەكەش هەر كۆتایی نایات!! ئەوكاتـەی وەختێكـی دیاریكراو بۆ بەدیهێنانی ئامانجەكەت دەست نیشان دەكەیت تۆ دەبیتە خاوەنی پابەنـدی و هاندانی بەهێز بۆ بەكەتواری بوونی ئامانجەكانت لەم ماوەیەدا. گەر گرنگ ئەوەبێت كـە پلان بۆ بەدیهاتنی ئامانجەكەت دابنێی ئەوا گرنگ ئەوەش دەبێـت كـە كاتێـك دیاریبكـەی كە بە شێوەیەكی كەتواریانە هەوڵی بەدیهاتنی بدەی و لەم كاتەدا تواناداربیت بـۆ كردنـی خەونەكانت بە ڕاستینە.

## ٨-سامانت بزانە:

سامانەكانت چین؟ چی شتێك دەبەخشیتەوە؟ سامانەكانت هەرچییەك بێت لەو چـوار بەشەی كـە ژیانـت پێكـدەهێنن: زانیاریـت، شـارەزاییت، یارمـەتی هاوڕێیـەكت، خێزانـت، دۆخی داراییت، كام لەمانە دەتوانێت یارمەتیت بدات بۆ بەدیهاتنی ئامانجەكانت؟

لیستێك بەناوی هەموو ئەو كەسـانە بنوسـەرەوە كـە توانـادارن بـۆ یارمـەتی كردنـت و ئەوانەشی دەستەلآتت بەسەریاندا نییە، هەموو ئەو سامانانەی هەتـە و پێویسـتت پێیانـە بۆ بەدیهاتنی ئامانجەكەت بیان نوسەرەوە.

## ٩-لەمپەرەكانی ڕێگەت بزانە:

گەشتیارێك ڕووی لە كەناراوێك كرد و دیتـی ڕاوچییەك بـە قـولاپ ڕاوەماسـی دەكـات، ماسی گەورە ڕاودەكات پاش پێوانی فرێی دەداتەوە ناو ئاوەكە! بەلآم بچكۆلانەكان فرێ ناداتـەوە!! گەشـتیارە زۆری سـەیر لێهـات، بۆیـە هۆكارەكـەی لـە ڕاوچییەكە پرسـی، ئەویش لەوەلآمدا گوتی: ئەو تاوەیـەی مـن هێنـاومـە تـەنها دەتوانێـت ماسـییەكی بیسـت سانتیمەتری تێدا ببرژێنی و لەوە گەورەتربێت بەكەڵكی من نایات. ئەم ڕاوچـییە كێشـەی خۆی بەباشی دەزانی و لەبری ئەوەی هەوڵی چارەكردنی بدات كەچی ماسـیە گـەورەكانی لەدەستی خۆی دەدا.

زۆرێك لە کۆمپانیاکان توشی مایەپووچی دێن و هاتوون" بەهۆی نەزانین بۆ چارەکردنی ئەو کێشانە یاخود پێشبینی نەکردنییەوە. بۆیە کە بیرۆکەیەکت بۆدێت بزانە چی شتێك کاریگەر و لەمپەری ڕێگەتە و کەئەمەت زانی دەستەوەستان مەوەستە و بەدووی چارەدا بگەڕێ .

بەمەش دەبیتە خاوەنی ڕێگە و ئامرازی پێویست بۆ بەرگری لەخۆکردن لەبەرامبەر هەر کێشەیەکدا کە دووچارت دەبێتەوە، تیری بیسۆڵ دەڵێت:" **پەند لەوەدا نییە کە چەند جار لەژیاندا پشتت لەزەوی دراوە، بەڵکو پەند لە جارەکانی هەستانەوەتە پاش ئەوەی پشتت لەزەوی دراوە"** .

**١٠-کردار:**

کەسێك دەناسیت بزانێت چی دەوێت و کەی دەیەوێت؟ تێیشت دەگەیەنێت کە چۆنی بەدەست دەهێنێت، بەلأم هیچ شتێکی لەبارەوە ناکات.

لە وانەیەکمدا لە مۆنتریاڵ ٢٠ دۆلاریەکم لەگیرفانم دەرهێنا و لە ٢٠٠ بەشداربووم پرسی کە کێ دەیەوێت بەخاوەنی ئەم پارەیەبێت؟ هەموان دەستیان هەڵبڕی، تەنها یەك کەس نەبێت کە دەستی هەڵنەبڕی بەلأم هەستایە سەرپێ و بەناو هەمواندا هات و پارەکەی لێ سەندم، هەموان سەیریان لێ دەکات! منیش گوتم: (( ئەمەیە کردار،دەبێت ئەو کارە ئەنجام بدەیت کە دەتەوێت، نەوەك تەنها هیوای بەدیهاتنی بخوازی))، هەموان دەستیان دایە پێکەنین و منیش لەو کاتە بەدواوە بڕیارمدا چیتر پارە بۆ ڕوونکردنەوە بەکارنەهێنم.

پلاندانان کارێکی باشە و دیاریکردنی ئامانجەکانیش مەزنە، بەلأم گەر پلانەکەت نەخەیتە بواری جێبەجێ کردنەوە و نەیکەیت بەکردار ئەوا هیچت دەست ناکەوێت. ئالان کۆکس دەڵێت:" **دەزانم کە خەونەکان پێویستن، بەلأم ڕێگەی جێبەجێکردن و بەدیهاتنی ئەم خەونانە ئەوە دەست نیشان دەکەن کە ئایا ئەم خەونانە بەدیدێن یاخود نا"**،

ئەرستۆیش ئێژێت: " **مرۆڤ بنچینەی کردارەکانیەتی**"، بۆیە لەم ساتەوە دەستبکە بە جێبەجێ کردنی پلانەکانت و دواتر دەبینی کە بەختەوەر و خۆشحاڵیش دەبیت.

## ١١-هەڵسەنگاندن:

پیاوێك ویستی بگاتە لوتکەی چیایەك بۆئەوەی هەندێك وێنەی یادگاری لەوێدا بگرێت، ئەم کارەی یەك ڕۆژی خایاند، کاتێك گەیشتە لوتکەی چیاکە تەواو ماندووو ببوو، دیتی کابرایەکی چینی لەوێیە، بۆیە لێی نێزیك کەوتەوە و دەستی دایە گازندەکردن لەوەی تاوەکو گەیشتۆتە ئەم لوتکەی چیایە زۆر ماندوو بووە، کابرای چینی پێکەنی و گوتی:" گەر جارێکی تر ویستت بەسەر ئەم چیایەدا سەربکەویت، ئەوا بڕۆرە ئەو لایەکەی تری چیاکە، لەوێدا ترامێك دەبینی کە بە یەك دۆلار تاوەکو سەر ئەم چیایە دەتهێنێ"، وەك دەبینی ئەم کابرایە بەهۆی ئەوەی بەهەڵە بەدیهێنانی نەخشەکەی خەملاندبوو بۆیە ڕێگەی هەڵەشی گرتبوو، کاتی زۆر کوشتبوو، وزەشی کەمی کردبوو.

مەبەست لێرەدا زۆر ئاسان و ڕوونە، کاتێك ویستت نەخشەیەکت بکەیتە کردار لەچەند لایەکەوە هەڵسەنگاندنی بۆبکە و چی پێویستی بە گۆڕان بوو بیگۆڕە، ئەمە باشترە لەوەی لەدوا دوایدا توشی پەژیوانی و داڕووخان ببیتەوە.

## ١٢-کشۆکی(مرونەت):

یەکێك لە کلیلە سەرەکییەکانی سەرکەوتن کشۆکییە. کشۆکی توانایی تۆیە بۆ ئەنجامدانی چاکسازیی و گۆڕانکاری لە نەخشەکەتدا، هەروەها جوڵانە بەدەسوبرد و خێرایی و هەوڵدانە بۆ ئەنجامدانی کاری نوێتر بۆئەوەی بەئامانجەکەت بگەیت.

## ١٢-پێداگیری-سوربوون:

کالۆنی کۆلید دەڵێت:" **هیچ شتێك لەم جهانەدا ناتوانێت جێگەی پێداگیری بگرێتەوە، تەنانەت بەهرەش ناتوانێت"**. هیچ شتێك لەم جهانەدا لە پیاوانی ناسەرکەوتوو باوتر و دیارترنییە کە خاوەنی بەهرە و ژیری و زانیارین، کەچی شکست خواردووشن جهان، پڕیەتی لە تاوانبارانی خوێندوار، ئەوە تەنها پێداگیری و هەتەریی(عەزیمەت)ە کە هێزی ڕەها بەمرۆڤ دەبەخشن.

من بڕوام وەهایە کە **ڕێگەی سەرکەوتن هەمیشە لەژێر دروستکردندایە**. واڵت دیزنی پابەند بووە، بۆیە ئێستا تۆ سەرزەوینی خەونەکانی دەبینی" دیزنی لاند، هەروەها تۆماس ئەدیسۆن یش پابەند بووە، بۆیە خەونەکانی کرد بە ڕاستی، تۆیش دەتوانی خەونەکانت بەدی بهێنی، پابەند و سوربە لەسەر بڕیارەکانت و مەهێڵە هیچ شتێك بێتەلەمپەری بەدیهاتنی ئامانجەکانت" ئەو ئامانجانەی تۆ دەتوانی بەدییان بهێنیت.

# ٤٣-چۆن ئامانجەکانت بەدی دەهێنیت؟

((ئێمە دەژین نەوەك بەوشێوەیەی هیوای بۆ دەخوازین، بەڵکو بەوجۆرە دەژین کە دەتوانین بژین))

**میاندر**

### ١-ئامانجەکانت بنوسەرەوە:



ئەو ئامانجانەت لەسەر لاپەڕەیەك بنوسەرەوە کە دەتەوێت بەدییان بهێنیت، پێویستە هەرئامانجێکت تایبەت بێت بە بەشێك لە چواربەشەکەی ئامانجی ژیان:

کەسێتی،پیشەیی،تەندروستی،دارایی، ئەم لاپەڕەیە باوەکو هەمیشە لە گیرفانتدابێت، هەرکاتێك بەیانیان بەئاگا هاتیەوە بیخوێنەرەوە، کاتێك بۆکار دەڕۆی، بەرلەوەی بنوی بیخوێنەرەوە، کەی ویستت بیخوێنەرەوە.

### ٢-وای بێنەپێشەچاوی خۆت بەدیت هێناوە:

ڕۆژانە سێ جار ئامانجەکانت یادی خۆت بخەرەوە. بەیانیان، دوای نیوەڕوان، شەوان، پێشنیارت بۆ دەکەم بەم شێوەیە ئەنجامی بدەی:

١) جێگەیەکی هێمن و ئاسودەبەخش و گونجاو بۆ حەسانەوە دیاریبکە.

٢) بەهێمنی هەناسەبدە، چوار جار هەناسەوەربگرە و ئەوجا بە چوارجاریش دەری بکەرە دەرەوە.

٣) چاوانت دابخە و وەهای بێنە پێشەچاوی خۆت کە ئامانجەکانت بەدی هێناوە، هەوڵبدە بە ڕوونی ئەمە ببینی. لەبیرت بێت ئەو ئامانجەی ئاوەزی هەناوی وەری دەگرێت و وەرنامەڕێژی بۆ دەکات، کاردەکات بۆ سازاندنت ڕەگەڵ جهانی دەرێ و تایبەتیتدا.

٤) چاوانت بکەرەوە! وێنەیەك لەپێش چاوت دروستبکە وەك ئەوەی خەونەکەت کردبێتە کردەی کەتواری و هەست بە جێبەجێ بوونی بکەیت. تاوەکو جوانتر ئەم وێنەکردنەت ببینی باشتر و خێراتر دەتوانی ئامانجەکانت بەدی بهێنیت.

## ٣-دووپاتی:

هەموو ڕۆژێك دووپاتی ئەرێیی بۆ ئاوەزی هەناویت بهەنێرە و هێزی دووپاتی بقۆزەرەوە بۆ هاندانی ئەم وەرنامەیەت و ئاراستەکردنی بەرەو ئاستێکی قوڵتر لەئاوەزی هەناویت، لەبیرت بێت کە دووپاتییەکانت پێویستە بەشێوەی ئەرێیی داهاتوویی بێت.

بۆنمونە:

((دەتوانم کام ئامانجم بوێت بەدی بهێنم. من بڕوام بە تواناکانمە بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتنم)).

## ٤-ڕەفتاربکە وەکو ئەوەی کە:

ڕەفتاربکە وەکو ئەوەی ئامانجەکانت بەدی هێناوە، قسەبکە و هەناسەبدە و بجوڵێرەوە بەشێوەیەك وەکو ئەوەی شکستت نەکردەیی بێت(( وەك ئەوەی سەرکەوتنت مسۆگربێت)).

وەها ڕەفتاربکە وەك ئەوەی ئامانجەکانت هەرئێستا بەدی هاتوون. تۆ بەڕاستی دەبیینی، ئەمەش پەیوەستە بەکاتەوە بەرلەوەی بەدی بێنی. کاتێك لەتەمەنی شەش ساڵیدا بووم، خەونم بەوەوە دەبینی کەببم بە بەڕێوەبەری گشتی میوانخانەیەکی گەورە،

پاشی ئەمە هەمیشە وەکو بەڕێوەبەری میوانخانەکان لەگەڵ هاوڕێکانمدا ڕەفتارم دەکرد و گوتەم دەردەبڕی و بە ڕێگەدا دەڕۆیشتم، زۆر پێم پێکەنین، بەڵام من توانیم بۆیان بسەلمێنم و لەساڵی ١٩٨٧ دا بووم بە بەڕێوەبەری گشتی یەکێك لە گەورەترین ئوتێلە پێنج ئەستێرەییەکانی مۆنتریال-کەنەدا.

وەکو ئەوەی بەڕێوەبەری گشتی بم وەها ڕەفتارم دەکرد بۆیە بووم بە بەڕێوەبەری گشتی ئوتێلێکی گەورە. توانیم سود لە دەستەواژەی (( وەکو ئەوەی)) بەکاربێنم، تۆیش دەتوانی کەڵکی لێ ببینی و دواتر دەبینی کە چۆن بە ئەنجامەکان سەرت سوڕدەمێنێت.

## ٥-بیرۆکەی یەك ئینج:

هەوڵبدە هەموو ڕۆژێك شتێك ئەنجامبدەی بۆئەوەی یەك ئینج لە ئامانجەکەت نێزیکت بکاتەوە.

## ٦-شێوازی من بەرپرسیارم بەکاربهێنە:

بیرۆکەی ئەوەی کە بەشێکی لەکێشەکان دەست لێ هەڵبگرە! هەوڵی دۆزینەوەی بیانو مەدە و گەر کێشەیەك ڕوویدا مەیخەرە ئەستۆی هیچ کەسێکی تر، بەڵکو خۆت بەرپرسیارێتی کێشەکانی خۆت هەڵبگرە و بەدووی چارەی گونجاودا بگەڕێ و سودیش لە ئەزمونە هەڵەکانت وەربگرە بۆئەوەی پێچەوانە ڕاستەکەی ببینی.

گەر سەرزەنەشتی ئەوانی تربکەی ئەوا تۆ هەرگیز ناتوانی توانا شاراوەکانت بەکاربێنی، بەڵام کاتێك بەرپرسیارێتی تەواوی کێشەکانت لەئەستۆی خۆت دەگریت ئەوکات دەتوانی چارەسەریش بدۆزیتەوە و دەبیتە داهێنەر و سەرکەوتووتر لەچاو هەرکاتێکی تردا.

ئێستا بەتەواوەتی بویتە بەخاوەنی بیرۆکەی گونجاو لەبارەی چۆنێتی دەست نیشانکردنی ئامانجەکانت و بەدیهێنانیەوە، بۆیە لەمرۆوە دەساپێبکە و هەنگاوی گونجاوی بۆ بنێ و ببەرە بەشێك لەو کەمینەیەی سەرزەوی کە خاوەنی ئامانجی دیاریکراون و کار بۆ بەدیهاتنی دەکەن، مەبەرە بەشێك لەو زۆرینەیەی کە گازندە دەکەن و هەمیشە دەنالێن و هیچیش بۆ ڕزگاربوون ناکەن. هۆراس دەلێت: **" مرۆڤ نازانێت چی دەتوانێت، تاوەکو هەوڵی بۆ نەدات".** دەست پێبکە و هەوڵبدە و چێژ لە سەرکەوتنی تەواو وەربگرە.

**(( خەون بینین بەوەی خەونی پێوە دەبینی جوانی ئاوەزی مرۆڤە، ئەنجامدانی ئەوەی دەتەوێت ئەنجامی بدەی هێزی خوازویستنی مرۆڤە، متمانە بەخۆت بکە لەهەڵبژاردنی تواناکانتدا ئەمەش زیرەکی و بوێری مرۆڤە بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن))**

**بێرنارد ئادمۆندس**

# ٤٤-سودەکانی دیاریکردنی ئامانجەکان لەبواری کاردا:

((هیچ شتێك نییە لەژیاندا لێی بترسین بەڵکو شت گەلێك هەن لێیان تێناگەین))

**مەدام کۆری**

لەبواری کاردا پیاو هەمیشە هەوڵی زۆر دەدات بۆ ڕاگرتنی دڵی کڕیاران ئەگینا وەها نەبێت مرۆڤ کاری دەوەستێت.

**ئەی چی دەربارەی کڕیارانی دامەزراوەکەت؟**

**چی دەربارەی:**

١- سەرۆکت .

٢- کارمەندانت.

بەڵێ ئەوانیش کڕیارن، گەر قایلمەندییان بەدەست نەهێنی ئەوان کارت دەکەنەسەر و نواندنت بەلاڕێدا دەبەن و ڕەنگە کاریش بکەنەسەر داهاتووی خۆت و دامەزراوە یان کۆمپانیاکەشت و بەفەتارەتێکتدا بەرن.

-هەلی ئەوەم بۆ ڕەخسا کەلەگەڵ هەزاران کەسدا کاربکەم، سەدان کۆمپانیا و دامەزراشم تەی کردووە، ئەمەش یارمەتی باشی دام بۆ فێربوونی شێوازی کارکردنیان، بۆم دیارکەوت کەزۆرکەس نازانن چۆن سەرۆك و کارمەندانیان قایل بکەن، ڕەنگە هەموو شتێك ئەنجام بدات بۆ قایلکردنی دڵی سەرۆکەکەی، بەڵام ناتوانێت و بەو شێوەنابێت کە سەرۆکی دەیەوێت، ئەمەش بۆخۆی بەنەرێنی کار لە ئیش و پێگەکەت دەکات. بۆئەمەش دەبێت لەبارەی ئامانجی گەورەی کۆمپانیاکەوە لە سەرۆکەکەت بپرسیت و هەروەها بۆ قایلکردنی کارمەندانت ئامانجی کۆمپانیەکەیان بۆ ڕوون بکەرەوە. ڕەنگە ئێستا لەخۆت

بپرسیت: ئێستا من چۆن دەتوانم ئەمە ئەنجام بدەم؟ سودی پشت ئەمە چییە؟ بۆئەمەش وەڵامەکە بەم شێوەیە دەبێت:

(أ) هەرئێستا پەیوەندی بە سەرۆك کارەکەتەوە بکە و دوای لێبکە کە بەتایبەت بۆ نانی نیوەڕۆ ببینی، بۆئەوەی کەس نەتوانێت قسەکانت بپچڕێنێت.

(ب) پرسیاری لێبکە لەبارەی ئامانجی ماوە کورت و ماوەدرێژی کۆمپانیاکە و هەوڵبدە بیانوسیتەوە.

(ج) تۆیش ئامانجەکانی خۆتی بۆ بخەرە ڕوو، داوای ئامۆشیاری لێبکە.

## لێرەدا سودەکانی پشت ئەمەت بۆ دەخەمەڕوو:

١- ئەمە وەها لەتۆ و سەرۆکەکەت دەکات ببنە یەك دەستە و کاربۆ بەدیهاتنی ئامانجەکانتان بکەن.

٢- پەیوەندی تۆ و سەرۆك کارەکەت باشتر دەبێت.

٣- ئەمە هانی ئەویش دەدات بۆ هاندانی لەبۆ ئەوەی یارمەتی تۆیش بدات بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکانت و ئەمەش دەبێتە بەشێك لە نەخشە ڕێگەی سەرکەوتنتان.

٤- ئەمە وەهات لێدەکات بە هەڵەکانی خۆتدا بچیتەوە و کاربۆ بەدیهاتنی ئامانجەکانت بکەیت.

وەك دەبینی سودە مەزنەکان و ئەوەشی پێویستت پێیەتی لەم کاتەدا بریتییە لە پاراستنی وشەکانی سەرۆکەکەت و هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی بەشێوەیەکی ڕێکخراوانە.

ئێستایش باوەکو بەرەو ئەندامانی دەستەکەت هەنگاوبنێین، ئەوانەی کە پێویستیان بە یارمەتی و پشتگیری تۆ هەیە:

## چۆن دەتوانی دیاریکردنی ئامانجیان ڕەگەڵ بەکاربهێنی؟

١. کۆبوونەوەیەك لەگەڵ کارمەندانتدا ڕێکبخە.

٢. لەم كۆبونەوەيەدا كردارەی دانان و دیاریكردنی ئامانجیان بۆ ڕوون بكەرەوە و داوا لەهەر كەسێك بكە بیرۆكەی تایبەتی خۆی بخاتەڕوو.

٣. پاشی دوو هەفتە كۆبوونەوەیەكی بەدواداچوونی ڕێكبخە.

٤. لەم كاتەدا باسی ئامانجەكانی كۆمپانیاكەیان بۆ بكە:

٥. هەلێكیان پێبدە بۆ پێشكەشكردنی ئامانجەكانیان.

٦. هەموو ئامانجێك پوخت بكەرەوە.

٧. هەندێك ئامانج بۆ دەستەی كاركەرانت دیارییبكە.

٨. كاتێك بۆ بەدهاتنی دیاری بكە.

٩. ئامانجەكانت بە تەواوەتی تۆماربكە و لەبەرگیراوەی بەهەموو كارمەندانت ببەخشە.

١٠. بەدواداچوون و هەڵسەنگاندنی كشۆكیش لەبیر نەكەیت.

### سودەكانی دیاریكردنی ئامانجەكان بۆ دەستەی كاركەرانت بریتی دەبێت لە:

١- پەیوەندی باشتر.

٢- هاندانی خاستر.

٣- متمانە بەخۆكردن بە چاكتر لە دۆخی پێشتر.

٤- دەرئەنجامی باشتر.

بە شێوەیەكی تایبەتی چاوپێكەوتن لەگەڵ هەموو كارمەندانتدا بكە و یارمەتییان بدە بۆ بەدیهاتنی ئامانجەكانیان و بەدرێژایی ڕێگەیان هان و كرمەیان بدە.

گەر یارمەتییان بدەیت بۆ بەدیهاتنی ئامانجە تایبەتیەكانیان ئەوانیش كۆمەكیت دەكەن بۆ بەدیهاتنی ئامانجە تایبەتیەكانت. ئێستا دەتوانی بۆخۆت ئامانجە مەزنەكانت ببینی. بۆیە هەرئێستا تۆیش ئامانجەكانت دیارییبكە و هەوڵی كردنە كرداریان بدە لەكاتێكی دیاریكراودا و دڵنیاشبە لەوەی هیچ زیان ناكەیت.

**((ڕێگەی هەزارمیل بەیەك هەنگاو دەست پێدەکات))**

**تاوتسۆ**

لەم بەشەدا چی پێویست بوو لەبارەی ئامانجەوە، بەتازە و کۆنەوە بۆم بەردەست خستیت، ئەوەی ئێستا لەسەر تۆیە ئەوەیە کە ئامانجەکانت بخەیتە بواری جێبەجێ کردنەوە. هەرچی گومان و خۆبەکەم زانی هەیە لەپشتەوەت فڕێی بدە. جۆن هـای ژد دەڵێـت:" **مـرۆڤ دەتوانێـت ئەسـپ بباتەسـەر کانیـاو بـەڵام ناتوانێـت بـەزۆر ئـاوی دەرخواردبـدات**"، بەنەرمـە نـەرم دەسـت پێبکـە و وردە وردە خوازویسـت(ئیرادە) و توانایيت فراوانتربکە، هەروەها های ژد دەشڵێت:" **ئەنجامی باش لە دەسپێکی باشەوە سەرچاوە دەگرێت**" ، بیرۆکەی ئەمرۆت دەبێت بە نوێنەری کاراکتەری سبەیت. ئەرستۆ دەڵێت:" **ئەوەی تایبەت بێت بە بالآییەوە ناسینی بەس نابێت، بەڵکو پێویستە زانیاری فراوان بەدەست بخەیت و هـەوڵی بـەکارهێنانی بدەی**" ، بۆیـە ئـەو گروەوەئاستەنگانەی کەلەپێشتن بۆ بڕینی پێویستت بەوەیە هەرئێستا دەست پێبکەیت، هـەر ئێسـتا. چـی درۆیـەکی گەورەیـە کاتێـك مرۆڤێـك دەڵێـت: سـبەی دەسـت پێدەکـەم وئـەنجام دەدەم! خۆمنیش دەزانم سبەی ڕۆژێکی نوێیە، بۆیە هەرئێستا تەلەوزوێنەکەت بکوژێنە و کاغـەز و پێنوسێك بێنە و دەست بەم گەشتەت بکـە، لـەبیرت بێـت کـە تـەنها یـەك ژیانـت هەیـە بۆئەوەی پێی بژیت، بۆیە چێژی لێوەربگرە و خەم بۆ نادیار مەخۆ و بزانـە چـی مرۆڤێـك کردبێتی بۆتۆیش کردەییە.

## ٤٥- هەوڵدانی کەسێتی بۆ دیاریکردنی ئامانجەکان:

لەژێر هەربەشێکی چواربەشەکەی ژیاندا ئـەو شـتانە بنوسـەرەوە کـە دەتـەوێت بەدیبهێنیت .

ئێستا، بەپێی گرنگییان دیسانەوە ئامانجەکان دابڕێژەرەوە.

**لیستی خەونەکان کەسێتی :**

.................................
.................................
..............................

**پیشەیی**

.................................
.................................
..............................

**تەندروستی**

.................................
.................................
..............................

**دارایی**

.................................
.................................
..............................

**لیستی لەپێشییەکان کەسێتی :**

.................................
.................................
..............................

**پیشەیی**

.................................
.................................
..............................

**تەندروستی**

.................................
.................................
..............................

**دارایی**

.................................
.................................
..............................

# جێبەجێکردن.. جێبەجێکردن.. جێبەجێکردن

## Action

بۆهەر بەشێکی ژیانت ئامانجێك هەڵبژێرە و بزانە بۆچی دەتەوێت بەدی بێنی و چۆن و کەی بەدی دەهێنیت؟

| ئامانجەکەم | بۆچی | چۆن بەدیدێنم؟ | کەی ؟ |
|---|---|---|---|
| کەسێتی | ................ | ................ | ................ |
| پیشەیی | | | |
| تەندروستی | | ................ | ................ |
| دارایی | | ................ | ................ |

**بەدیهاتنی ئەم ئامانجانە چۆن ژیانی پێش خستم ؟**



١- ..............................................................

٢- ..............................................................

٣- ..............................................................

٤- ..............................................................

**هەرئێستا بڕیاری دیاریکردنی ئامانجەکانی ژیانت بدە.**

# کلیلی حەوتەم

## بەکارهێنانی کات..

## بەهای ڕاستەقینەی ژیان



((کات ئەو تاکە شتەیە مرۆڤ هەمیشە هەوڵی کوشتنی دەدات، بەڵام ئەنجامەکە هەمیشە ئەوە دەبێت کە کات مرۆڤ دەکوژێت))

**هێربرت سبنسر**

## ٤٦-بۆچی خەڵکی کاتی خۆیان بەفیڕۆ دەدەن؟

((گەر خولەکێکت بەفیڕۆدا ئەوا یەك کاتژمێرت بەفیڕۆداوە، گەر کاتژمێرێکت بەفیڕۆدا ئەوا ڕۆژێکت لەکیس داوە، گەر ڕۆژێك لەدەست چوو ئەوا هەموو ژیانت لەدەست دەرچوو))

**برایان تراس**




کات پارەیە، کات زێڕە، کات ژیانە. کاتێك کاتت بەفیڕۆ دەدەی ژیانت بەفیڕۆ دەدەی، کات تاکە شتە تاوەکو لەژیاندایین خاوەنین.

بنیامین فرانکلین جارێکیان گوتی: "**کاتێك لەدەست چوو هەرگیز ناگەڕێتەوە**"، گەر کات بەم شێوەیە گرنگ و پێویستە، گەر کات تاکە شتە کە مرۆڤەکان بێ جیاوازی لە ژیاندا خاوەنین، کەواتە بۆچی مرۆڤ لە بەفیڕۆدانی کاتی بەردەوامە؟ ئایا بەهۆی ئەوەیە کە گرنگی نادات بە کات و ئەو شێوازەی کاتەکەی تێیدا بەسەر دەبات؟ یاخود بەهای کات نازانێت؟ وەڵامەکە ئاسانە: مرۆڤەکان گرنگی بە کات و چۆنێتی بەسەربردنی دەدەن، بەڵام نازانن چۆنی بقۆزنەوە، هیچ ئامانجێکی دیاریکراویان نییە هانیان بدات و بیان وروژێنێت، لێرەدا مەبەستم لە هیچ ئامانجێك نییە بەڵکو مەبەستم ئامانجێکە هانی کەسەکان بدات بەیانیان زوو بەئاگایان بێنێتەوە و هانیان بدات بۆئەوەی تا درەنگانێك سەرقاڵبن و نەنون، ئامانجێك جۆرێتی ژیانیان بەرەو باشتر بگۆڕێت، تاکی ئاسایی لە هەڵقەی ڤالادا دەخولێتەوە، بەیانیان زوو بەئاگا دێتەوە و شەڕی ڕێگاوبان دەکات بۆ ئەوەی بەخێرایی بگاتە سەر ئیشەکەی، ئەوجا بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ و خۆراك بخوات، سەیری تەلەوزوێن بکات، ئەوجا بنوێت، سبەی دواتر بەئاگا بێتەوە و دەستبکاتەوە بە ڕۆیشتن بۆ سەرکارەکەی، بەمەش لە خولانەوە لەنێو بازنەی ڤالادا بەردەوام دەبێت، ئەم

كەسە بەردەوام گلەيي دەكات لەوەى كە ژيان دادوەرانە نييە، ئەمە كات بە كەم دەزانن و گازەندەى ئەوەيش دەكەن كە كاتى تەواويان نييە بۆ ئەنجامدانى كاروبارەكانيان.

كاتێك دەستم كرد بە نوسينەوەى ئەم كتێبە لێكۆڵينەوەييەم، بەشێك لە نەخشەى نوسينەوەكەم لەسەر بنەماى چاوپێكەوتنى ٢٣٥ بەڕێوەبەر دامەزرابوو، لەئەنجامى ئەوەشدا :

هەستام بە ئەنجامدانى چاوپێكەوتن لەگەڵ بەڕێوەبەرى گشتى كۆمپانيايەكى گەورەى بەڵێندەرايەتى لە مۆنتريال و لێم پرسى كە: هەرگيز مۆڵەتى ئاسايى وەردەگريت؟ گوتى:" چى؟ مۆڵەت! گاڵتە دەكەيت؟ وا بۆ ٤ ساڵ دەچێت هيچ مۆڵەتێكم وەرنەگرتووە!"، لێم پرسى بۆچى؟ گوتى :" چى پرسيارێكى گەمژانەيە، من بەوپەڕى تواناوە كاردەكەم و خۆم ماندوو دەكەم و گەر وەها نەكەم كۆمپانياكەم شكستى تووش دەبێت"، منيش پێم گوت:" بۆچوونەكەت جوانە، بەڵام گەر وەها بەردەوام بيت ئەوا خۆت تەواو دەبيت لەبرى كۆمپانياكەت!".

بەڕێوەبەرێكى تر گوتى:" قسەكردن لەبارەى بەكارخستنى كاتەوە ئيشێكى ئاسانە، بەڵام گەر تۆ لەجێگەى من بيت دەبينى كە ٢٤ كاتژمێر بەس نييە بۆ ئەنجامدانى هەموو ئەوانەى مەبەستمە، من پێويستم بە كاتى زيادترە!".

بەڕێوەبەرێكى تر داهێنانانە گوتى:" ئايا دەزانى سەربارى ئەو هەموو يارمەتييەى تەكنەلۆژيا پێشكەشمان دەكات لە، كۆمپيوتەر و مۆبايل و هيتر كەچى من هێشتاكە پێويستم بە كاتى زيادترە بۆ ئەنجامدانى كارەكانم".

سەد خۆزگە تۆيش برۆى گوێ لەبۆچوونى هيتر بگريت، ئێستايش باوەكو گوێ لە بۆچوونى شارەزايانى كات بگرين. لە پەڕتووكى : ((چۆن بەسەر كات و ژيانتدا زاڵدەبيت؟)) دا ئيليان ئالكن شارەزا لە بەكارخستنى كات و خاوەنى پڕ فرۆشترين كتێبەكان دەڵێت:" **هيچ شتێك بەناوى كەمى كاتەوە بوونى نييە، هەمووومان وەكو يەك كاتمان هەيە، كاتى تەواومان هەيە بۆ ئەنجامدانى ئەوەى دەمانەوێت و مەراممانە**".

مارتن فۆرتینۆی شارەزای بواری کات بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ خەریکی لێکۆڵینەوەبوو لەبارەی ئەوەی کە مرۆڤی ئاسایی چۆن کاتەکانی بەسەر دەبات، لەئەنجامدا گەیشت بەوەی کە: مرۆڤی ئاسایی حەوت ساڵ لە سەرئاو وگەرماودا بەسەردەبات، شەش ساڵ بە خۆراک، پێنج ساڵ لە ریزەکاندا چاوەڕوان دەبێت، سێ ساڵ لە چاوپێکەوتن و کۆبوونەوە، ساڵێك بەدووی شتەکاندا دەگەڕێت، ٨ مانگ وتاری نەشیاو دەست پێدەکات و لەبەرخۆیەوە دەیڕێسێت، شەش مانگ لەپێش ڕوناکیە سورەکەی هاتوچۆدا چاوەڕوان دەبێت، ١٢٠ کاتژمێر ددانەکانی دەشوات، ڕۆژانە ٤ خولەك لەگەڵ ژنەکەیدا قسەدەکات، ٣٠ چرکە ڕۆژانە لەگەڵ منداڵەکانیدا قسەدەکات. کاتێك ئەوەم بینی کە ٧ ساڵ لەگەرماودا بەسەر دەبەین و ٣٠ چرکەیش قسە لەگەڵ منداڵەکانماندا دەکەین و بەراوردم کرد گوتم: ئەوەی گرنگە کاتی زیادتر نییە، بەڵکو چۆنێتی دابەشکردنی کاتە بۆ بەکارهێنان. ئامانجی پشت ئەم بەشە ئاشناکردنتە بە چۆنێتی بەکارهێنانی کاتەکانت بەباشترین شێوە، بەجۆرێك قۆستنەوەی کات بە باشترین شێوە دەبێتە ڕێچکەی سەرەکی ژیانت.

## ٤٧-دوو كۆسپی دەروونی پێش بەكارخستنی كات:

((جـۆرێتی ژيانــت بــە پلــەی دانايیــت بــۆ بەكارخســتن و قۆســتنەوەی كاتــەوە دياردەكەوێت)))

**د.ئیبراهیم فەقی**




هەموو شتێك لەژياندا كاتی خـۆی هەيـە، جارێــك دڵشــادی و جــارێكیش خــەمبار، ئەمەش هۆكـاری قـوڵ و كۆسـپی دەروونی لەپشتە. بەكارخستنی كـات پەيوەستە بـە دوو كۆسـپی دەرونـی سـەرەكی كـە رێگـە لـەمرۆڤی ئاسـايی دەگـرن لـە قۆسـتنەوەی كاتەكەی بەكارایی و ئەم دوو كۆسپەیش بریتین لە:

### ١-بەها و باوەڕەكان:

ولیـام جـایمس ی بـاوكی دەرون ناســی نـویێ دەڵێـت:" **بـاوەڕ يارمــەتیم دەدات بـۆ ئافراندنی ڕاستییەكان**" ، تۆيش باوەڕت لە دوو سەرچاوەی سەرەكییەوە يادگرتووە:

**يەكـەم: بـاوك و دايكـت:** ئاراسـتەكاری و ڕێنماییـەكانیان لـەبارەی كـات و چـۆنێتی بەكارخستنی كاتیانەوە كاریگەری گەورەی لەسەر تۆ دەبێت. گەر دايك و باوكت بەباشـی كاتی خۆيان بەكارخستووە ئەوا زۆرجار تـۆيش وەكـو ئـەوان دەبیـت، بـەڵام گـەر بـاوك و دايكت لە هەڵقەی ڤالادا خولانـەوە و زۆرێـك لـە كاتـەكانی ژيانیـان لـە گازنـدە و ناقـايلی دەربڕين بەكارخست و زۆر سەيری تەلەوزيێنیان كرد ئەوا بـەها و گرنگـی پێـدانی تـۆيش بۆ كات زۆر لەوان دەچێت.

**دووەم: کارتێکـارە دەرەکییـەکان:** ئەنـدامانی خێزانەکـەت، هاوڕێکانـت، خـزم و دراوسێ و مامۆستاکانی خوێندنگەت، هەروەها ئەو شتانەی دەیخوێنیتـەوە و دەزگاکـانی ڕاگەیاندنیش ڕۆڵێکی مەزنیان هەیە لە داکوتان و جێپێگرتنـی بۆچـوونت لـەبارەی بـەها و گرنگی کاتەوە.

ئێمە لەگەڵ باوەڕەکاندا گەورە دەبین، باوەڕ بەوە دەهێنین کە بەکارخستنی کات یـان گرنگە یاخود بێ کەڵکە، ئەم باوەڕانەشمان دەگوازینەوە بـۆ منداڵـەکانمان. هنـری فـۆرد دەڵێت: " **گەر باوەڕت وەهایە کە دەتوانی، یـاخود نـاتوانی ..ئـەوە تـۆ لەسـەر ڕێگـەی ڕاستی و هەڵـەت نـەکردووە"** ، قەیسـەریش دەڵێـت: " **مرۆڤـەکان ئامـادەی بـاوەڕکردن بەوەی دەیانەوێت باوەڕی پێ بێنن"** ، بۆیـە پێویسـتە بۆچـونە نەرێنیـەکانت لـەبارەی بەکارخستنی کاتەوە بگۆڕیت ئەگینا لەسەر ئەنجامدانەوەی هـەمان کـار و وەرگرتنـەوەی هەمان ئەنجام بەردەوام دەبیت.

## ٢-خۆ بە نەرێنی بینین:

لەوکاتەوەی هاتویتەتە ئەم جهانەوە تۆ سەرقاڵی خـۆ پونیاتنانیـت، جارێـك نـەرێنی و جارێـك ئـەرێیی دەبیـت لەسـایەی بـاوك و دایـك و دراوسـێ و دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن و هەرکەسێك پێی دەگەیت. ئەم پێکهێنان و خۆبەرنامە ڕێژکردنە کـار لـە خـۆ وێنـەکردنت دەکات لەوەی چۆن خۆت دەبینیت.

باوەکو نمونەیەکت بۆبخەمە بەردەست: ئـەو نێـردەی کارکردنـەی کـە هەقدەسـتەکەی ٢٠٠٠ دۆلارە لەمانگێکـدا و تـاوەکو ١٨ مـانگ بـەو پـەڕی توانایـەوە کاردەکـات و ١٨٠٠ دۆلاری دەسـت دەکـەوێت، دەزانـی ئـەو ١٢ ڕۆژەکـەی تـر چـی دەکـات؟ بـەو پـەڕی هێواشییەوە کاردەکات؟ چونکە تەنها ٢٠٠ دۆلاری دەست دەکەوێت، ئەم کابرایە تـاوەکو خۆی بەو شێوەیە وێنە بکات کە شایەنی ئەوەیە تەنها لـە مانگێکدا ٢٠٠٠ دۆلاری دەسـت بکەوێت ئەوا هەر بەم شێوەیە کاردەکات، بۆیە خۆ وێنەکردنت کاریگەری گەورەی دەبێت

لەسەر هەستکردنت بەرامبەر کات و بەکارخستنی کات، بودا دەڵێت: "**ئەوەی تۆئێستا تێیدایت تەنها ئەنجامی ئەوەیە کە تۆ لەبیرکردنەوەتدا تێیدا بویتە**"، ئایا تۆ مرۆڤێکی بەسکار یاخود کارایت؟ بەر لەوەڵامدانەوەی ئەمە لەپێشدا لەم بۆچوونەی ڕۆبێرت شافر بڕوانە لەبارەی کەسایەتی بەسکار و کاراوە، کە لە کتێبەکەیدا بەناونیشانی : (( ستراتیژیەتیەکانی تێپەڕاندن))، دەڵێت:

| بەسکار | کارا |
| --- | --- |
| • سەرقاڵ<br>• کاربەسەر خۆیدا دەدات<br>• شتەکان بەڕێگەی ڕاست ئەنجام دەدات<br>• کارەکان بەرەو باشتر دەبات<br>• زیادتر ئەنجام دەدات بۆ بەدیهێنانی زیادتر، شتە ناپێویستەکانی تر کەمتر دەکات. | • سەرکەوتوو<br>• کاربەسەر ئەوانی تردا دەدات<br>• شتی ڕاست ئەنجام دەدات<br>• ئەنجامی کاری دەست دەکەوێت<br>• بەباشی دەزانێت چ هەڵدەبژێرێت و ئەنجام دەدات، بەرەو باشتر هەنگاو دەنات. |

مرۆڤی سەرکەوتوو هەمیشە گرنگی بە نەخشەڕێی ساغ و زامنی سەرکەوتنیان دەدەن، بۆئەوەی ئەنجامی خوزراویان چنگ بکەوێت و بەهۆیەوە قایلمەندی زۆرینەش چنگ بخەن، نەوەک تەنها خۆ وەها پیشان بدەن کە سەرقاڵن.

**((بیر لەخۆت بکەرەوە، هەموو ڕۆژێك دوایین ڕۆژی ژیانتە..ئەو کاتژمێرەی بۆ پێشەوە لێی ناڕوانی، وەکو موجافات بۆ پێشوازیت دێت))**

**هۆراس**

گەر بزانی تەنها شەش مانگی تر دەژیت، چی دەکەیت؟ کاتەکانت چۆن بەسەر دەبەیت؟ بۆکوێ دەڕۆیت؟ پێشتر بیرت لەمە کردۆتەوە؟

لەقسەکانی منەوە بۆت دیارکەوت کە:" تاوەکو مرۆڤ پتر گرنگی بە کات بدات، ئەوەندەش سەرکەوتوتر دەبێت و بەهای کات لەلای مەزن و گەورەتر دەبێت" ، گەر بەجوانی بیربکەیتەوە دەبینی کەسانی سەرکەوتوو بەچرکە کاتەکانیان دەژمێرن لەکاتێکدا کەسانی ناسەرکەوتوو بە کاتژمێر و ڕۆژانە کاتیان دەژمێرن. کەسانی سەرکەوتوو هەر ئێستا دەست پێدەکەن و بەخێرایی دەجولێنەوە، لەکاتێکدا دەبینین کەسانی ناسەرکەوتوو تەمبەڵی دەکەن و تەنها لەکاتی ویستراودا دەجولێنەوە.

هاوڕێیەکم لەبارەی کتێبێکەوە قسەی بۆ کردم، کە دەیویست بینوسێتەوە، منیش لێم پرسی:" کەی دەست بە نوسینەوەی کتێبەکەت دەکەیت؟"، گوتی:" لێرەوە تاوەکو دووساڵی تر"، گوتم:" پێت وادەبێت کە ئەم کتێبە مەزنە و یارمەتی خەڵك دەدات؟"، گوتی:" بێگومان"، گوتم:" کەواتە بۆچی دەبێت دووساڵی تر چاوەڕوانبیت بۆ نوسینەوەی کتێبەکە؟"، گوتی:" ئێستا کاتم نییە!". ئەم کەسە بیرۆکەیەکی مەزنی هەیە، بەلاّم ئەم بیرۆکەیە کەوتبوە نێو بەندیخانەی کاتەوە. ئەی چی لەبارەی تۆوە؟ ئایا بیرۆکەکانت دوادەخەیت و دەیخەیتە لیستی چاوەڕوانکردنەکانەوە" چونکە کاتت نییە؟

# ٤٨-پێنج تەرزەکەی بەڕێوەبەرانی کات:

((پێویستە هەموو ڕۆژێك وەهابژین وەك ئەوەی دوایین ڕۆژی ژیانمانبێت))

**بابلیلیۆس سیریس**

### ١-بەڕێوەبەری زۆر ڕێکخراو:



ئەم بەڕێوەبەرە زۆری حەز بەوەیە کەسانی تر لەبارەوە بڵێن: زۆر سەرقاڵ و ڕێکخراوە. هەمیشە خەریکی ئامادەکردنی لیستی نوێیە. گەر ئەوەی پلانی بۆی داناوە بەدی نەهێنا ئەوا نەخشە و لیستی نوێ دادەڕێژێتەوە و بەهۆی زۆری لێوردبونەوەیە بۆ ئەم کارەی کاتی زۆر بەفیڕۆ دەدات. ئەم کەسە ئەوەندە گرنگی بەوە دەدات بە ڕێکخراو دیاربکەوێت ئەوەندە گرنگی بەوەنادات کە کارەکانی بەڕێکخراوەیی ئەنجام بدات.

### ٢-بەڕێوەبەری زۆر سەرقاڵ:

ئەم بەڕێوەبەرە هەمیشە سەرقاڵ دیارە و هاتووچۆیەتی، بەردەوام خەریکی ئەنجامدانی شتێکە، ئەم بەڕێوەبەرە گازەندەی ئەوە دەکات کە کاتی تەواوی نییە بۆ ئەنجامدانی هەموو ئیشەکانی ڕۆژانەی. کەسێکی کار گرانە و سەرپەرەشتی کەسانی دەوروبەری دەکات، کاتی نییە بۆ حەسانەوە، هەروەها هەست بە تاوانیش دەکات گەر کاتێکی کەمی بۆ حەسانەوە وەرگرت، خۆ ئەگەر بەڕاستی ڕوویدا و کاتێکی بۆ حەسانەوە تەرخان کرد ئەوا بە باسکردنی کارەوە بەسەری دەبات، بەخێراییش تورە دەبێت و لەم کاتەدا کەس ناوێرێت توخنی بکەوێتەوەو هەمیشە لێی دەبیستی کە بەڕاستی کاردەکات

کەچی کاتی تەواوی نییە بۆ ئەنجامدانی تەواوی کارەکانی" چونکە شەو و ڕۆژێك تەنها ٢٤ کاتژمێرە و بەشی ئەم ناکات!

### ٣-شێتی کات:



ئەم جۆرە بەڕێوەبەرە زۆر گرنگی بە کات دەدات و کارکردن ڕەگەڵیدا ئاسان نییە، ژوورەکەی هەمیشە پڕە لە ئامراز و کەرەستەی تایبەت بە ڕێکخستنی کات، وەکو کۆمپیوتەر، فاکس، سیستمی تایبەتی دۆسیەکان و هیتری لەم جۆرە، گەر سەیری خشتەی ڕۆژانەی بکەی دەبینی بەم شێوەیەیە: ٦ خولەك بۆ قاوەڵتی، ٩ خولەك بۆ کۆبونەوە، ٣٠ چرکە پەیوەندی کردن بە هاوسەرەکەیەوە، گەر ئەوەی نەخشەی بۆی دانابوو بەدی نەهێنا ئەوا سەرزەنشتی ئەوانی تر دەکات و هەمیشە گازەندەی ئەوە دەکات کاتی لەدەستداوە، بەگشتی کەسێکی گاڵتەجارە و حەزی بە پێداچوونەوەی هەموو دۆسیەکانە و هەرچییەکی بەدڵ نەبوو دەیسڕێتەوە، بۆیە وریابە گەر لەلای ئەم کەسە کاردەکەیت و پێنج خولەك دوابکەی ئەوا کارت تەواوبووە، ئەم کەسە شێتی کاتە.

### ٤- جەنجاڵ:

ئەم بەڕێوەبەرە ناڕێکخراوە، دەبینی لەهەموو کونجێکی نوسینگەکەیدا لاپەڕەی لەسەر زەوی بلاوکردۆتەوە، لێرە لەوێ ، خۆشی ئەم کەسانە لەوەدایە گەر پرسیاری شتێکی لێبکەی لەبارەی دۆسیەکانەوە دەبینی بەئاسانیش دەتوانێت بیدۆزێتەوە. خۆئەگەر لەبارەی کەسانی ڕێکخراوەوە لێیان بپرسیت ئەوا بە گاڵتەجارییەوە دەڵێت: بوونی نوسینگەی ڕێکخراو مانای بوونی ئاوەزێکی نەخۆشە، زۆرجاریش شتی لێ ون دەبێ و ئەوانی تر تۆمەتباردەکات کە دزیویانە.

## ٥–ڕێکخراو:

ئەم بەڕێوەبەرە زۆر ڕێکخراوانە کاردەکات، دەزانێت چۆن ڕەگەڵ هەموو کێشەکاندا دەجولێتەوە، دەزانێت چۆن گرنگی پێدانەکانی دەست نیشان دەکات. کارکردن لەگەڵ ئەم کەسە زۆر ئاسودە بەخشە، بەباشی بەهای کات دەزانێت، بەڕاستی ئامانجی پشت ئەم بەشە دیارخستنی تایبەتمەندی ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەیە.

## ٤٩-شەش سودەکەی پشت بەکاربردنی کات:

((ئەوەی هەتە تەنها بیست و چوار کاتژمێرە، ژمارەی کاتژمێرەکانی ئەمڕۆ نەزیادە و نەش کەمتر، گەر ڕۆیشتن و تەواوبوون ئەوا بۆ هەتاهەتایە تەواوبوون))

**د.ئیبراهیم فەقی**

### ١-دەتوانی بەلای کەمەوە ڕۆژانە دوو کاتژمێری بەسوود چنگ بخەیت:



کاتێـــك ســـــتراتیژیەتەکانی بەکارخســـتنی کـــات دەقۆزیتـەوە ئـەوا بـەلای کەمـەوە لەشـەووڕۆژێکدا دوو کاتـژمێرت دەبێـت کەبەسـودن بـۆت، ئەمـەش هانـت دەدات و ڕێنوێنیـت دەکـات بـۆ ئەنجامـدانی کـاری پێویست و گرنگ، ئەوجا دەبێتەهۆی پترکردنی داهاتت و باشترکردنی ئەنجامی بنچینەیی ئامانجی کارەکەت.

### ٢-لەڕۆژی کارتدا باشتر دەتوانی هەڵی بسوڕێنی:

کاتێك دەزانی چۆن هـەموو بەربەرەستەکان تێپەڕێنی، دەشـتوانی بەباشـی بەسـەر کاتەکەتدا زاڵبیت و بـەکاری بخـەی، بـەجۆرێك دەتـوانی ئـەو ئەنجامـە چـنگ بخـەیت کـە مەبەستتە.

### ٣-دەتوانی بەئاسانی زاڵبیت بەسەر دڵەڕاوکێ و گوشاری کاردا:

بەکارخسـتنی کـات و سـترتیژیتەکانی ڕێکخـار یارمـەتیت دەکـات بۆئەنجامـدانی کـار لەکات گەلێکدا کە تـۆ لـەدۆخی دەروونـی و هـزری خوازراودابیـت. چـیت بوێـت دەتـوانی

بەئاسان ئەنجامی بدەی، ئەوجا بەتەواوەتی زاڵدەبیت بەسەر کاتەکەتدا، لەم کاتەشدا دەتوانی بەئاسانی زاڵبیت بەسەر ئەو دۆخانەی دڵەڕاوکێ هێن و گوشاربەخشن.

**٤-توانات زیاد دەبێت بۆ ئەنجامدان و تەواوکردنی کارەکان سەر شانت:**

کاتێك دەزانی کاتت بەباشی ڕێکبخەی و بەکاربێنی کاتێکی زۆرت دەبێت بۆ ئەنجامدانی ئەوەی دەتەوێت. بەم کاتە زۆرە بۆ دەستەبەرەت دەتوانی ئاستی زانینت بەرز بکەیتەوە و بەهرەی نوێتر فێرببیت و گوێ لە کاسێت بگریت یاخود کتێبی هاندەر بخوێنیتەوە.

**٥-وزەی تەواوت بۆ دەستەبەر دەبێت:**

کاتێك ئەنجامدراوەکان زۆر و بەسود دەبن ئاستی هاندانت فرەتردەبن، بەخاوەنی وزەیەکی زۆرتریش دەبن، ئەمە سەرباری ئەوەی کەتۆ کاتی تەواوت دەبێت بۆ گرنگی دان بە دۆخی دەروونیت و ئاستی وزەشت بەرزتر دەکەیت.

**٦-کاتی زیادترت دەبێت بۆ ئەوەی ڕەگەڵ خێزان و هاوڕێکانتدا بەسەری بەریت:**

کاتێك دەتوانی بەکارایی کاتت بگێڕی، کاتی زۆرترت دەبێت بۆ بەسەربردنی لەگەڵ خێزانەکەتدا، کوڕ و کچەکانت، ئەرکە کۆمەڵایەتیەکانت جێبەجێ بکەی و هاوڕێکانت بەسەر بکەیتەوە.

## ٥٠-پازدە دزەکەی کات( کە زۆرترین وێرانکاری دەنێنەوە)

((کات گرنگترین شتە کە مرۆڤ دەتوانێت خەرجی بکات))

**تیوفراستس**

### ١-پچڕێنەری دووربێژە(تەلەفۆن)یی:



کاتێــک پەیوەنــدی و قســەی دووووربێــژەیی دەتپچڕێنێ ئەوا ئەمە هزرت دەتوچێنێ. بۆنمونـە: گـەر سـەرقاڵی ئەنجامـدانی کـارێکی گرنگـی کـە دەبێــت ئــەنجام بــدرێت، لــەناکاو زرنگـــەی دووربێژەکـەت هـات و بیرۆکەکـەت دەپچـڕێنێت، جاباوەکو قسەکارەکە هـەرکێ و چییەکیش بێت، گرنگیش نییە چی دەوێت گرنگ ئەوەیە بیرۆکەکانی تۆی پچڕاندووە و هزرتی توچاندووە. تۆ و بەڕێوەبەرانی هاوشێوەی تۆ ڕۆژانە بەناوەنـدی ٢٨ جار بـە دووربێـژە پەیوەنـدیتان پێوە دەکرێت، بۆیە هەرکاتێك پەیوەندییان پێوەکردی تۆ لە بیرکردنەوەکانت دەپچـڕێی، هەروەها کاتێك بیرۆکەیەکت دەپچڕێت پێویستت بـە سـێ ئەوەنـدەی وزەی پێشـووە بـۆ هێنانەوەی.

### ٢-پچڕانەکانی تر:

هەندێك کەس بۆخۆشی لەناکاو دێنەسەردانت یـاخود بـۆ سـکاڵادێن، ڕەنگـە بریکـار و فرۆشیارەکانت بێن. گەر تۆیش بەڕێوەبەربیت ئەوا ڕۆژی ٥ کەس بـەبێ بـوونی مەوئیـدی پێشـوەخت دێنـە سـەردانت. ئـەو کەسـانەی لـە نێـو کارنامـەی ڕۆژانەتـدا نـین کـە دێنـە سەردانیت دەپچڕێنن و بیرۆکەکانت دەپچڕێنن.

## 3-پچڕانەكانی خۆت هۆكار:

خراپترین پچڕاندن خۆ پچڕاندنە.. بۆنمونە: كە سەرقاڵی ئەنجامدانی شتێكی لەناكاو بە یادگەتدا دێت كە دەبێت پەیوەندییەكی دووربێژی ئەنجام بدەی، لە هەموو شتێك دەوەستی و ئەم پەیوەندییە ئەنجام دەدەی یاخود بەشتێكی تردا دەچیتەوە، ئەم كارە ڕوودەدات كاتێك هەڵدەستیت بە ئەنجامدانی ئیشێك یاخود حەزت لە ئەنجامدانیەتی و زۆرجاریش بەدواخستنی كارەكەت كۆتایی دێت.

## ٤-كۆبوونەوە و چاوپێكەوتن:

توێژینەوە و لێكۆڵینەوەكان دیاریان خستووە كە بەڕێوەبەران بەتێكڕای ٢٨٪ی كاتەكانیان بە كۆبوونەوە و قسەكردن ڕەگەڵ كارڕەوانكاریان(سكرتێرەكەی)، كارمەند و بەڕێوەبەرانی بەش و لیژنەی جێبەجێ كاریاندا بەسەر دەبەن. كۆبونەوەكان لە لیستی دزە تایبەتیەكانی كاتن سەبارەت بە بەڕێوەبەر.

## ٥-دواخستن/تەوەزەلی:

ئیدوارد دینگ دەڵێت:" **دواخست ندزی كاتە**"، دواخستن مانای ئەوەیە ئیشی ئەمڕۆ بخەیتە سبەی، كەبەمەش هەرگیز ناتوانی ئەنجامی بدەی" چونكە هەمدیس دوای دەخەیت. بەڕێوەبەری ئاسایی زۆرجار بەفاكتەری چەندین هۆكار و بیانوو كارەكانی دوا دەخات، كەچی ڕاستیەكەی ئەوەیە ئەم بەڕێوەبەرە حەزی بە ئەنجامدانی ئەم كارە نییە، بۆیە تاوەكو دەتوانێت لێی بەدوور دەكەوێت و هەڵدێت.

## ٦-پۆستە و كاری لاپەڕەیی:

مایكل فۆرتینۆ دەڵێت:" **بەڕێوەبەران لەژیانیاندا ٨ مانگ بە كردنەوەی پۆستەكەیانەوە بەسەر دەبەن**"، گەر لەو بەڕێوەبەرانەی حەزت لە خوێندنەوەی

پۆستەی تایبەت بەخۆت و خوێندنەوەی هەموو ئەو گوتارانەیە کە بۆت هەنێردراون، ئەوا تۆ کاتێکی زۆری بەنرخت بەفیڕۆ دەدەی، هەروەها ئەنجامدانی کاری لاپەڕەیی لەشێوەی نوسینەوەی یادگاریش کاری دەست پەتاڵان و بەفیڕۆ دەران و بکوژانی کاتە.

### ٧-ڕاپۆرتەکان:

ڕاپۆرتەکان بەگشتی، جا ڕاپۆرتی کارگێڕی بێت یاخود ڕۆژانە یان هەژماری، یاخود ڕاپۆرتێك بێت لەبارەی پرۆژە تایبەتیەکەتەوە یان ڕاپۆرتی بانکیت بێت هەموویان دزی کاتە بەنرخەکانتن" چونکە پێویستیان بەکات بەفیڕۆدانی زۆرە، بەڵام ئەمە مانای ئەوەنییە لە خوێندنەوەو نوسینەوەی ڕاپۆرتەکان خۆت قەدەغە بکەیت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە بزانی چۆنی دەنوسی و دەخوێنیتەوە و چەندە کاتی بەنرختی بۆ دەفەوتێنی.

### ٨-تێکەڵاوکردنی پێشییەکان(ئەولەویات)

ڕەنگە بە ئەنجامدانی کارێکتەوە سەرقاڵ بیت، ئەوجا لەناکاو شتێکی تر ئەنجام دەدەیت و دواتر دەگەڕێیتەوە بۆسەر کارە بنچینەییەکەت. تێکەوڵاکردنی کارە پێشییەکان مانای ئەوەیە تۆ دەتەوێت کارگەلێکی زۆر لەیەك کاتدا ئەنجامبدەی! لەمبارەیە بابلیلیۆس سیرس دەڵێت:" **هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی دووشت لەیەك کاتدا مانای نەکردنی هەردووکیانە**".

### ٩-ماندووبونی زیاد:

ئەمە مانای ئەوەیە بە ئەنجامدانی کارێکەوە خەریك بیت دواتر دەستی لێ هەڵبگری، کەچی دواتر بگەڕێیتەوە بۆ تەواوکردنی. ئەمەش مانای وەهایە تۆ کاتێکی زۆرت بۆ ئەنجامدانی یەك کار کوشتووە.

### ١٠-نەخشەی ناژیرانە:

زۆرجار لیستێك دەنوسیتەوە کە ناوی هەموو ئەوشتانەی تێدایە کە دەتەوێت ئەنجامی بدەی، ئەوەندە زۆر و قورسن کە بەچەند ڕۆژێکیش ناتوانی ئەنجامیان بدەی، بەم کارەت تۆ خۆت توشی دڵەڕاوکێ دەکەیت و کاتەکەیشت بە ئەنجام نەدانی هیچەوە دەکوژی.

### ١١-نارێکخستن:

کاتێـك نوسـینگەکەت ڕێـك ناخـەیت و هەرشـتێك تورِدەدەیتـە جێگەیـەك ئـەوا بـۆ دۆزینەوەی دۆسیە و شتە گرنگ و پێویستەکانت کاتی زۆرت دەوێت و بەفیڕۆدەدەیت.

### ١٢-سیستمی نەگونجاو بۆ هەڵگرتنی دۆسیەکان:

کاتێك خاوەنی سیستمێکی گونجاو نـەبیت بـۆ هـەڵگرتنی دۆسـیەکانت ئـەوا کـاتی زۆر بـەفیڕۆ دەدەی لەگـەڕان بـەدووی ئـەو دۆسـیانەی پێویسـتت پێیـان دەبێـت و ناتوانیـت بیاندۆزیتەوە. ئەمەش بێگومان تورەیی و هەڵچونت پـێ دەبەخشـێت و توشـی نەخۆشـی هەمەجۆر و کێشەی زۆر و کات بەفیڕۆدانیشت دەکات.

### ١٣-پەیوەندی کۆمەڵایەتی:

بانگێشتکردن بۆ قاوەڵتی، نانی نیوەڕۆ یان ئێواریێ، ئاهەنگی پێشوازی یاخود تەنانەت خواردنـەوەی شـەروەتێکیش کاتـت لـێ بـەفیڕۆ دەدات. بەڕێوەبـەر کـاتێکی زۆری بـە کۆبونـەوەوە بـەفیڕۆ دەدات و بەهۆیـەوە پەیوەندییـە کۆمەڵایەتیـەکانی ئـەنجام نـادات، ئەوەی لێرەدا ئەنجامی دەدات ئەوەیە کە نازانێت چۆن چی دەکـات و بـۆ کـام بانگێشـت دەبێت بڕوات و کامیش دەبێت پشت گوێ بخات.

## ١٤-نەتوانین بۆ گوتنی (نەخێر)




لەناکاو هاورێیەکت دێتە نوسینگەکەت و داوات لێدەکات ڕەگەڵیدا بڕۆی بۆ نان خواردن، بەڕێوەبەرێکی تر دێتەسەردانت بۆ خواردنەوەی کوپێك قاوە، سەرکارەکەت بانگت دەکات تۆیش بەبێ دواخستن دەڕۆی و کارەکانی خۆت دوادەخەیت، گەر نەتوانی بڵێی نەخێر کاتی زۆر بەفیڕۆ دەدەی و بەم هۆیەوە کارگەلێك ئەنجام دەدەی حەزی پێ ناکەی، بەهۆیەوە کاتی زۆر بەفیڕۆ دەدەی.

## ١٥-ئامرازی نەگونجاو:

ڕەنگە کەرەستە و ئامرازەکانی نێو نوسینگەکەت کۆن و خەوشداربن، ئەمەش پێویستی بەوەیە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە کارمەندای چاککردنەوەوە بکەی. خراپی ئامێر و ئامرازی بەکارهاتو دەبێتە هۆی هەڵچونت، ئەمەش دزێکی مەزنی کاتت دەبێت.

هەروەها تۆیش دەتوانی دزگەلێکی دیکەی کات بخەیتە نێو لیستەکەی پێشووترەوە و بەهەموو شێوەیەك هەڵی خۆلادان بدەی لە ئەنجامدانی.

# ٥١-بيست ڕێگەی زۆر كارا بۆ پاراستنی كات:

((ئێستا تەنها ئەم خولەكەت هەیە...ئەو خولەكانەی هەیتە بیانپارێزە، ئەوجا دەبینی گرنگی بە كاتژمێر و ڕۆژەكانیش دەدەیت، هێز و زاڵێتیت بۆ دەستەبەر دەكات))

**برایان تراسی**



ئێستایش لیستێكت پێشدەست دەخەم كە بەرهەمی ٢٢ ساڵ كاركردن و توێژینەوە و لێكۆڵینەوەمە، بۆ پاراستنی كاتە بەنرخەكەت، ئەمەش بۆئەوەیە فێرت بكەم كە چۆن ستراتیژیەتی پێویست دادەڕێژی بەمەبەستی خۆقایمكردن لەهەمبەر درانی كاتدا.

## ١-پچڕێنەری دووربێژە(تەلەفۆنی)

(أ) ئەوەی پەیوەندی پێوەكردووی دەتوانی پێی بڵێ كە ئێستا ئیشم هەیە و دەبێت بڕۆمە دەرەوە، یاخود بۆ كۆبوونەوەی گرنگ دەڕۆم و داوای لێبكە كاتێكی تر تەلەفۆنت بۆ بكاتەوە.

(ب) داوا لە كار ڕەوانكار(سكرێترەكە)ت بكە، وەڵامی پەیوەندییە دووربێژیەكانت بداتەوە و لەبری تۆدا نامە و پەیامەكان وەربگرێت. لەم كاتەدا دەتوانی بڕیاری ئەوەبدەی كەی دەتەوێت وەڵامی پەیوەندی دووربێژی و نامەبۆهاتووەكان بدەیتەوە. كاتێك بێ ئیش و چالاكیت پەیوەندی دووربێژیت ئەنجامبدە، بۆنمونە پاشی نان خواردن، یان پاش كاتی كاركردنت، هیچ كاتیش وەڵامی پەیوەندییەكان مەدەرەوە مەگەر لەدۆخێكی زۆر پێویستدا نەبێت.

## ٢-پچڕانەکانی تر:

(أ) کاتێك کەسێك قسەت پێ دەبڕێت تۆ بەپێوە قسەی لەگەڵدا بکە بۆئەوەی دانەنیشێت و بەزووترین کات قسەکانی تەواوبکات.

(ب) پێشنیارێکی بۆ بکە کە تۆ دەتەوێت دواتر لەدەرەوە بیبینی یاخود نانێکی لەگەڵدا بخۆی یان شتێکی پیشان بدەی.

(ت) لەبری ئەوەی کەسی بیرۆکە پچڕێنەرت بێتە سەردانت تۆ بڕۆ سەردانی، بەم شێوەیە دەتوانی کەی بتەوێت کۆتایی بەقسەکان بێنی و بیرۆکەکانت بە نەپچڕاوی بهێڵیتەوە، کاتەکانت بە نرخدارییەوە بەکاربێنی.

(پ) گەر ویستت لە بێزارکاری دووربیت ئەوا دەرکی نوسینگەکەت دابخە و داوا لە کارڕاییکارەکەت بکە هەرکەسێك دێت بیگێڕێتەوە و داوای لێبکات دوای نیوەڕۆ بگەڕێتەوە، یان لەسەر دەرکی داخراوی نوسینگەکەت بنوسە :" تکایە بێزارمان مەکە".. بەم ڕێگەیە ئەوانی تریش ڕادێن و ڕێز لەکاتەکەت دەگرن و کاتی خۆشیان بەباشی بەکاردێنن.

(ج) هەروەها کورسی کەم لە نوسینگەکەت دانێ بۆئەوەی کەسانی کەم بێنە نوسینگەکەت و هانیان مەدە بۆ دانیشتن و مانەوە لە نێو نوسینگەکەت.

## ٣-پچڕانەکانی خۆت هۆکار:

هەوڵبدە کارەکان یەکجاری ئەنجامبدەی، هەرگیز کارەکانت دوامەخە و بەچڕی تیشك بخەرەسەر ئەو کارەی ئەنجامی دەدەی، گەر هەستت بە ماندوویی کرد یان زانیت بیرت شێواوە ئەوا چڕبیرکردنەوەت ئاراستەی ئەنجامەکان بکە، کەبە سود بۆت دەگەڕێتەوە.

### ٤-كۆبوونەوە و چاوپێكەوتن:

لەسەرەتاوە لەخۆت بپرسە: چی ڕوودەدات گەر بۆئەو كۆبونەوەیە نەڕۆم؟ ئەوجا ئەمانە ئەنجام بدە:

أ- گەر وەلأمەكەت ئەوەیە كە:" هیچ ڕوونادات"و ئەوا مەڕۆ بۆ كۆبونەوەكە.

ب- گەر وەلأمەكەت:" هیچ ڕوونادات بەلأم دەبێت بزانم چی ڕوودەدات" ئەو دەتوانی كەسێكی تر لەبری خۆت بنێری.

ت- گەر وەلأمەكەت بەلێ شتێك ڕوودەدات ە، ئەوا ئەم كۆبونەوەیە بخەرە نێو لیستی ئەنجامدراوەكانی ڕۆژانەتەوە.

### ٥-دواخستن/تەوەزەلی:

گەر شتێك هەبێت لە لیستی ئەو شتانەی كە دەبێت ئەنجامی بدەی و پتر لە سێ جارە دواتخستووە، ئیتر دەست لەم خووەت هەڵبگرە و وازی لێبێنە، هەرئێستا لاپەڕە و كاغەزێك بەدەستەوە بگرە و ئەم پرسیارە لەخۆت بكە:" چی ڕوودەدات گەر هیچ نەكەم؟ و تاچەند ئەم بۆ من گرنگە؟"، دواتر ئەمانە ئەنجامبدە:

أ- گەر وەلأمەكەت ئەوەبوو كە گرنگە ئەوا ئەنجامی بدە.

ب- گەر وەلأمەكەت ئەوەبوو كە گرنگە بەلأم كەسێكی تریش دەتوانێت ئەنجامی بدات ئەوا بەیەكێكی دیكەی بسپێرە.

ت- گەر وەلأمەكەت: هیچ ڕوونادات و گرنگ نییە بوو ئەوا وازی لێبێنە.

### ٦-پۆستە و كاری لاپەڕەیی:

أ-مەبەستە بە مەشقپێكردنی كارڕەونكارت بۆ وەرگرتنی نامە و پۆستەكانت و ئەنجامدانی كاری لاپەڕەیی و لەیەك جیاكردنەوە و ڕێكخستنیان و خستنەڕووی گرنگەكان بۆتۆ.

ب–پۆستەکانت بخەرەنێو دۆسیەهەڵگرێکی تایبەتییەوە و کاتێك ئاستی ئەنجامدانی چالاکیەکانت نزم دەبێتەوە ئەوجا سەیریان بکە.

ج–وەڵامدانەوەی پۆستە و نامەکانت بخەرە ئەستۆی کەسێکی تر.

د–ئەنجامدانی دووکار لەیەك کاتدا. بۆنمونە: مەوئیدت ڕەگەڵ پزیشکدا هەیە و دەزانی پێویستت بە چاوەڕوانی دەبێت، بۆیە ئەو دۆسیە و لاپەڕانەی پێویستن لەگەڵ خۆت بیان بە و لێیان بڕوانە و پێیاندا بچۆرەوە، بەمەش دووکار لەیەك کاتدا ئەنجام دەدەی و کاتت بە چاوەڕوانی سرەی دکتۆرەوە ناکوژیت.

## ٧–ڕاپۆرتەکان:

ئەم پرسیارە لەخۆت بکە: چی ڕوودەدات گەر ئەم ڕاپۆرتە نەنوسم؟ کەسێکی تر دەتوانێت لەجێگەم بینوسێت؟ گەر وەڵامەکەت: هیچ ڕوونادات بوو، کەواتە مەینوسە، بەڵام گەر پێویست بوو ئەوا با کەسێکی تر بینوسێتەوە و دواتر خۆت چاوێکی پێدا بخشێنەرەوە، دەشتوانی لەو کاتانەدا بینوسیت کە چالاکیت کز و لاوازە.

## ٨–تێکەڵاوکردنی پێشییەکان(ئەولەویات)

لیستی هەموو ئەو شتانە بنوسەرەوە کە دەتەوێت ئەمڕۆ ئەنجامیان بدەی، ئەوجا بەپێی گرنگییان لیستەکە دابڕێژەرەوە. بە گرنگترین دەست پێبکە، بەو شتانەی کە دەبێت ڕاستەوخۆ ئەنجام بدرێت، ئەوجا ئەوانەی کە دەتوانی دواتر ئەنجامیان بدەی، ئەوجا لەکۆتاشدا ئەوەی کەمتر دەتەوێت بینوسەرەوە. لە لیستەکەتدا کاتێك بۆ چاوپێکەوتنیش دیاریبکە، کامیان لەپێشتر و گرنگتربوو ئەنجامی بدە، ئەوجا بۆئەوانی تری کەمتر گرنگ هەنگاو بنێ.

## ٩-ماندووبونی زیاد:

هەر ئەمڕۆ دەست پێبکە و شتەکان یەکجار ئەنجام بدە، گەر ئەمڕۆ کۆمەڵێك لیست و دۆسیەت لەپێش دەستە و گرنگن هەر ئەمڕۆ تەواویان بکە یاخود بەکەسێکی تری بسپێرە و کاری ئەمڕۆت مەخەرە سبەی" چون گەر ئێستا کاتی ئەنجامدانیت نەبێت ئەوا لەداهاتوشدا بۆت نالوێت و کاتت نابێت: بۆیە کەدەستت پێکرد زوو لێی بەرەوە.

## ١٠-نەخشەی ناژیرانە:

بەژیرانەوە لە نەخشەی کارکردنت بڕوانە، لەخۆت بپرسە: ئایا دەتوانم نەخشەکانم بەپێی ئەو کاتەی بۆم دیاریکردون ئەنجام بدەم و جێبەجێ بکەم؟ گەر وەڵامەکەت نەخێرە ئەوا نەخشەکات بگۆڕە و چاکسازییان تێدابکە.

## ١١-ڕێکخستن کاریە:

أ- هەموو ڕەفەی نوسینگەکەت پەتاڵ بکەرەوە.

ب- لیستی ناوی ئەو شتانە بنوسەرەوە کە بەڕاست دەتەوێن و پێویستت پێیانە، ئەوانی تر لەکۆڵ خۆت بکەرەوە.

ت- ئەم جۆرە دۆسیانە لەخۆت دووربخەرەوە: دۆسیەی گشتی، دۆسیەی هەمەجۆر" چون ناچارت دەکەن بەردەوام لاپەڕەی تریان بۆ زیادبکەی و پێیانەوە سەرقاڵ بیت.

پ- ئەوەی کە دەزانی زۆر گرنگ و پێویستە بۆ ئەنجامدانی کارەکانت تەنها ئەوانە لە نوسینگەکەت بهێڵەرەوە.

ج- دۆسیەیەك بکەرەوە باوەکو لەخۆگرتەی ئەو کارانەبێت کە ڕۆژانە دەتەوێت ئەنجامی بدەی، هەوڵبدە چی تێدا نوسراوە هەمووی ئەنجام بدەی.

ح- بەجوانی و ڕێکخراوەیی و خاوێنییەوە کارانت ئەنجام بدە.

خ- پێویستە لە نوسینگەکەتدا تەنها یەك شتت لەپێش چاوبێت..ئەو کارەی دەتەوێت ئەنجامی بدەی.

## ١٢-سیستمی گونجاودابنێ بۆ هەڵگرتنی دۆسیەکانت:

لەبیرت بێت پێویستت بە سیستمێکی گونجاوە بۆ هەڵگرتنی دۆسیەکانت بە کۆدی ڕەنگاوڕەنگ. بە کارڕەوانکارت بڵێ: لیستی ناوی هەموو دۆسیەکانت بۆ ڕێك بخات و بەم ڕێگەیەش دەتوانی چیت بوێت بە زووترین کات بیدۆزیتەوە" گەر پێویستت بەوە بوو خۆت بۆی بگەڕێی. دۆسیە ناپێویستەکان لەخۆت دووربخەرەوە" چونکە بەبێ هیچ گرنگییەك شوێنەکەت قەرەباڵغ دەکەن. لەبیرت بێت کە ٨٠٪ی ئەو شتانەی دەیخەیتە نێو دۆسیەکانتەوە دووبارە لێیان ناڕوانیتەوە، بۆیە بەرلەوەی هەر شتێك هەڵبگریت لەخۆت بپرسە: چی ڕوودەدات گەر ئەم لاپەڕەیە هەڵنەگرم؟ گەر وەڵامەکەت: هیچ بوو، ئەوا توڕی بدە و فڕێی بدە، گەر وەڵامەکەشت گرنگ و پێویستە بوو ئەوا بیخەرە نێو دۆسیەکانتەوە و هەموو ٩٠ ڕۆژ جارێك پێیاندا بچۆرەوە و کامیان کۆن و بێ کەڵك بوو لە نوسینگەکەت لایان بەرە، نابێت بەهیچ شێوەیەك قەبارەی هیچ دۆسیەیەك لە یەك ئینچ زیادتربکات.

## ١٣-پەیوەندی کۆمەڵایەتی-کۆبوونەوە:

لەخۆت بپرسە: چی ڕوودەدات گەر نەڕۆم بۆ ئەم بانگیشتکردنە یان نانی ئێواریێ خواردنە؟ گەر وەڵامەکەت هیچ ڕوونادات بوو ئەوا هەرئێستا پەیوەندی بکە و مەوئیدەکەت ڕەتبکەرەوە و گەر ئاسانتریش بوو ئەوا کەسێکی تر بهەنێرە با نوێنەرایەتی تۆ بکات، یاخود خۆت بڕۆ و نەختێك لەوێ بمێنەرەوە و دواتر بەخێرایی ئەو جێگەیە بەجێ بهێڵە.

## ١٤-فێری گوتنی (نەخێر) بە:



مەهێڵە وشەی نەخێر وەهات لێبكات هەست بە تـاوان بكـەی، باشـتر وەهایـە بیڵێـی لـەبری ئـەوەی كاتـە بەنرخەكـەت لەدەسـت بـدەی و خشـتەی كارەكانـت قەرەباڵغ بكەی بە كاری ناپێویستەوە، كە ئەمـەش بـاری سەرشـان و دەروونـت سـوكتر دەكـات و گوشـارەكانی سەریشت كەمتر دەكات. بۆیە بەرلەوەی بڵێی : بەڵێ، لەخۆت بپرسە: چی ڕوودەدات گەر بێژم: نەخێر، گەر وەڵامەكەت: هیچ ڕوونادات بوو، كەواتە بە بزەوە بڵێ نەخێر.

## ١٥-ئامرازی نەگونجاو:

تازەترین و باشترین و گونجاوترین ئامێر بەكاربێنە. ئامێری لەبەرگرتنـەوەی دۆسـیە و قەواڵەكانت بگۆڕە و دانەیـەكی باشـتربێنە، ئەمـەش كـاتێكی زۆرت بـۆ دەگەڕێنێتـەوە و توڕەیش نابیت. كڕینی ئامێر وەكو وەبەرهێنان و ئەنجام ببینە نەوەك خەرجی، هەروەها لە ئامێری ناپێویسـت و نـاگرنگ بەدووربـە" چـونكە دەبنـەهۆی خاوكردنـەوەت لـەئیش و كارت و كوشتنی كاتەكانت.

## ١٦-كاتی نان خواردن:

گەر هەمووان نیوەڕوان دەڕۆن بۆ نان خواردن ئەوا تۆ بە نیو كاتـژمێر پێشـی هـەموان بڕۆ یاخود نیو كاتژمێر پاشی هـەموان، بـەم كـارەت هـەم باشـتر خزمـەت دەكرێـی هـەم خۆراكەكەت زوو بـۆ دەهێـنن و خێراتـر لێـی دەبیتـەوە و كـاتی باشـت بـۆ دەگەڕێتـەوە. هەروەها لەكاتی خۆراكدا دەتوانی كەسێك بانگێشت بكەی كـە ئیشـت پێیـەتی بۆئـەوەی دوو چۆلەكە بە یەك بەرد بپێكی.

### ١٧-دووربیژ(تەلەفزن)ەکەت دابخە:

خەڵکی نزیکەی دوو کاتژمێر و نیو یان زیادتری ڕۆژانە لەپێش تەلەوزوێن بەسەر دەبەن، بەپشت بەست بە توێژینەوەکان. خۆت مەدەرە دەست ئەو خووە خراپە و دەست لە زۆر سەیرکردنی تەلەوێنە هەڵبگرە، باشتر وەهایە ئەم کاتە ڕەگەڵ خێزان و وەچەکانتدا بەسەر بەریت، دەتوانی حەزت لەچی بەرنامەیەك بوو سەیری بکەیت و دواتر ئامێرەکە بکوژێنیتەوە.

### ١٨-کاتی نوستن:

زۆرێك لە پزیشکان دەڵێن: خەڵکان لەکات گەلێکدا دەنون کە لەڕووی جەستەوە پێویستیان نییە، یاخود لەکاتی ماندوویی و شەکەتیدا دەیانەوێت بنون. ئەمانە تەنها بەپێی خوو و نەریتەکان دەنون. بۆیە زوو نوستن و زوو هەستان باشترین ئامۆشیاری بەنرخە بۆتان، لەلایەن پزیشکانەوە ئامادەکراوە و چەسپێنراویشە بۆتان.

### ١٩-کاتی فڕین:

یەك کاتژمێر لەنێو فرۆکە بەبێ هیچ پچڕانێك هاوتایە ڕەگەڵ ٤ کاتژمێری نوسینگەکەت بە پچڕانەوە. بۆیە داوای ئەوە بکە کە شوێنەکەت لە تەنیشتی پەنجەرەوەبێت و دووریش بێ لە سەرئاو و چێشتخانەکەوە. بەم جۆرەش هیچ کەسێك ناتوانێت بت،پچڕێنێ. دەتوانی ئەم کاتە بۆ ئامادەکردنی ڕاپۆرت و کاری لاپەڕەییت بقۆزیتەوە. من بۆخۆم لەکاتی گەشتی فرۆکەییمدا زۆرێك لە لێکۆڵینەوەکانم تەواودەکەم. لەنێو فرۆکە گەر ویستت شتێکی بەنرخ بنوسیت لە سەیرکردنی تەلەوێنە و خوێندنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بەدووربە.

**٢٠-هەموو ساڵێك با مانگێك زیاوەت هەبێت:**

گەر بتوانی هەموو ڕۆژێك یەك کاتـژمێر زووتـر بەخـەوەر بێیتـەوە ئـەوا هەفتـەی پێـنج کاتژمێرت بۆ دەگەڕێتەوە، گەر لێکدانی ٥٠ هەفتـەی بکـەی ئـەوا دەکاتـە ٢٥٠ کاتـژمێر و دابەشی ٨ کاتژمێر ئیشی ڕۆژانەی بکە دەکاتە ٣١ ڕۆژ یاخود مانگێك لە ساڵێکدا.

$$\text{ڕۆژ}31 = \frac{1 \times 5 \times 50}{8}$$

ئەوکاتەی دەزانی ئەم کاتە بە دانایی بەڕێبکەی ئەوکات دەتوانی بەڕێژەی ٣٪ داهاتـت زیادبکـەی، دەچـیتە ڕیـزی کەسـانی سـەرکەوتوو، ئەوکەسـانەی بەباشـی کاتـەکانیان ڕێکخستووە. بزانـە گـەر یـەك کاتـژمێر بـۆ نەخشەسازی و پلانکـاری خـەرج بکـەی ئـەوا هاوتایە بە ٤ کاتژمێر کارکردن. واتە داهاتەکەت یەکسان دەبێتەوە بە ٤٠٠٪ .

## ٥٢-چۆن دەتوانی خووی کارا بۆ بەکارخستنی کات گەشەپێبدەی:

((زۆرکەس دەڵێن: کاتم نییە بۆ نەخشەدانان یان ڕێکخستن. بەڕاستی سەیرن گەر کاتیان نەبێت! !))

**د.ئیبراهیم فەقی**



١- ئەمڕۆ دەست پێبکە و بەڕێوەبەرێکی کارابە بۆ کات.

٢- بەڵێنێك بەخۆتبدە" بۆنەمە و ئەوجا بەڵێنی ئەوەش بەچواردووبەرت بدە کە دەبیتە بەڕێوەبەرێکی کارا.

٣- بڕوات بەوە هەبێت کە بەڕێوەبەرێکی کارای کات دەبیت.

٤- چاوانت دابخە، بحەسێرەوە و هەوڵبدە وەها خۆت ببینی کە بەڕێوەبەرێکی کاراییت و ڕێزی کات دەگریت.

٥- لیستێك ئامادەبکە هەموو ئەوانەی تێدابێت کە ئەمڕۆ دەتەوێت ئەنجامی بدەی، ئەوجا بەپێی پێشییەکان(ئەولەویات)ت ڕیزبەندییان بۆ بکە، لەگرنگەوە بۆ کەم گرنگ، هەوڵبدە ئەم لیستەت شەوان ئامادەبکەی بۆ ئەوەی کاتی ئیشکردنت لێ نەگرێت، کاتێك چالاکیت خۆت بە نوسینەوەی لیستەوە سەرقاڵ مەکە.

٦- هەوڵبدە هەمیشە زوو بڕۆی بنوویت و هەموو ڕۆژێکیش بەلای کەمەوە ١٥ خولەك زووتر بەئاگا بێیتەوە" چونکە ئاوەزی هەناوی لەکاتی بەیانیاندا زۆر بەئاگا و هۆشیار و داهێنان کاریشە.

٧- هەوڵبدە لەپێشی هەموو کارمەندانتەوە بڕۆیت بۆسەر کار، بەمەش کەسی تر ناتوانێت بت پچڕێنیّ.

٨- هەوڵبدە هەمیشە ئامادەبیت، کاتێک دەتەوێت ئیشێک ئەنجام بدەی، هەموو ئەوانەی پێویستت پێیانە پێش دەستیان بخە: کۆمپیوتەر، ڕاستە، دۆسیە، خامە، هەموو شتێکی تر، بەم کارەشت هزرت ناتوچێ" لە گەڕان بەدووی شتەکاندا.

٩- هەرچی کاری لاپەڕەییت هەیە بەیەکجاری ئەنجامدا و دواتر لەخۆتیان دووربخەرەوە.

١٠- پرۆژەی گەورە دەتوانی دابەشی چەند بەشێك بکەیت/بەشی بچووك. ئەوجا دەتوانی بەش بە بەش ئەنجامیان بدەی.

١١- هێزی دەیی: گەر توشی کارێکی قورس و بێزارکار بوویت و هەستت کرد ناتەوێت ئەنجامی بدەی، ئەوا بۆماوەی ١٠ خولەك پیاسەبکە و دواتر وەرەوە بۆسەر ئەنجامدانەوەی هەمان کار، کاتێك دەست بەکارەکە دەکەیتەوە هەست بە تەواوبوونی دەکەیت. ئەوجا تیشك بخەرەسەر ئەنجام و هەستکردنەکانت کاتێك لە پرۆژەکە دەبیتەوە.

١٢- هێزی وەرنامەڕێژکردنی دەروون: هەوڵبدە هەموو ڕۆژێك ئەوە بۆخۆت دووپات بکەیتەوە کە تۆ بەڕێوەبەرێکی کارا و چالاك و ڕێزگری کاتیت، کاتێك ئەم نامەیە دووبارە دەکەیتەوە ئاوەزی هەناوی بە دۆخی ڕاستەقینەتی وەردەگرێت و کار بۆ بەدیهاتنی دەکات. خۆ بەرنامە ڕێژکردن بکەرە بەشێکی کاری ڕۆژانەت. ئەمەش چەند نمونەیەکە دەتوانی ڕۆژانە ئەنجامی بدەی:

- من بەڕێوەبەرێکی باشم/ من بە باشی کاتەکانم دەگوزەرێنم.
- من بەباشی سیستمەکەم بەکاردێنم و دەیپارێزم. .
- دەتوانم بەباشی کاتەکانم بقۆزمەوە.
- هەموو ڕۆژێك لە هەموو لایەکەوە باشتر و باشتر ئەنجام دەدەم بۆ باشتربوون.

**١٣–هێزی ٢١** : ئەم خووە بۆماوەی ٢١ ڕۆژ لەسەریەك ئەنجامبدە، ئەوجا بۆ هەمیشە خووی پێوە دەگریت. دەتوانی ئەم کردارەیە خێراتر بکەی و ببیتە بەڕێوەبەرێکی کارای کات، لەڕێگەی:

أ– گفتوگۆ: دەتوانی لەگەڵ ئەو کەسەدا قسەبکەی کە دەزانی ئەو بەباشی کاتەکانی ڕێکخستووە و بەکاردەهێنێت.

ب– کڵاوی بەڕێوەبردنی کات لەسەر بکە: وای دابنێ تۆ مەشق پێکاری و بۆماوەی یەك مانگ مەشق بە کارمەندانت دەکەیت لەبارەی چۆنێتی بەکارهێنانی کاتەوە. بۆیە لەمڕۆوە دەتوانی بەخێراتر و باشتر فێربیت و بەڕاستی بەوەبیت کە دەتەوێت ببیت.

ت– ستراتیژیەتی (چی دەبێت گەر) بەکاربێنە: ولیام جایمس دەڵێت: **" گەر باشترت دەوێت وەها ئەنجامبدە کە باشتربویتە"**، گەر وەها ڕەفتار دەکەی وەك ئەوەی شارەزابیت لە بەکارخستنی کات ئەوا ئەم هێزە ڕۆدەچێتە نێو ئاوەزی هەناویتەوە و دواتریش بەوە دەبیت کە دەتەوێت. ئەم بەشەم بۆ داناوی بۆ فێربوون و یادگرتنی ئەوەی بەڕاستی پێویستتە، لەگەڵ ئاشنابوون بە بەکارخستنی کات و چۆنێتی بەکارهێنانی لە ژیانی ڕۆژانەدا. کاتێك بەهرەکانت دەکەیت بە کردار ئەوا خۆوابینینت و خۆ ڕێزگرتنت بەشێوەیەکی کارا زیاودەبێت. هەروەها بەهات بۆ باشتر دەگۆڕێت، هەروەها باوەڕیشت وەهادەبێت وەك ئەوەی کات تاکە شتی بەنرخی هەبوومان بێت و تاوەکو ماوین گەر بەکاری نەخەین لەدەستی دەدەین. زاڵبە بەسەر کاتی خۆتدا و ئاژەوەری کەشتی ژیانتبە، ئەوجا دەچیتە ریزی ٣٪ی کەسە ژیرەکانی جهانەوە" ڕیزی ئەو کەسانەی گەیشتوون بە سەرکەوتن و ویستراوەکان.

هەوڵی زیادکردنی بەرهەمەکانت و باشترکردنی ئاستی ژیانت بدە، لەبیرت بێت گوتەی فەیلەسوفی ئەڵمانی پێشی ١٠٠ ساڵ گتویەتی:" **زانست بەس نییە پێویستمان بە جێبەجێ کردنیەتی، ئارەزوو بەس نییە پێویستمان بە ئەنجامدانێتی**".

**هەرئێستا بڕیاربدە کە**

**بە بەڕێوەبەرێکی کارا و کات بەکارهێنەرێکی سەرکەوتووبیت..**

# کلیل هەشتەم

## سەرکردایەتی کردن..

## ڕێگەیەك بەرەو لوتکەی ئەنجامدان



((کاتێك هەڵدەستیت بەکاری بەڕێوەبردن و دەتەوێت ناوازە و نایاب بیت، دەبێت وەکو ئەستێرەی باکوربیت، کاتێك ئەو لەجێگەی خۆی دەمێنێتەوە ئەستێرەکانی تر بەدووریدا دەخولێنەوە))

**کلۆنفلۆشیۆس**

## ٥٣- شێوازی تۆ چۆنە؟

((هەموو مرۆڤێك لە هەناویدا هەموو شتانە دەستەبەرن کە ئامازەن بۆ شکۆمەند نواندن و ڕێزگرتن لە بەرامبەر، بەڵام گرنگی پێ نادەن))

**منشوس**



هەر گۆرانبێژێك شێوازی تایبەتی خۆی هەیە بۆ گۆرانی وتن: ئەو شێوازەی دەنگی تێدا بەکاردەهێنێت(چینی دەنگی) ئامازەکانی ڕووخساری، جوڵەکانی جەستەی و هەموو ئەوشتانەی تر کە وەهای لێ دەکات لە گۆرانی بێژانی تری جودابکاتەوە، هەروەها هەر وێنەکێشێك خاوەنی تایبەت مەندی خۆیەتی بۆ وێنەکردن و هەموو سەماکارێکیش بەجودا لەوانی تر دەرەقسێت، خۆنوێن(ئەکتەر)یش. لەڕاستیدا هەریەکە لەئێمە خاوەنی تایبەتمەندی و شێوازی تایبەتی خۆیەتی لەژیاندا کە کار لە هەڵبژاردنەکانی دەکات. ئەم نمونەیە کار لە خوازویستیش دەکات. هەر بەڕێوەبەرێك خاوەنی شێوازی تایبەتی خۆیەتی، کەواتە شێوازی تایبەتی تۆ چییە؟ ئایا تۆ سەرۆك کارێکی کارایت، یان سەرکردە یان تەنها بەڕێوەبەری و هیچی تر؟ جیاوازی لەنێوان ئەمانەدا دەبینی؟ بێگومان جیاوازی زۆر هەیە.

**سەرۆك کار** ئەو کەسەیە تەنها فەرمانەکان دەردەکات و خەڵکانی دەورووپشتی ئاراستە دەکات. بڕوای وایە هەمیشە لەسەر ڕاستە و هەمیشە ڕەخنەی ئەوانی تر دەکات، ئەمەش وەها لەوانی تر دەکات بەردەوام توشی شەرمەزاری بن لە ڕووبەڕوو بوونەوەی،

هەمیشە ئەوانی تر لۆمە دەکات بەبێ ڕوودانی هیچ هەڵەیەک. سەرۆك هێز و سزا وەکو هۆکارێك بۆ هاندان بەکاردەهێنێت لەپێناو تەواوکردنی کارەکاندا، ئەم دووپاتی ئەوەش دەکاتەوە کە ئەوانەی لەدەوروپشتین هەمیشە بەئاگان لەم سەرۆکەیان و ئەمیش هەمیشە دەڵێت: من سەرۆکم، یان شوێن قسەکانی من دەکەویت، یاخود بڕۆ سەر جادە.

بەلام ئەنجامدەر کەسێکە متمانە بەوانی دەوروپشتی ناکات. زۆربەی کاتی بە ئەنجامدانی کارەکانی خۆی بەسەر دەبات. ئەم هەمیشە دەناڵێنێت بەوەی بەڕاستی کاردەکات و کاتژمێرێکی زۆریش لە ئیشکردن بەسەر دەبات و یارمەتی لەوانی ترەوە بۆ نایات و تەنانەت کارمەندانیشی یارمەتی ناکەن. ئەم کەسە ناتوانێت بڕوا بەوە بکات کەسانی تریش وەکو ئەم بەتوانان بۆ ئەنجامدانی کارەکانی ئەم، بۆیە متمانە بەوانی تریش ناکات و هەمیشە لە گوماندایە. بێگومان ئەم بەڕێوەبەرە بڕوای بە پێ سپاردن نییە، پێی باشە خۆی هەموو کارێك ئەنجامبدات. ئەم کەسە هەمیشە سەرقاڵەو زۆر ژیر و خاوەن زانیاری و ئەمکداریشە بەلام گوماناوییە و متمانەی بەکەس نییە و ئەمەش وەهای لێ دەکات هەست بە خەمۆکی و نائارامی بکات و خۆی هەموو خەوشیەکان لەئەستۆ دەگرێت و کاری خۆی بەکەس ناسپێرێت.

**بەڕێوەبەر** بەپێی کردارەی بەڕێوەبردن کارەکانی ڕایی دەکات، لە نەخشەدانانەوە بۆ بڕیاردان و ئەوجا بۆ چاودێری و بەدواداچوون هەنگاو دەنێت. ئەم کەسە شوێن کەوتەی سیستەمی دانراوی کۆمپانیاکەیە بۆ هەڵسوڕاندن و بەرەودان بەکارەکەی. ڕامیارێتی کۆمپانیاکە پەڕتوکی پیرۆزیەتی. ئەم دەتوانێت ٧٥٪ی کاتەکانی بۆ ڕوونکردنەوەی کارە کارگێڕیەکانی تەرخان بکات و کار بە ئەنجامە ئاراستە بووەکانی دەکات. لەکۆتاشدا سەرکردە ئەو کەسەیە کە توانای ئەنجامدانی هەموو کارێکی هەیە بە چاکسازییەوە، ئەوجا دەیخاتە



بواری جێبەجێ کردن و بە ئەنجامی خوازراو دەگات، ئەم کەسە مەشقپێکراوێکی زۆرباشە، هاندراو و هاندەریشە، خۆی توانای دروستکردنی دەستەی کاری یارمەتی دەری هەیە، لێهاتووە لە پەیوەندی دروستکردندا، بەتوانایە لە چارەکردنی کێشەکان، حەزی بە سەرکێشییە، بڕیار دەرێکی لێهاتووە، چاوەڕوانی ڕوودانی شتەکان ناکات بەڵکو خۆی ئەنجامیان دەدات و پێش ڕووداوەکان دەکەوێت، گرنگی بە ئەندامانی دەستەی کاری دەدات وەك چۆن گرنگی بە ئەنجامەکانیشی دەدات، کارکردن ڕەگەڵ ئەم کەسە زۆر بەچێژ و ویستراوە.

**گۆڤاری فۆرچن جیاوازی نێوان بەڕێوەبەر و سەرکردەی بەم شێوەیە دیاری کردووە:**

بەڕێوەبەر کاری کارگێڕی ئەنجام دەدات.

سەرکردە نوێکاری ئەنجام دەدات.

بەڕێوەبەر یارمەتی بەردەوامبوون لەکار دەدات.

سەرکردە گەشە بەکاردەدات و پێشی دەخات.

بەڕێوەبەرپشت بە زاڵێتی دەبەستێت.

سەرکردە پشت بە متمانە دەبەستێت.

بەڕێوەبەر کارەکان بەڕێگەی ڕاستی خۆی ئاراستە دەکات.

سەرکردە کاری دروست ئەنجام دەدات.

سەرکردە خاوەنی تایبەتمەندی داهێنان کارییە، شتەکان بەجوانی دەبینێ، دووپاتکار و چرپیرکردنەوەئیشە، متمانەی زۆری بەخۆی و دەستەکەیەتی. کاری بەڕێوەبردن بەباشی ئەنجام دەدات و خاوەنی ڕەوشتێکی زۆر سوپاس گوزاریانەیە.

**لەهەندێك کۆڕدا( هەڵقەی فێرکاری) ئەم پرسیارە ئاراستە دەکرێت:**

بڕوات وەهایە بتوانم ببم بە سەرکردە؟ یاخود: سەرکردەکان لەدایك دەبن و دروست ناکرێن، یاخود: زۆرگرانە فێری هونەری سەرکردایەتی بیت، یاخود: ئەم تواناییەم نییە...هتد. ئەوانەی بەم شێوەیە بیردەکەنەوە ئەوا خاوەنی بیرۆکەیەکی چەسپاوی وەهان کە سەرکردایەتی خەونێکی نەکردەییە! بەلاّم بە کۆتایی هاتنی کۆرەکە بۆچوونیان دەگۆرێت و ئامادەی ئەنجامدانی نەکردەترین کاریشن بۆئەوەی ببن بە سەرکردەو ئەم کەسانە ئەوەی پێویستیانە تەنها بوونی بۆچوونێکی دروست و تێگەیشتنە لەمانای سەرکردایەتی. فرانسیس بیکۆن دەڵێت:" **هیچ شتێك نییە ئەوەندەی کەمی زانیاری مرۆڤ توشی گومان بکات**".

**((مرۆڤ بەختەوەرنابێت تاوەکو بڕوای بەوەنەبێت بەختەوەرە))**

بابلیلیۆس سیرس

لە بەرنامەی زمانەوانیانەی دەماردا گریمانەیەك هەیە دەڵێت:" **گەر مرۆڤێك توانی هەرشتێك ئەنجامبدات.. کەواتە هەر مرۆڤێکی تریش دەتوانێت ئەمە ئەنجام بدات**"، بۆیە تۆیش دەتوانی فێری هەمووشتێك بیت، فێری مەلە و سەما و وێنەکێشان و چێشت لێنان و کاراتیە و هەرشتێکی تریش بیت" گەر مرۆڤێك بەر لەتۆ فێری ببێت. بەلاّم ئەم بیرۆکەیە کۆمەڵێك ڕێسا هەڵی دەسوڕێنێ، لەپێشیانەوە بوونی ئارەزووە بۆ فێربوون و دەستکەوتنی ئەوەی دەتەوێت. ئەوجا دەبێت بزانیت چۆن ئەمە ئەنجام دەدەی و جێبەجێی دەکەیت بەهەمان ڕێگە و شێواز و جوڵە، هەروەها پابەندبوون بە کەسی یەکەمیشەوە، لەم کاتەشدا تۆ دەبیتە خاوەنی هەمان ئەنجام، ئەمەش پێی دەگوترێت:



تاوتوێکاری لە پرۆگرمسازی(بەرنامەسازی)زمانەوانیانەی دەمار، دەتوانی بەهەمان شێوازی کەسێکی سەرکەوتوو قسەبکەیت و بجوڵێیتەوە و ئەنجامبدەی، دەبینی وەکو ئەو سەرکەوتوو دەبیت. برایان تراس خاوەنی

کتێبی (( ١٠ کلیل بۆ هێزی کەسێتی)) دەڵێت: **" گەر لەو کەسانە بکۆڵیتەوە کەسەرکەوتوو بوونە و هەمان شێوازی ئەوان ڕەفتاربکەی ئەوا تۆیش دەتوانی وەکو ئەوان سەرکەوتووبیت، بەڵام گەر چوویتەوە سەر کەسانی شکست خواردوو تۆیش وەکو ئەوانت لێ دێت"** .

ئێستایش پێت دەڵێم: تۆ دەتوانی ببیت بە سەرکردەیەکی مەزن، ئەمەیە ئامانجی پشت ئەم بەشە.

هەندێك بڕوایان وەهایە خوێندنەوەی کتێب و ئامادەبوونی لە کۆڕەکان و توێژینەوەی هەندێك دۆخ وەهایان لێدەکات بەسەرکردەبن! هەر وا بەم ئاسانییە هیچ دەستکەوتێك بوونی نییە. بۆ بەدبەختی ئەمە بەتەواوەتی لەهەموو کەتوارییەکەوە دوورە" چونکە خوێندنەوە و توێژینەوە و ئامادەبوون لەکۆڕەکان تەنها ئامرازی یارمەتی دەر و ڕێنوێنی کاری تۆن بۆ بوون بەسەرکردە نەوەك خۆیان بتگۆڕن بۆ سەرکردە، ئەمانە زانین و زانیاری بەهێزت لەبارەی سەرکردایەتی کردنەوە فێردەکەن و پێ دەبەخشن. فرانسیس بیکۆن دەڵێت: **" زانین لای خۆیەوە هێزە"**.

زانینیش بەتەنها بەس نییە، تۆ پێویستت بە ئەنجامدانی کار و کردەشە لەپاڵ زانینەکەتدا. سەرکردایەتی پێویستی پابەندییە بە ئاستی ناوازەییەوە، شێوازێکی تایبەتی ژیانە، کردارەیەکی بەردەوام چاکسازی تێداکراوەو فەلسەفەیەکە پێویستی بە تێگەیشتنی قوڵ و بەکارهێنانی ڕۆژانەیە.



تەنها لە وشەکە بڕوانە (( سەرکردایەتی)) و هەست بە هێزەکەی بکە دەبینی ئەم وشەیە ئاژەوەری لێخوڕی کەشتیەکە دەئافرێنێ و دەنوێنێ.

ئەم بەشە هەموو ئەو زانیاریانەت بۆ پێش دەست دەخات کەبۆ بوون

بەسەرکردە پێویستت پێیەتی. تەنها ئەوە دەمێنێتەوە تۆیش لای خۆتەوە ڕۆڵی ڕاستەقینەت ببینی و ئەو زانیاریانەی پێت دەدرێت بەکاریان بێنی. تۆ بە ئەنجامدان و کردار فێردەبیت پتر لەوەی لە خوێندنەوەوە فێردەبیت، وەك ئەرەستۆ دەڵێت:" **ئەو شتانەی پێویستە فێریان بین، فێریان نابین تاوەکو ئەنجامیان نەدەین".**

## ٥٤- ٢٠ تایبەتمەندی بۆ سەرکردایەتی:

((لەسەرەتای ڕۆژەکانی بەهێزیدا دەیبینی پڕ بزەیە و سڵاو لەهەموان دەکات ))

**ئەفلاتون**



پێناسەی من بۆ سەرکردایەتی بە تێپەڕبوونی ساڵان لەبوونیدا دەبێت گۆڕان. تاوەکو توێژینەوەکانم فراوانتر و کارەکانم زیادتر و پۆستەکانم جۆراوجۆرتر بوون باشتر ئاشنای مانای سەرکردایەتی کردن بووم، بۆیە ناتوانین تەنها بەیەك وشە و دێڕ پێناسەی سەرکردایەتیت بۆ بکەم. سەرکردایەتی تەنها کردارەیەك نییە و بەس، بەڵکو شێوازی ژیانی بەڕێوەبەرە سەرکەوتووەکانە. سەرکردایەتی خاوەنی تایبەتمەندی بەهێز و مەزنە، وەکو ئەو تۆوە وەهایە کەلە باخچەکەتدا دەیچێنی و پێویستی بە چاودێرییە، هەموو ڕۆژێك ئاوی بدەی و لە گژوگیای زیانـاوی و بێ کەڵك ڕزگاری بکەی" بۆئەوەی لەکۆتادا بەری خۆی بدات و تۆیش شانازی پێوەبکەیت. سەرکردایەتی پێویستی بە سیستم و پابەندی و پێداگیری و سوربوونە، بۆئەوەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گەشەبکات و هێزی پترت پێ ببەخشێت. ئێستایش باوەکو بیست تایبەتمەندی سەرکردایەتی کارات بۆ بخەمە بەردەست:

### ١-نەخشەدانانی ورد و دروست:

ئەفلاتون دەڵێت: **((سەرەتا گرنگترین بەشی کارە))**، توێژینەوەکان بەوە گەیشتوون کە سەرکردەکان ٨٠٪ی کاتەکانیان بە نەخشەدانان بەسەر دەبەن و ٢٠٪ ی بۆ جێبەجێ کردنی . ڕەنگە ئەمە نەختێك زیادە ڕۆیی بێت، بەڵام بیرۆکەکە ئەوەیە کە سەرکردەکان

زۆر گرنگی بە نەخشەدانانی تەندروست دەدەن" بۆ زامنکردنی سەرکەوتنی نەخشەکانیان و لێکۆڵینەوەی وردی ئەنجامەکانیش دەکەن.



سەرکردەکان هیچ شتێك بۆ ئەگەر و بەخت و لەناکاو ناهێڵنەوە، لێکۆڵینەوەی وردی هەموو دۆخەکان دەکەن بەر لەدەستکردن بە ئەنجامدان. تۆماس ئەدیسۆن دەڵێت:" **هەرگیز ڕوونادات شتێکی بەهادار لەناکاو ئەنجامت دابێت**"، هەروەها سەرکردەکان نەخشەدانەری ورد و لێهاتوون.

## ٢-ڕێکخستن:

لە پەندێکدا دەگوترێت:" **ڕێکخستن یەکەمین فەرمانەکانی ئاسمانە**". برایان تراسی ئێژێ:" **ڕێکخستن یەکەمین فەرمانی زەوییە**"، سەرکردە باش بەهای کات دەزانێت نەوەك تەنها بۆ ڕێکخستنی کات و پارە و کۆششەکان، بەڵکو بۆ چنگ خستنی ئەنجامی باشتر. دەبینی نوسینگەی سەرکردە ڕێکخراوە، ئەو شتانەی پێویستیەتی هەمیشە لە نزیکی خۆیەوە و ڕیزی پێشەوە دایان دەنێت و هەموو ڕۆژێکیش لیستی ئەنجامدراوە پێویستەکان دادەڕێژێتەوە و بەپێی لەپێشیان ئەنجامیان دەدات و کاری نوێ ئەنجام نادات تاوەکو ئەوکارەی بەدەستەوە گرتویەتی تەواوی نەکات، هەروەها خاوەنی سیستمێکی تایبەتی هەڵگرتنی دۆسیەکانە بە وردی و تازەترین شێوە. سەرکردە لە چێوەیەکی ڕێکخراو و گونجاودا کاردەکات.

## ٣-دیاریکردنی ئامانجەکان:

بڕوام وەهایە هیچ سەرکەوتنێك مسۆگرنابێت تاوەکو پێشوەخت ئامانجەکانت دیاری نەکەیت. سەرکردە هێز و گرنگی دیاریکردنی ئامانجەکانی باش دەزانێت. سەرکردە کاتی

گونجاو دەرەخسێنێ بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکانی جا تایبەتی بن یان ئیشی، سەرکردە کات بۆ خێزانەکەیشی دیاری دەکات، کات بۆ هیوایەتە تایبەتیەکانی و خوێندنەوە و حەسانەوە و گەشەپێدانی کەسێتی و کارکردن بۆ گەشەپێدانی دەستەی کاریشی دەرەخسێنێ و دیاری دەکات. سەرکردە هاوسەنگی دەنوێنێت لەنێوان ئامانجە جۆراوجۆرەکانی بۆ بەدیهێنانی باشترین ژیان و مانەوەی خۆیشی وەکو سەرکردە مسۆگردەکات.

## ٤-بڕیاردروستکردن:

سەرکردە ڕاهاتووە لەسەر چۆنێتی بڕیاردانی بێ کەشە و دڵەڕاوکێ. سەرکرە چێژ لە بڕیاردروستکردن وەردەگرێت و چاوەڕوانی ڕوودانی شتەکان ناکات، بەڵکو بڕیاری ڕوودانی دەدات.

## ٥-سەرکێشی:



سەرکردە حەزی بە سەرکێشییەو چون باش دەزانێت سەرکەوتن پێویستی بە سەرکێشییە. سیمۆن دی بوڤوار دەڵێت: **" مرۆڤ لەئاژەڵ باڵاتر دەبێت نەك بەوەی ژیان دروست دەکات بەڵکو بەوەی سەرکێشی ئەنجام دەدات".**

## ٦-توانایی پەیوەندی:

سەرکردە زۆر بەزوو توانای بەستنی پەیوەندی هەیە، گوێگرێکی زۆرباشە، دەزانێت کەی قسەدەکات و چۆن بیرۆکەکانی دەوروژێنێ و نامە و پەیامی خۆی دەگەیەنێ. دەزانێت چۆن ڕووبەڕووی ناکۆکیەکان دەوەستێتەوە و ڕەخنەکان وەڵام دەداتەوە و

خاوەنی توانایيەکی گەورەی هۆگرییە و تەنانەت سەرسەختترین مرۆڤەکانیش دەکاتە هۆگری خۆی.

## ٧-بەکارخستنی گۆڕانکاری:

سەرکردە پێشوازی لەگۆڕانەکان دەکات، لەڕاستیدا گۆڕانکاری بەشێکی تایبەتی ڕەفتارەکانی ڕۆژانەی دەبێت، حەزی بە ڕۆتین نییە و نایەوێت دووجار یەك کار ئەنجام بدات، لەوەش گەیشتووە کە گۆڕان تاکە سەرچاوەی ڕاستی ژیانە. هەروەها پێشبینی ئەو گۆڕانانە دەکات کەبەسەر بازاڕدا دێت و بەپێی ئەم شیمانانەش ڕەفتار دەکات.



کۆنفۆشیۆس دەڵێت: **" گەر مرۆڤ بیری لەدوور نەکردەوە، ئەوا ئۆف و ناڵە لەنزیکەوە هەست پێدەکات".**

## ٨-هەڵسوڕاندنی دڵەڕاوکێ و گوشاری کار:

سەرکردە هەمیشە خاوەنی ئەو بۆچوونەیە کە بەردەوام کاربۆخۆی دەکات تەنانەت گەر لای کەسێکی تریش کاربکات. حەزی لەکارەکەیەتی و چێژ لەئەنجامدانی وەردەگرێ و لەمەترسی دڵەڕاوکێ تێ دەگات، بۆیە دەزانێت چۆن هەڵی دەسوڕێنێ و بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری دەهێنێ. زۆرێك لەو سەرکردانەشی من چاوم پێیان کەوتووە گوتویانە کە بۆ خۆ ڕزگارکردن لە گوشاری دەروونی ڕۆژانە بۆ چەند خولەکێك پیاسەدەکەن یان لە یانەیەکی وەرزشی تەندروستیدا بەشداردەبن بۆ خۆڕزگارکردن لەم گوشارە کەڵەکەبوانەی سەریان. سەرکردە بەهەموو شێوەیەك ئامادەی خۆ ماندووکردنە" بۆ زاڵبوون بەسەر دڵەڕاوکێ و گوشاری کاردا.

**٩-پێ سپاردن:**

سەرکردە بڕوای بەوانی تر و گرنگی کاتیشە. متمانەی بە دەستەی کارەکەیەتی و دەزانێت کەی و چۆن و بەکێیشی دەسپێرێت لەبۆ بەدیهاتنی ئامانجەکەی. هەروەها باش دەزانێت کە پێویستی بە ئەنجامدانی ئەم کارانەیە بۆ ئەوەی دەستی ڤالابێت لەبۆ ئەنجامدانی کاری تر و بەردەوامبوون لە پێشکەوتن.

**١٠-بینین و داهێنان:**

سەرکردە خاوەنی هەستێکی ناوازەی کارکردنە، ئەو توانای بینینی شت گەلێکی هەیە کەسانی تر بەئاسانی نایبینن و لێی ناگەن. هەروەها خاوەنی بیرۆکەی داهێنانکارانە و ڕۆشن هزرانەشە. سەرباری ئەوەی جاروبار ڕەخنە ئاراستەی ئەندێشەکانی دەکرێت، بەلام بەتێپەڕبوونی کات خەلك دەتوانن لەوە تێبگەن کە بۆچی سەرکردە بەم شێوەیە لەشتەکان دەڕوانێت.

**١١-مەشق و فێرکردن و دروستکردنی دەستە:**

سەرکردە خۆی ڕاهێنەر و مەشق پێکارە و چێژ لە ڕاهێنان کردن بە دەستەی کارەکەی وەردەگرێت و بەهای کاری بەگیانی دەستەییەوە وەردەگرێت و گرنگی زۆریش بە دەستەکەی دەدات، ئەندامانی هاندەدات بۆ کارکردن و فێری ئەوەشیان دەکات چۆن بەئامانجی خۆیان بگەن و برەو بەئامانجەکانی دامەزراوەی کار تێدا کردوشیان بکەن.

منسیۆس دەڵێت:" **هیچ پەسنداتیك بۆ سەرکردە مەزنتر نییە لەوەی کە سەرکردە یارمەتی پیاوانی خۆی دەدات بۆ مەشق وەرگرتن لەسەر هێز و کارایی و کاریگەری)).**

## ١٢-هاندان:

سەركردە بۆخۆی كەسێكی هاندراوە( پاڵنەر و هۆكاری هەیە كە وەهای لێدەكات لە دەرەوە و ناوەوەیـــەوە بجولێتـــەوە بـــۆ بـــەدیهاتنی ئامانجـەكانی). سـەركردە لـە گرنگـی هانـدان و مـەودای هێزەكەی تێدەگات. بۆیە ئەوپەڕی هەوڵی كەسـانی نێـو دەسـتەكەی دەدات و پەسـن و ستیشـیان دەكـات جـا بەتـەنها بێـت یـان لـەپێش چـاوی هـەموو ئەنـدامانی دەستەی كارەكەی و ئەوانەی باشترین كار ئەنجامبدات باشترین ڕێزی لێدەنێت.



كینیس بلانكار لە كتێبەكەیدا((بەڕێوەبەری یەك خولەك)) دەڵێـت:**" خـەڵكی سـەیریان دێت لەوەی كاری ڕاست ئەنجام دەدەن".**

## ١٣-بەهرەكان:

سەركردە كەسێكی زانسـتدار و ژیـر و خـاوەن ئـەزمون و پێشـینەی مەزنـە. دەزانێـت لەبارەی چییەوە قسەدەكات، هەمیشە بەدووی ئـەو هۆكارانـەدا دەگـەڕێت كـە گەشـە بـە تواناكانی دەدات و ئاستی نواندن و ئەنجامدانەكانیشی باشتر دەكات، وەكو: خوێندنـەوە و گوێگرتن لە كاسێت و ئامادەبوون لەكۆڕی هاندان و خـولی فێركـاری تایبـەت بەپیشـە و بەهرەكان و توانای كەسێتی، زۆری حەز بە بەهرەی نوێ و باشتركردنی جۆرێتی ژیـانی و چەشـنی كارەكەشـیەتی، هەمیشـە لـە خەباتدایـە بـۆ هەڵشـاخانە سـەر چـیاكان بـەرەو سەركەوتنی مەزن و گەیشتن بە تەواوی ئامانج و مەبەستی خوزراو.

**١٤-متمانە:**

سەرکردە خاوەنی متمانەی تەواوە بەخۆی لە ڕووبەڕوو بوونەوەی قەیرانەکاندا، دەزانێت چۆن بەسەر هەر کێشەیەکدا زاڵدەبێت کە دووچاری دەبێت، لێیەوە فێری شتی نوێیش دەبێت.



متمانە بەخۆکردن دەبێتەهۆی ڕێزگرتنی لەلایەن دەستەکەیەوەو هەرکەسێك لەگەڵیدا کاربکات هەست بە ئارامی و متمانەش دەکات.

**١٥-جوڵە و کردار:**

سەرکردە کەسێکی زۆر بزۆك و بەجوڵەیە و دەزانێت دەستە مانای گوتە و کردارە، هەمیشە لەجوڵەدایە بۆ ئەنجامدانی کارەکان و کاتێك نەخشە دادەنێت و کات بۆ ئامانجەکانی دیاری دەکات، ئەوا بەخێراییش دەجوڵێت بۆ ئەنجامدانی کاری پێویست.

کۆنفۆشیۆس دەڵێت:" **کەسی سەرکردە لە قسەکردندا ئاساییە، بەڵام لەکرداردا سنور بەزێن و نائاساییە**".

**١٦-پابەندی:**

سەرکردە زۆر پابەندی ئەو نەخشانەیە کە دایدەڕێژێتەوە، دەزانێت سەرکەوتن پێویستی بەکاتە و ئاشنای هێزی پابەندیشیە و هەرگیز بەئاسانی خۆی بەدەستەوە نادات. ئەمەکدار و پابەندە بەکاری دامەزراوەکەیەوە و ئەو گروپەشی کە سەرکردایەتی دەکات بۆ گەیشتن بە باشترین ئامرازی پێ ژیان و بەدیهێنانی ئامانجەکەی.

**١٧-وزە:**

سەركردە وزەیەكی مەزنی هەیە، گرنگی بە خوە خۆراكیەكانی دەدات، رێز لە جەستەی دەگرێت، هەموو رۆژێك برێكی گونجاو ئاو دەخواتەوە، بەرێكی مەشقی وەرزشی ئەنجام دەدات، خاوەنی وزەیەكی باشی جەستەیی و ئاوەزییە كە ئەمەش یارمەتی دەدات بۆ ئەنجامدانی ئەو كارانەی دەیەوێت ئەنجامیان بدات.

**١٨-سۆزەكان:**

بەچاوپۆشین لەوەی لەبارەی سەركردایەتییەوە بیستوتە و فێری بویتە، دەبینی هەمیشە سەركردە كەسێكی سۆزداری هەستیارە، حەزی بەوەیە كە ئەنجامی دەدات لەچوارچێوەی سۆز و خۆشەویستیدابێ و رۆژ بە دوای رۆژ ئەنجامدراوەكانی پتر خۆش دەوێت.

**١٩-كشۆكی و توانای گۆڕاندن:**



سەركردە خاوەنی گیانێكی كشۆك و قایلبوونە بە گۆڕانكاری، پلانەكەی دەخاتە بواری جێبەجێكردنەوە و پێیەوە پابەند دەبێت و پێداگیری لەسەر جێبەجێ كردنی دەكات، بەڵام گەر بۆی دیاركەوت نەخشەكانی ئەنجامی خوزراوی نادەنێ ئەوا بەخێرایی بەدووی نەخشەی جێگرەوەدا دەگەڕێ بۆ گەیشتن بە ئامانجی خوازراو، بۆئەمەش ئەوپەڕی هەوڵی گونجاندنی نەخشەكانی دەدات لەگەڵ كار و دۆخەكاندا بەمەبەستی بەدیهاتنی ئامانجەكانی.

**٢٠-سپاردە:**

سەرکردە کەسێکی توندە/بەهێزە لەکاتی پێویستدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا دادوەر و داخوازە، زۆر بەئەمەکە بۆ دامەزراوە و دەستەی کار و کڕیار و سەردانکارانی. هەروەها سەرکێشی بەخودی کارەکەیەوە ناکات، ناپاکی لە سپاردە ناکات و ڕاستگۆیە و پەندی زۆری لادەستەبەرە و لەلایەن ئەندامانی دەستەکەیەوە زۆر باس دەکرێت.



بەڵێ، ئەوانەی پێشووتر گرنگتر تایبەتمەندییەکانی سەرکردەبوون، تۆیش دەتوانی ئەوەی بۆ زیاد بکەی کە سەرکردە بە ژیرانە و سوروبونەوە کاردەکات و بەرلە هاوڕێکانی دەڕواتە سەر کار و پاشی هەموانیش دەگەڕێتەوە. هۆراس دەڵێت:" **ژیان هیچ بەئێمەی مرۆڤ نابەخشێت بەبێ ئەنجامدانی کاری سەخت**"، هەروەها بابلیلیۆس سیرس دەڵێت:" **کارەکان پێویستی بە کاتێکی زۆرە بۆئەوەی بە نایابییەوە بگاتە ئاستی پێگەیشتن**".

## ٥٥-چوار شێوازەکەی سەرکردایەتی کردن:

((دوایین هەڵبژاردەی سەرکردە ئەوەیە لەپشتیەوە کەس گەلێك بەجێ بهێڵێت خاوەنی باوەڕ و حەز و ئارەزووی بەردەوامی دانبن بەکارەکانی))

**والتەر لیبمان**



بیستساڵ لەمەوبەر، کاتێك خەریکی وانە خوێندن بووم لەبارەی کارگێڕی ئوتێلەکانەوە، فێری شێواز گەلێکی جۆراوجۆری سەرکردایەتی بووم، فێری ئەوەش بووم کەئەم سەرکردانە دابەشی دووجۆری سەرەکی دەبن: ستەمکارانە و دیمۆکراتی.

### ١-ستەمکارانە/ئۆتۆکراتی:

ئەم سەرکردەیە هەمیشە بە کارمەندانی دەڵێت وەهابکەن و ئەنجام بدەن، ئەوانیش بەبێ هیچ ئەملا و ئەولایەك جێبەجێی دەکەن. ئەمیش تاکە سەرچاوەی بڕیارەکانە و گرنگی بەکارەکانیش دەدات و تیشك دەخاتەسەر ئەنجامەکان، بۆیە دەیبینی لەکار و ئاستی بەرهەمیدا ناوازەیە، بەڵام لەڕووی پەیوەندییە مرۆییەکانەوە لاوازە.

### ٢-دیمۆکراتی:

لەگەڵ کارمەندانیدا پرۆژەکان تاوتوێ دەکات و بە گرنگییەوە لە پێشنیارەکانیان دەڕوانێت، ئەوجا دوابڕیار لەبارەیەوە دەدات. سەرکردەی دیمۆکراتی گرنگی بە ڕوونکردنەوەی کێشەکان دەدات بۆ دەستەی کارەکەی و یارمەتییان دەکات بۆ دۆزینەوەی چارەکان و تێبینی ئەوەش دەکرێت گرنگی دەدات بە پەیوەندییە مرۆییەکان و کارکردن بە گیانی دەستەییانە.

هەمیشە هەستم بەوەدەکرد ئەم تەرزانە ناتەواو و کەموکورتن، بۆیە بەردەوامبووم لەسەر لێکۆڵینەوە و توێژینەوە تاوەکو لە کۆتادا بۆم دیارکەوت کە چوار جۆری سەرەکی سەرکردایەتی هەیە و ناتوانن لەیەکتر جودا ببنەوە. ئەمەش نمونەیەکە:

کاتێك دەستم دایە ئەنجامدانی وەرزشی تێنسی سەرمێز (بنگ بونگ)، ئامانجم بوون بە پاڵەوانی یارییەکە بوو. من زۆر بەختەوەربووم بە دۆزینەوەی مەشقوانێکی نـاوازە... مەشقەوانەکە لەسەرەتای مەشقەکانەوە چەندین چیرۆکی بۆ گێڕامەوە لەبارەی بنگ بونگەوە و باسی زمانی یاریەکەی بۆکردم، ئەوجا هەنگاو بە هەنگاو فێری چۆنێتی یاریکردنمی کرد. ڕۆژانە سێ کاتژمێر لەهەفتەیەکدا حەوت ڕۆژ و بۆماوەی شەش مانگ مەشقم دەکرد، ئەوجا وەها لەگەڵمدا دەستی پێکرد وەك ئەوەی لە یاری کۆتایی و پاڵەوانێتیەکەدا بم، ئەوجا بەردەوامبوو لەسەر مەشق پێکردنم تاوەکو تاڕادەیەکی زۆرباش فێری یارییەکە بووم، دواتر یاریکردن ڕەگەڵ یاریکارە جیاوازەکانی یانەکاندا بۆی ڕێکخستم، کاتێك دڵنیابوو لەوەی کاتی ئەوەهاتووە هانی دام بۆ بەشداری کردنم لەیاری نێودەوڵەتی، توانیم ببم بە پاڵەوانی تێنسی کۆماری میسر، ئەوجا سەرلەنوێ لەگەڵمدا دەستی پێکردەوە، دیسانەوە ئاراستەی کردم و هەڵەکانی بۆ ڕاستکردمەوەو هەروەها فێری فێڵ و هونەرەکانی یاریەکەی کردم، ئەوجا بوومە بەشداری پاڵەوانێتی جیهان کەلە میونخ ی ئەڵمانیا ئەنجام درا.

ئایا ئەو مەشق پێکارە سەرکردە بوو؟ کارەکەی سودی هەبوو؟ بێگومان، بەڵێ. توانی هەر چوار تەرزەکانی سەرکردایەتی بەکاربێنێت، بەپێی کات و هەڵوێستەکان:

١- **ئاراستەکردن:** لەسەرەتاوە بە قسەکردن لەبارەی یاریەکە و ناسینی لەگەڵمدا دەستی پێکرد.

٢- **مەشقکردن:** ئەوجا دەستی دایە مەشقپێکردنم، لەسەر ئەنجامدانی یارییەکە.

٣- **هاندان و یارمەتی و پشتگیری:** هەمیشە لەپاڵم بووە و هانی داوم و پشتگیری کردووم.

٤- **پێ سپاردن:** وای لێکردم بەشداری پاڵەوانێتیەکان بکەم و بۆخۆم کاری خۆم ئەنجام بدەم.

زۆرێك لە بەڕێوەبەران دەکەونە هەڵەی ئەوەوە کە خەڵکی دادەمەزرێنن و پێیان دەڵێن: ئەمە بکەن و ئەوە بکەن، ئەوجا بڕوایان وەهایە بەبێ مەشقپێکردن و هاندان کارمەندە تازەکان کارەکانیان ئەنجام بدەن. ئەنجامی ئەمەش شێواندنی بیری کارمەندە تازەکان و تێکدانی کارەکە و زۆربوونی ڕێژەی دەست لەکارکێشانەوە دەبێت. تۆ پێویستت بەوەیە ڕاستەوخۆ چاوت بە کارمەندە تازەکانت بکەوێت، فێریان بکەی و ڕایان بێنی لەسەر هەموو شتێك، تاوەکو تەواو دەزانی ئەوان لەهەموو شت تێدەگەن، ئەمە هەنگاوی یەکەم دەبێت، ئەوجا ڕاهێنانیان بەشێوەیەك کە بەبێ یارمەتی ئەوانی تریش بتوانن کارەکانیان ئەنجام بدەن، سێیەم: دەبێت لەبواری کارکردندا هەلی تەواویان پێبدەی بۆ متمانە بەخۆکردن، ئەوجا هەنگاوبنێ بۆ قۆناغی دوایین کە ئەویش پێ سپاردنە.

ئێستا پاش ئەوەی پێ سپاردنت ئەنجامدا، ئەوجا جارێکی تر ئاراستەیان بکەرەوە فێری بەهرە و کاری نوێیان بکە و چوار شێواز و تەرزەکانی سەرکردایەتییان پێ ئاشنابکە، بۆئەوەی بەردەوام سەرقاڵبن بە ئەنجامدانی کار و فێربوونی شتی نوێ و هەوڵدان بۆ گەیشتن بە ئەنجامی ئامانجی خوازراو.



## ٥٦-چۆن دەستەڵات بەدەست دەهێنی و بەکاریشی دێنی:

((تەنها یەك خاڵی وەستاوم بدەرێ بۆئەوەی لەسەری بوەستم، ئەوجا منیش هەسارەی زەوی دەجوڵێنمەوە))

**ئارخەمیدس**





کاتێك تواندارد‌ەبیت بۆئەوەی بەسەرکردەبیت، پێویستە لەبیری نەکەیت تۆ خاوەنی نازناوێکیت دەبێت رێزی بگریت، تۆ یاریچی دەستەکەتی، بەڵام دەبێت جاربەجار بریاری گۆرینی یاریکارەکانیش بدەی" چون ئەمە لەبەرژەوەندی هەمواندا دەبێت. ولیام شکسپیر جارێکیان گوتی: **" جیاوازی نێوان سێوی چاك و خراپ زۆر کەمن"**، دەبێت بزانیت چۆن یاری دەستەڵاتداریتی خۆت دەکەیت، بۆئەمەش فەرموو بەم رێگەیە ئاشنابە:

١- وەها لە هەموان بکە وای ببینن کە تۆ زاڵی بەسەر ئەو دۆخانەی پێویستی بە سەرکردایەتی و کەسێتی مەزنە.

٢- هەروەها پیشانی ئەوانی تریشی بدە کە تۆیش خاوەنی بەهرە و زانیاری پێویستی بۆ ئەنجامدانی کاری باشتر لەوان.

٣- بیرۆکەی نوێ بهێنە ئاراوە، رێگەی سەرکێشانە هەڵبژێرە، لە بۆچونی ئەوانی تریش بپرسە و وەهایان پیشانبدە کە تۆ خاوەنی توانایەکی باشیت بۆ پێشخستنی ئەنجامەکان.

لەم کاتەدا زۆر وشیاربە لەوەی نەکەویتە داوی ناوبانگی و نازناوەکەتەوە و تەنها پشت بە نازناوەکەت ببەستیت بۆ بەدستهێنانی رێز.

ئێستا دەتوانی ببیت بە سەرکردەیەکی کارا و ئەوەی پێویستت تەنها بە بڕیاردانە بۆ جێبەجێکردن. سەرکردایەتی بکەرە ڕێگەی تایبەتی خۆت لەژیانتدا و دەبینی کەتۆ دەست بە گۆڕانکاری دەکەیت و لێرەوەش زاڵدەبیت بەسەر تەواوی ژیانتدا و لەهەر چواربەشەکەی ژیانتدا سەرکەوتن و پێشکەوتنی بەردەوام بەدەست دەخەیت.



سەرکردایەتی کارگێڕی نییە و بەس بەڵکو تەرزێکی فەلسەفی و شێوازێکی ژیانە.

((پێویستە لەسەر ئەوانەی دەیانەوێت ببن بە دەستەلآتدار دەست بەدۆزینەوەی سەرکردەی خۆیان بکەن، ئەوانەشی بەسەر کێبڕکێ کارانیاندا زاڵدەبن پێویستە بەهێز و مەزنبن، ئەوانەشی دەیانەوێت بەهێزبن دەتوانن هێزی ئەوانی تریش بەکاربێنن، بۆئەوەی هێزی ئەوانی تر بۆخۆت بەکاربێنی پێویستە خۆشەویستییان بەدەست بخەی، بۆئەوەی خۆشەویستی ئەوانی تر چنگ بخەیت دەبێت خۆت هەڵبسوڕێنی، بۆئەوەی خۆت هەڵبسوڕێنی پێویستە کشکۆك بیت)). کتێبی سەرکردایەتی ستراتیژی-چینی.

**هەرئێستا بڕیاربدە کە بە بەڕێوەبەرێکی کارابیت..**

# کلیلی نۆیەم

## دروستکردنی دەستە..

## هێزێکی ڕەها بۆ دامەزراوەی سەرکەوتوو



((ئەو بنەمایەی ئاوەزی ئاراستەکراوی لەسەر دادەمەزرێت ئەوەیە کە دوو یان زیاتری کەسان لە شوێن کەوتنی یەك ئامانجدا کۆششی زیادتر دەکەن و لەگەڵ گرتنەبەر یەك ئاراستەی هزری ئەرێیدا هێزێك پێکدێنن کەناڕووخێت))

**ناپلیۆن هیل**

## ٥٧-دەستەی کار..شوێن دەست دیار:

(یەك شتی زۆر گرنگ لە ژیان فێربووم ئەویش ئەوەیە کە دەتوانم هەموو شتێك ئەنجام بدەم بەڵام ناتوانم بەتەنها ئەنجامی بدەم، هیچ کەسیش ناتوانێت ئەمە ئەنجام بدات))

**د.رۆبێرت شۆلر**

پیاوێکی پیر دە منداڵەکەی لەدەوروپشتی خۆی کۆکردەوە، ئەوجا هەریەکەیان چیلکە دارێکـی پێـدان و داوای لێکـردن یـەك بـە دوای یـەك بیشـکێنن. منداڵـەکان زۆریـان سـەیر لێهـات و لەنێوخۆیانـدا کردیـان بـە چرپەچـرپ و پرسـیارکردن لـەبارەی ئـەم رەفتـارەی باوکیانـەوە، بـەڵام باوکیـان داوای لێکردن چی پێ گتون ئەنجامی بدەن، ئەوانیش ئـەنجامیان دا، کارەکـە بـۆ هەنـدێکیان ئاسـان و بـۆ



هێندێکیش گران و نارەحـەت بـوو، هەرچـۆنێك بێـت توانییـان دارەکـە بشـکێنن. ئـەوجا باوکیان کە ئەمەی بینی بزەیەکی کرد و دواتر هەریەکـە و چـیلکە دارێکـی تـری پێـدان و داوای لێکردن هەمووی پێکەوە ببەستنەوە، ئـەوانیش وەهایـان ئەنجامـدا. ئـەوجا داوای لێکردن دانە دانە هەوڵی شکاندنی ئەم کۆڵە چیلکە دارە بـدەن، بـەڵام هـەموویان تاقیـان کردەوە و نەیان توانی. ئەوجا باوکیان داوای لێکردن بەجوانی گوێی بـۆ رادێـرن و پـاش نەختێك بێدەنگی ئەوجا پێی گـوتن:" کورەکـانم دیتتـان کاتێـك هەریەکـە و چیلکەیەکم پێدان توانیتان بیشکێنن ، بـەڵام کاتێـك هـەموو چـیلکەدارەکانم پێکـەوە بـۆ کۆکردنـەوە نەتان توانی بیشکێنن و تەنانەت زیانێکیشی پێبگەیەنن. ئەمە بەسەر ئێوەشدا جێبـەجێ دەبێت، گەر جیاببنەوە و ناکۆکبن بەئاسانی بەسەرتاندا زاڵدەبن و لەناوتان دەبەن، بەڵام گەر وەکـو یـەك دەسـتە پێکـەوە کۆوەبـوون ئـەوا هـیچ کـەس ناتوانێـت زەفـەرەتان پـێ

بەرێت، بەڵێ ئەمە ئامانجی ئەم کارەی من بوو: هێز لە کێتیدایە، یەک دەستەبوون نەهێشتنی هەلە بۆ دوژمن".

بیرۆکەی دەستەی کارمان لەهەموو شوێنێکدا پێویستە، گەر لەئاژەڵیش بروانی دەبینی شێر و پڵنگ و گورگیش بە دەستەوە پەلامار دەدەن و ڕاودەکەن، ئەم بیرۆکەی دەستەی کارە دەگەڕێتەوە بۆ دێرزەوان، باوداپیرانی سەرەتاییمان ڕاهاتبوون لەسەر ئەنجامدانی کاری هەرەوەزی لەپێناو مانەوەدا. کاتێك دەڕۆیشتن بۆ ڕاو، چاو تیژەکان بۆ پاسەوانی و چاودێری دادەنران، ئەوەشی لە ڕاکردندا خێرابوو هەڵدەستا بە ئەنجامدانی کاری ڕاوکردن. لە جەنگی جیهانی دووەمیشدا ئەو هێزەی بەگیانی دەستەییەوە کاری دەکرد سەرکەوتنی مەزنی تۆماردەکرد. سەرکەوتنی بەردەوامی ژاپۆنیەکان تواناداریانە بۆئەنجامدانی کاری هەروەزی و دەستەیی، گرنگ نییە بەلایانەوە کێ خەڵات دەکرێ. گرنگ ئەوەیە کارەکەیان ئەنجامی هەبێ و پێکەوە سەرکەوتووبن، هەرئەمەشە وەهای لەژاپۆن کردووە ببێت بە یەکێك لە دەوڵەمەندترین دەوڵەتانی جهان.

بەڵێ، دەستەی کار شێوازێکی کارکردنی کارا و بەردارە" چون هەلی هەستکردن بە بەرپرسیارێتی بۆ هەموو تاکێکی دەستەکە دەڕەخسێنێت، ئەمەش وەهایان لێدەکات پتر پابەندبن و بەسوربونیشەوە کارەکانیان خاستر ئەنجام بدەن و چاوەڕوانی بەدیهاتنی ئەنجامی مەزن بن، کارکردن بەگیانی دەستەییەوە یارمەتی خەڵکی دەدات بۆ بەدیهاتن و بەردەست خستنی باشترین چێژ و متمانە بەخۆکردن و خۆ بە بەهاردارزانینیش دێنێتە بوون. ئەمەش لای خۆیەوە دەبێتە هۆی باشترکردنی پەیوەندییەکان و و پترکردنی ئەنجامەکان و بەدیهاتنی بەرئەنجامی ناوازە. دەستی کار بە هەموو ئاسانییەکەوە هێزی بنچینەیی هەموو دامەزراوەیەکە.

**((بۆزینەوە و داهێنان و دەستکەوتی مەزن پێویستی بە هاریکاری دەستگەلی زۆرە))**

**ئەلێکساندەر گراهام بیل**

گەر دەستەی کار ئەوەندە گرنگی هەبێت، کەواتە بۆچی زۆرینەی دامەزراوەکان بەکاری ناهێنن و کەڵکی لێ نابینن؟ تاوەکو وەڵامی پرسیارەکانم بدۆزمەوە لە سەدان بەڕێوەبەر و کارمەندانم پرسیوە، بەتایبەت ئەوانەی کە بیرۆکەی دەستەی کار بەکارناهێنن، زۆر قسەم لەگەڵدا کردوون، زۆربەشیان بەم شێوەیە وەڵامیان داینەوە:

- ئێمە بڕوا بەوە ناکەین ئەم بیرۆکە کارابێت و کەڵکی بۆئێمە هەبێت.
- بڕواناکەین ئەم بیرۆکەیە لەگەڵ جۆری ئیشەکەی ئێمەدا بگونجێت.
- ئەمە تێچوونی زۆردەبێت و کاتیش زۆر بەفیڕۆ دەدرێت.
- ئەرك و ماندووبونی زۆرە.
- ئەوەندە سەور و تەهەمولّمان نییە بۆ ئەوەی لەگەڵ کارمەنداندا دانیشین.
- ئەمە پێویستی بەوەیە خۆت مەشقپێکار و مامۆستا و بەدواداچونکاریش بیت،

کێ ئەوەندە کات و سەوری هەیە ئەم کارانە بکات؟ بەڕاستی ئەمە سۆپەرمان و مرۆڤی سەیرەکار(خارق) دەوێت.



سەیر ئەوەیە بەڕێوەبەران هەمیشە کۆبوونەوە لەگەڵ کارمەندانیاندا ئەنجام دەدەن و ئاراستەیان دەکەن و پشتیان پێ دەبەستن بۆ بەدیهاتنی ئەو ئامانجەی دەیانەوێت، کەچی ڕقیشیان لە بیرۆکەی دەستەی کارە، لێرەدا تاکە جیاوزییەکی ئەم بەڕیوەبەرانە و دەستەکاران ئەوەیە کە ئەم بەڕێوەبەرانە هەمیشە داوا لە کارمەندانیان دەکەن وەهابکەن و وەها نەکەن و گەر هەڵەیەکیش ڕوویدات دەیخەنە ئەستۆی ئەوانی تر و خۆیانی لێ بەدووردەخەن. دەست دەکەن بە هەڕەشەوگوڕەشە و هەمیشە گوشار دەخەنە سەر کارمەندانیان و دەیانەوێت بەم ڕێگەیە ئەنجامی خوازراو چنگ بخەن. هۆراس جارێکیان گوتی: **" ئەو هێزەی دانایی جێب دەگرێتەوە بەهۆی زۆر کێشیەوە دادەکەوێت"**، ئەم بەڕێوەبەرانە هیچیان دەست

ناکــەوێت و بــە ترســنۆکانەتر لــە کارمەنــدانیان چــاوەڕوانی هــەڵێکن بــۆ دەســت لەکارکێشانەوە.

لێکۆڵینەوەکان دەڵێن کە زۆرێك لە بەڕێوەبەران لە دەستەی کار دەترسێن لەبەر ئەوەی لەم کاتەدا هەست بە کەمبوونەوەی دەسەڵات و ئاسایشی دەکەن، یاخود ڕەنگە کێشەی تایبەتیان هەبێت کەپەیوەست بێت بە خودەوە، لەڕاستیدا ڕەگەڵ دەستەی کاردا پێچەوانەی ئەو بۆچوونە ڕاستە، ئەوان دەتوانن ئاسایشدارتر و دەسەڵاتدارتریش بن.

گەورەترین بنەمای بەڕێوەبردن بریتیە لە: **" گەر باوەڕت بەوانی تر هەبوو دەتوانی پەرچوو بئافرێنی، بۆئەوەی باشترینی ئەوانی تریش بەدەست بخەیت، تۆ بەباشتر لەوان بیربکەرەوە و متمانەشیان پێبکە"**، لەبەرئەوەی دەستەی کار هێزێکی ناوازە دەبەخشێت بۆیە ئامانجی پشت ئەم بەشی کتێبەیە.

## ٥٨-پێنج بنەما بۆ دروستکردنی دەستە-گروپی کار:

((گەر هەمووان بە سەرکەوتن پێکەوە بەرەو پێشەوە دەڕۆن، ئەوا سەرکەوتنیش خۆی گرنگی بەخۆی دەدات(خۆی دەهێنێتە بوون) ))

**هنری فۆرد**

پێویستە دەستەی کار لەسەربنەمایەکی بەهێز بونیات بنرێت. متمانە و ڕێز دوو



کۆڵەکەی سەرەکی و بەهێزی پارێزەری دەستەکەن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی کەشە ناهەموارەکان. ئەم دوو کۆڵەکەیە بەسودن بۆ بونیات نانی دەستە و لەرێگەیەوە دەستەکە دەتوانێت بەسەر چیای سەرکەوتندا سەربکەوێت و بگاتە بەرزایی و لوتکەی نوێی دوورتر و بەپیت تر. پێنج بنەمای سەرەکی هەیە کە دەستەی کاری لەسەر بونیات دەنرێت، ئەوانیش:

### ١-متمانە:

جۆن. ئا. هۆمز ئاماژە بەوەدەکات کە:" **هیچ شتێك لەوە باشتر نییە بۆ دڵ کە خۆت**



**نزم بکەیتەوە و ئەوانی تریش بۆ بەرزتر ئاراستەبکە**"، دەبێت یارمەتی ئەندامانی دەستەکەت بدەی بۆئەوەی هەست بە متمانەکردن بەخۆیان و تواناکانیان بکەن لەبۆ بەدیهاتنی سەرکەوتن و لە بەرامبەر ئەمەشدا متمانەیان بەرامبەر بە تۆ زیادتر دەبێت، هەروەها متمانەیان بە دامەزراوەکە و ئەندامەکانیشی دەبێت. هەروەها دەستە پێویستی بە کەشێکە متمانەی تێدا زاڵبێت،

هەروەها ئەندامەکانیشی پێویستە بڕوایان بەوەبێت کە کارکردن بە دەستەیی یارمەتییان دەدات بۆ ئاسان گەیشتن بەئامانجی دەستەکە و تایبەتی خۆیشیان، بە تایبەت دەتوانن بە ئامانجە کەم بەدیهاتووەکانیشیان بگەن.

## ٢-گرنگی پێدان:



هەر مرۆڤێك ملوانکەیەکی شاراوەی هەیە کە لەسەر سنگیەتی و لەسەری نوسراوە:" وەهام لێبکە هەست بەگرنگی بکەم"، هەر ئەندامێکی دەستەکەت دەیەوێت هەست بە گرنگی پێدانی بکەی، لە ڕاستیدا ئەندامانی دەستەکە پێویستە بەباشی هاریکاری یەکتربکەن و گرنگی بەیەکدی بدەن، هەروەك چۆن گرنگیش بە دامەزراوەکەیان بدەن. گرنگی پێدان یەکێکە لەو بنەمایانەی کە دەستەکەی لەسەر دادەمەزرێت نەوەك لەبواری کاردا بەڵکو لەلایەنی ژیانی کەسێتیشەوە.

هەروەها پێویستە هەر ئەندامێکی دەستەکە چاوڕێی ئەوە نەکات کەس کارەکەی ئەم بکات، بەڵکو دەبێت ئیشی خۆی بەباشی و بەبێ دواکەوتن ئەنجامبدات، دەبێت تۆی بەڕێوەبەریش ئەوەیان بۆدیاربخەی کە بە ڕاستی گرنگییان پێ دەدەی. پەندێکی لاتینی هەیە دەڵێت:" **ئەوەی بۆکەسێکی ئەنجام دەدەی لەڕاستیدا بۆخۆتی دەکەیت**"، کاتێك گرنگی بەکەسێك دەدەی ئەوکات هەست بەگرنگی خۆت دەکەیت، هەروەها ئەویش لەبەرامبەردا گرنگیت پێ دەدات، لێرەوە بەختەوەری ڕەها بەرجەستە دەبێت.

## ٣-پابەندی:

من باوەڕم وەهایە کە کاری ڕاستەقینە و قورس هۆکارە بۆ سەرکەوتن، سەرکەوتنیش بە لوتکەت دەگەیەنێت، بەڵام پێویستیشمان بە پابەندی و پێداگیرییە بۆ مانەوە لە

لوتکـە" بەبـەردەوامی، پێویسـتە ئەنـدامانی دەسـتەکە پابەنـدی کـار و ئامانجـەکانی دامەزراوەکەبن، هەروەها پێویستە لەسەریان پابەندی ئامانجە گشتی و تایبەتیەکانیش بن.

## ٤-هاریکاری:



گەر کۆمەڵێك کەسی ئاسایی پێکەوە هاریکاربوون ئەوا دەتوانن کاری نائاسایی ئەنجام بدەن و ئەنجامی ناچاوەڕوانکراو بەردەست بخەن، بە هاریکاری کەسانی ئاسایی دەتوانن بگەن بە ئاستی ناوازە و سەرکەوتنی بێ سنوور. لێرەوەش پێویستە لەسەر ئەندامانی دەستەکە پێکەوە هاریکاربن لەسەر بنەمای بەرژەوەندی گشتی نەوەك بەرژەوەندی تایبەتی. پەندێکی چینی هەیە دەڵێت: **"گەر بە بۆچوونی هەزار کەس قایلبیت دەبیتە خاوەنی هێزی هەزارکەس، بەڵام گەر لەگەڵ بۆچوونی دەهەزاردا ناجۆربیت یەك دانەشیان تیانابێت کەڵکی بۆت هەبێت".**

## ٥-بەشداریتی لە بڕیارپاستی(مسداقیەت)دا:



پێویستە هانی هەموو ئەندامانی دەستەکەت بدەیت بۆئەوەی بەڕاستی بڕوایان بەیەکتر هەبێت. دەبێت بەوەیان ڕابێنی کەناتوانن بەتەنها کارەکانیان ئەنجامبدەن بەبێ یارمەتی هاوکاری دەستەکەیان، ڕێك وەکو دەستەیەکی یاریچی تۆپی پێ. دەبینی یاریکارەکان بەخێرایی ڕادەکەن و حۆلات ئەنجام دەدەن و پاسات دەکەن بۆ بردنەوە، کاتێك بردیانەوە هەموویان لەو بردنەوەیەدا بەشدار دەبن و ئەوان دەڵێن: بردمانەوە نەوەك بردمەوە.

## ٥٩-حەوت بنەما بۆ دروستكردنی دەستەيەكی سەركەوتوو:

((كە كۆبووينەوە كەسمان لەوی تر باشترنيە))

**كينيس بالانشارد**



گەر بڕیارتدا بۆ جێگەیەك بڕۆی ئەوا پێویستە بزانی بۆچی بۆ ئەو جێگەیە دەڕۆی، دواتر بزانی بەچی بۆی دەڕۆی؟ پێویستت بە نەخشەڕێگەیەکە کە بت گەیەنێت بەو جێگە یان شوێنە و بەئاسانی بێ کێشە بتوانی لەوێدا خۆت ببینیتەوە. ئەمەش دیسانەوە هاوتایە لەگەڵ کردارەی دروستکردنی دەستەدا. لەسەرەتاوە دەبێت بڕیاربدەی کە دەستە دروست دەکەیت و متمانەت بەوە هەبێت کەئەمە بەڕاستی خواستی تۆیە ئەوجا دەبێت نەخشە ڕێگەیەك دابڕێژی بەرەو سەرکەوتن. بۆئەمەش پێویستت بە ڕێبەرییەکە، سیستمێك، نەخشەیەك ڕێگەت بۆ ڕوون بکاتەوە و پیشانبدات، بۆئەوەی بتوانی دەستەیەکی بەهێز و پتەو و سەرکەوتوو پونیات بنێی، لێرەشدا دەبێت بزانی کە ئەم ڕێگەیە ئاسان نییە. سینکا لەم بارەیەوە دەڵێت:" **ڕێگەیەکی چەفت و چێڵە ئەو ڕێگەیەی دەتگەیەنێتە بەرزاییەکانی سەرکەوتن**" . بۆیە ڕێگەبدە منیش ئەو نەخشە ڕێگەیەت پیشان بدەم کە یارمەتیت دەکات بۆ پونیات نانی دەستەی کاری سەرکەوتوو، ئەمەش ئەم حەوت بنەمایە دەگرێتەوە و لەخۆ دەگرێت:

### ١-دروستکردنی دەستە:

بەڵێ بڕیاردان لەسەر دروستکردنی دەستە گرنگە، لەوەش گرنگتر بەشدارپێکردنی کەسانی گونجاو و ژمارەی کەسەکان و بنچینەی دیاریکردنیانە، بۆیە پێویستە سەرکردە بەباشی گرنگی بدات بە پێکهێنانی دەستە، نابێت هەرلەخۆیەوە کەس گەلێك بخاتە نێو

دەستەکەیەوە تەنها لەبەرئەوەی بەدڵی خۆین، بەڵکو پێویستە لەسەر بنەمای شیاوی بێت، هەروەها پێویستە داوا لە ئەندامە دیاریکراوەکان بکات یارمەتی بدەن بۆ هەڵبژاردنی کەسانی گونجاوی تر. جارێکیان بەڕێوەبەرێك پێی گوتم: " توانای سەرکەوتنی من بەندە بە هەڵبژاردنی کارمەندگەلێکی گونجاو بۆ کارکردن ڕەگەڵمدا"، کاتێك لێم پرسی چۆن ئەم کارە ئەنجام دەدەیت، گووتی:" من ئەو کەسانە هەڵدەبژێرم کە ڕەفتاریان جوانە و حەزیان لەپێشکەوتن و گەشە و بەتایبەت ئەو کەسانەش ئارەزووی کاکردنی دەستەیی دەکەن" .

**٢-مەشق:**

پاش دیاریکردنی ئەندامەکانی دەستەکە،سەرکردە هەڵدەستێت بە مەشقپێکردنی دەستەکە یاخود کەسێکی تر بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ڕادەسپێرێت. لەسەرەتادا هەڵدەستێت بە ئاراستەکردنی کارمەندان بۆ ئەوەی کارمەندان بزانن دەبێت چی بکەن و لەچی بەدووربن، هەروەها بەڕێوەبەرەکە هەڵدەستێت بە ناسینی کارمەندە تازەکان بە ئەندامانی تری کارکەری، ئەوجا بەکار و ئیشی ئەوانی تریشی ئاشنا دەکات. ئینجا هەموو ئامرازە پێویستەکانی کارکردن بە ئەندامە تازەکە دەبەخشێت، هەروەها پێویستە بەڕێوەبەرەکە بەتەواوەتی بەئاگابێت لەوەی ئەم کارمەندە بە توانایە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەی پێی دەسپێرێت. زۆرێك لە دامەزراوەکان ڕێگە بە کارمەندە تازەکان نادەن ئاشنای کڕیار و سەردانکاران بن مەگەر سێ مانگ بەسەر بوون بە کارمەندییاندا تێپەڕ بووبێت. مەشقی باش خاستر هانی کارمەندەکە دەدات بۆ جوان ئەنجامدانی کارەکەی، بەمەش ئەنجامی خوازراو بەردەست دەخات. لێرەدا پەندێکی بەناوبانگ دەهێنمەوە کە دەڵێت:" **ماسیەك بدەرە کەسێك ئەو ڕۆژە تێرت کردووە، فێری ماسی گرتنی بکە هەموو تەمەنی تێرت کردووە".**

**٣-پەیوەندی:**

ئەوکاتەی باشترین کارمەند بۆ کارکردن هەڵەبژێردرێت و بەباشی مەشقیان پێ دەکرێت و ئامادەی ئەنجامدانی کارەکانیان دەبن، لەم کاتەدا پێویستە لەسەر سەرکردە کردارەی پەیوەندی ئەنجام بدات. هەندێك لە بەڕێوەبەران بڕوایان وەهایە کە پێویستە لەسەر کارمەند خۆی کاری خۆی بەپشت بەستن بەخۆی ئەنجام بدات، ئەوجا زۆریان سەیر لێدێت کاتێك کارمەندەکە دەست لەکاردەکێشتەوە! ئەوان نازانن ئەم کارمەندە بۆیە دەستی لەکارکێشاوەتەوە چونکە هیچ هاندەرێکی نەبووە بۆ کارکردن و هیچ کەسێك نەبووە ئاراستەی ڕێگەی ڕاستی بکات، بەکورتی لەبەرئەوەی پەیوەندی بەوانی ترەوە پچڕاوە بۆیە دەستی لەکارکێشاوەتەوە. هەربۆیە پێویستە دەرکی پەیوەندی ڕەگەڵ کارمەندانتدا بکەیتەوەو بەتایبەت کارمەندە تازەکان. هەوڵبدە بەردەوام ڕەگەڵیان کۆببیتەوە و کەی پێویستیان پێت هەبوو لەلایان ئامادەبیت. گرنگ نییە چی دەکەیت، گرنگ ئەوەیە بەباشی ئاراستەیان بکەی و پەیوەندییان ڕەگەڵ دروستبکەی، بۆئەمەش پێویستە ئەم خاڵانە ڕەچاو بکەیت:

- وای تێبگەیەنە سەرکەوتنی ئەو سەرکەوتنی هەموو کارمەندانی تری دامەزراوەکەیشە.
- وەها ڕەتار لەگەڵ هەموو کارمەندێکتدا بکە وەکو ئەوەی باشترین بێت.
- گرنگی پێدانی خۆتیان بۆ دیاربخە، بەمرۆڤ لێیان بڕوانە نەوەك کارمەند.
- بەزۆری ناوی خۆیان بەکاربێنە، بزەیان بۆ بکە و پێیاندا هەڵبدە و پەسنیان بدە.

**٤-بینین-بۆچوون:**

پێویستە لەسەر سەرکردە پارمەتی کارمەندانی بدات بۆ ئەوەی ئەوانیش بۆچوون و ڕوانگەی خۆیان دابمەزرێنن و گەشەپێبدەن، هەروەها پێویستە هانی بیرۆکەکانیان بدەی و پەسنیان بکەیت بۆئەوەی بیرۆکەی نوێتر بهێننە ئاراوە.

**٥-دیاریکردنی ئامانج:**

سەرکردە هەڵدەستێت بە بەشدارپێکردنی ئەندامانی دەستەکەی بۆ دیاریکردنی ئامانجەکانی دەستەکە و نوسینەوەی ڕاپۆرتی ستراتیژی و نەخشەی کار، لەپێناو بەدیهاتنی ئامانجە مەزنەکاندا. کە دەستەکەشت بەشدار دەبن لە دارشتنەوە و دیاریکردنی ئامانجەکانی دەستەکە ئەوا ئەم کارە پتر هانی دەستەکە دەدات بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکان. تۆم بیترز دەڵێت:" **بەهۆی ئەزمون و شارەزاییمەوە هەموو کەس لەهەموو شتدا بەشدار پێدەکەم**" .

**٦-ڕێزگرتن:**

پێویستە لەسەر سەرکردە و هەموو ئەندامانی دەستەکە ئاهەنگ بگێڕن و خۆشی دەربڕن" لەکاتی سەرکەوتنی هەر کارمەندێکیاندا.

کاتێك بەڕێوەبەری گشتی ئوتێلێك بووم لە مۆنتریال و بڕوانامەی ( Certified (The م لە کۆمەڵەی (CFBE) (Food And Beveraga Executive Amercan Hotel and Motel Association) وە وەرگرت، وتارێکی پیرۆزباییم لە سەرۆکی کۆمپانیاکەوە پێ گەیشت، بۆیە منیش وێنەیەکی ئەم وتارەم نارد بۆ خاوەنی کۆمپانیای کارتیاکردووم، ئەمەش وەهای لێکردم زۆر هەست بە مەزنی و گرنگی خۆم بکەمەوە، لەناکاو کاتژمێر ٤:٣٠ی پاش نیوەڕۆ بانگێشت کرام بۆ کارێکی لەناکاوی زۆر گرنگ، توشی سەرسوڕمان هاتم لەوەی دەبێت قەومابێت؟! کاتێك ڕۆیشتم

بۆ شوێنی دیاریکراو ببنیم هەموو هاوڕێکانم کۆبونەتەوە و بەبۆنەی بەدەستهێنانی ئەم بروانامەیەی منەوە ئاهەنگ دەگێڕن و دیارییەکیشیان بۆ ئامادە کردووم کەناو و نازناوی تازەی منی لەسەر هەڵکۆڵرابوو، بێگومان ئەمە ئەوەندەیتر هانی دام بۆ باشتر کارکردن و خۆ بەباش زانین و چێژبینین لەکارکردنەکەم.

### ٧-هەستکردن بە یەك ئامانج:

لەکۆتادا پاش ئەوەی سەرکردە دەستەکەی دامەزراند و ئەندامانی دیاریکرد و فێری کردن چۆن ببن بە ئەندامی یەك تیم و پێکەوە کاربکەن، ئامانجی پشت ئەم کۆکردنەوەیەیان پێ ڕابگەیەنێت، لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی بەم هۆیەوە بەسەر خۆیان و دامەزراوەکە و ژیانیشیاندا دێت. هەستکردن بەتاك ئامانجی لەگرنگترین بنەماکانی سەرکەوتنە، نەوەك تەنها لەبواری کاردا بەڵکو لەبواری ژیانی تایبەتیشماندا.

دروستکردنی دەستە کارێکی زۆرباشە، بەڵام گەر ئامانجێکی دیاریکراو لەپشتەوە نەبێت ئەوا بە خێرایی ئەم دەستەیە هەڵدەوەشێتەوە و بوونی نامێنێت، بۆیە هەستکردن بەیەك ئامانجی هۆکار بنچینەی سەرکەوتنی دەستەیە. بەرلەوەی دەست بە دروستکردنی دەستەی کارکردنت بکەی، یاخود گەر هەیشتە و دەتەوێت کاراتریی بکەیت، ئەوا بۆ چەند خولەکێك بوەستە و دواتر بگەڕێوە بۆ خوێندنەوەی بەشی پێشەوە و دەبینی وەڵامی زۆربەی ئەو پرسیارانەی تێدایە کە بە مێشکتدا دێن.

ئەو حەوت بنەمایەی بۆمان خستیتە ڕوو وەکو نەخشەڕێگەیەکی بەنرخ وەهان و ئاسانکاری و خێرایی پتریشمان پێ دەبەخشن بۆ دروستکردنی دەستەیەکی کاری کارا. بابلیلیۆس سیرس دەڵێت: **" زۆرن ئەوانەی ئامۆژگاری وەردەگرن، کەمن ئەوانەی سود لەم ئامۆشیارییە وەردەگرن"** ، بۆیە وریابە و بەباشی سود لەم ئامۆژگاریانە وەربگرە، دەبینی چۆن ڕێگەت بەرەو سەرکەوتن بۆ خۆش دەکەن. بێگومانبە لەوەی ئەو حەوت بنەمایەی پێشووتر بەری ڕەنجی دەیان ساڵ لێکۆڵینەوەو کارکردنە، باشترین ڕێگەن بۆ بەدیهێنانی دەسەتەیەکی کاری سەرکەوتوو.

## ٦٠-کێ پێویستە بهێنیتە نێو دەستەکەتەوە(هەڵبژاردنی کەسانی گونجاو):

((کاتێك دەستەیەك دروست دەکەم هەمیشە بەدووی ئەو کەسانەدا دەگەڕێم کە حەزیان لەبردنەوەیە، گەر ئەمانەم نەدۆزییەوە ئەوا بەدووی کەسگەلێکدا دەگەڕێم کە ڕقیان لە شکست بێتەوە))

•

هـ.ڕوس بروت



کێ هەڵدەبژێری بۆئەوەی لەنێو دەستەی کارەکەتدابێت؟ کەس گەلێك هەڵدەبژێری بۆئەوەی ڕێك وەکو تۆبن؟ یاخود کەس گەلێك هەڵدەبژێری هەست بەئاسودەیی دەکەیت بەکارکردن لەگەڵیاندا و ڕێك هاوبڕیار و نزیك بۆچوونتن؟ یاخود کەس گەلێك هەڵدەبژێر پێچەوانە بۆچوون و ڕاتن و ژیانت قورستر دەکەن؟

گونجاو ئەوەیە کەس گەلێك هەڵبژێری لەگەڵ خۆتدا گونجاوبن. بەلام بۆ بێبەختی ئەم کەسانە ناتوانن زۆر یارمەتیت بدەن بۆ بەدیهاتنی ئامانجەکەت" چون تۆ پێویستت بەکەسانی جۆر و بۆچوون جیاوازە" بۆئەوەی لەڕوانگەی جیاوازەوە ئامانجەکان ڕوون بکرێنەوە، کەس گەلێك بۆچوونیان لەیەکتر بچێت، بەلام جیاوازییان زۆرتربێت. ئەمە هەمووی بەشێك دەبێت لەیارییەکە" چون یارمەتیت دەکات بۆ دیتنی دۆخەکان لەڕوانگەی جۆراوجۆرەوە و ڕەنگە بۆچوونی وەهات بۆ بخەنەبەردەست کە زۆر بەسوودبن.

**هەندێك نمونەی كەسايەتی كە دەستەكەت پێويستيەتی:**

**١-جێبەجیٚ كار:** ئەم كەسە گرنگی بە كردار و ئەنجام دەدات، بەخێرایی بڕیاردەدات، خاوەنی كەسێتیەكی بەهێزە و حەزی بە سەركێشییە و مرۆیەكی كارا و چالاك و دەستپاكیشە.

**2-كۆمپیوتەر ئاسا:ئەم** جۆرە كەسە حەزی بە كۆكردنەوەی زانیاری زۆرە، حەزی بە لەسەرخۆكاركردن و بڕیارنەدانی بەپەلەیە. زۆر ئارامگر و بڤەكارە، حەزی بە توێژینەوەی دۆخە جوداكانە" بۆ دڵنیابوونەوە لەوەی كە بڕیاری دراو ڕاستییە. ئەم جۆرە كەسانە ڕاستیت پیشان دەدەن لەسەر بنەمای كەتواری و ڕاستینەیی.

**٣-كارگێڕی:**ئەم كەسە گرنگی بە كاروباری كارگێڕی دەدات و حەزی لە بەدواداچوونكردنە، حەزی لە ڕاپۆت و كاری لاپەڕەییە، پابەندی نەخشەڕێگەكانە، حەزی لە زاڵێتیشە بەسەر دۆخەكانداو ئەم كەسە توانای گێڕانەوەی دۆخی ناهەمواری هەیە بۆ دۆخی ئاسایی خۆی.

**٤-سەرەنج ڕاكێش:**ئەم كەسێتییە زۆر بەسۆز و میهرەبانە و دەزانێت چۆن هەمیشە هانی هەموو ئەندامانی دەستەكەی دەدات بۆئەوەی بەردەوام باشتر و باشتر دیاریكەون و ئەنجام بدەن. كیٚ لەگەڵیدا كاربكات زۆر هەست بە خۆشەویستی و چێژبینین دەكات و لای ئەندامانی دیكەی دەستەكە خوازراوە.

**٥-خەونبین:**ئەم كەسە توانای بینینی دووری هەیە، داهێنان كارە، بیرۆكەكانی زۆرجار بەنرخن، زۆر گرنگی بە وردە شیكاری نادات، بەگشتی تیشك دەخاتەسەر داهاتوو.

چەند لەو کەسانەی پێشتر لەنێو دەستەکەی خۆتدا دەبینیت؟ وەك دەبینی جیاوازی بەسودو پێویستە. بەڕاستی سازاندنی ئەم جۆرە کەسایەتیانە پێکەوە کارێکی نائاسانە بەڵام بەچێژیشە، لەهەمووی گرنگتر دەستکەوتنی دەستەیەکی بێ خەوش و مەزن و بەهێزە.

# ٦١-چۆن وەها لە دەستەكەت دەكەيت بەرهەم هێن بن؟

((گەر كەسێك شيمانەی شتێكی كرد و خەونی پێوەبينی" مرۆڤ گەلێكی تريش دەتوانن بۆی بكەن بەڕاستی))

**جۆلس فرن**



ڕاوچييەك هەبوو ناوی جۆن بوو، كەسێكی بالآبەرز و چوارشانە و كەڵەگەت بوو، تا ڕادەيەكی زۆرباشيش ژيربوو، هەموو ڕۆژێك دەچووە ڕاو و بەر لە خۆرئاوابوون نەدەگەڕايەوە، ڕۆژێكيان هاورێيەكی بينی كە جۆن خەمبار ديارە بۆيە هۆكارەكەی لێپرسی، ئەويش گوتی: " من هەموو تەمەنم لە خۆرهەلآتنەوە بۆ خۆرئاوابوون خەريكی ڕاوكردن بووم، كەچی هيچم بە بەهيچ نەبووە"، هاورێكەيشی پێكەنی و گوتی:" پێويستت بەكەسانی ترە كەلەگەڵتدا كاربكەن و يارمەتيت بدەن".

جۆن سوپاسی هاوڕێكەی كرد و دەستی دايە گەڕان بەدووی كەسگەلێكدا بۆ يارمەتيدانی، تواني دەكەسی زۆر بەهێز بدۆزێتەوە بۆئەوەی لەگەڵيدا كاربكەن. لەبەرئەوەی جۆن لەوان ژيرتر و خاوەن ئەزموونتربوو بۆيە دەستی دايە ڕاهێنانيان لەسەر چۆنێتی و شێوازەكانی ڕاو، لەسەر ئەم كارەی بەردەوام بوو تاوەكو ئامادەی كردن.

بەيانييەك جۆن كۆی كردنەوەو ئەمەی پێ گوتن: " هاورێيانم، من فێری چۆنێتی ڕاوكردنم كردن، كەواتە ئێستا ئێوەيش ئامادەی كاركردن. بۆيە ئەمڕۆ ئێوە بەبێ من دەڕۆن بۆ ڕاو، تاوەكو دەتوانن هەوڵی خۆتان بدەن، هيوام سەركەتنتانە"، پياوەكان زۆر بەم قسانە دڵخۆش بوون" چونكە جۆن متمانەی پێيانە و ئێستا ئەمانيش بەبێ جۆن دەتوانن ڕاوبكەن. پياوەكان ڕۆيشتن و ماسيەكی زۆريان هێنايەوە، ئەمەش جۆنی زۆر دڵشادكرد" چون دەستەيەكی هەيە و بەباشی كاری بۆ دەكەن.

بەڵام پاشی شەش مانگ هەستی کرد بەرهەمی کاری دەستەکەی کەمی کردووە، خاوەنی هەمان هەست و حەزی پێشووترنین، لەبەرئەوەی نەیزانی چی بکات، بۆیە جۆن ڕۆیشتەوە بۆلای هاوڕێکەی جارانی داوای یارمەتی و ڕاوێژی لێکرد، هاوڕێکەیشی بەجۆنی گوت:" کارێکی باشە بتوانی دەستەیەك دروست بکەیت، بەڵام گەر نەتوانی بەردەوامییان پێبدەی ئەوا تۆ ئازاری خۆتت داوە، بۆیە پێویستت بەوەیە هەمیشە پیاوانت بخەیتە بەر گرەوەکێشەی نوێوە".

جۆن دەستەکەی کۆکردەوە و پێی ڕاگەیاندن: " ئەمڕۆ دەڕۆین بۆ ڕاو بەڵام لەجێگەیەکی تر، ئامانجمان ڕاوکردنی ٣٠٠ ماسی گەورەیە" ، بێگومان دەستەکە ڕۆیشتن بۆ تاقیکردنەوەی ئەم سەرکێشییە نوێیە و پڕ جۆش و خرۆش بوون و توانییان لەگەڵ خۆیاندا ٣٠٠ ماسی گەورە بهێننەوە، بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێکی گەورەیان سازدا. لەوڕۆژەوە، بەم شێوەیە جۆن فێری ئەوەبوو کە بۆ برەودان بەکارەکان پێویستی بە تاقیکردنەوەی سەرکێشی نوێ و ئەنجامدانی کارگەلێکە پێشتر ئەنجامی نەدابێت.

بیرۆکەی پشت ئەم چیرۆکە ئەوەیە کە دەتوانی بەئاسانی دەستەیەکی مەزن دروستبکەی، بەڵام گەر نەزانی چۆن دەیکەیت بە دەستەیەکی بەرهەم هێن ئەوا هیچ چنگ ناخەیت و لەبەرامبەردا خشتەی موچەپێدانەکەشت زۆر دەبێت. تۆ پێویستت بەوەیە هەمیشە دەستەکەت سەرقاڵ بکەیت بەجۆرێك چێژ لە کارەکانیان ببینن، هەروەها فێری ئەوەشیان بکەی چۆن دەبنە کەسێکی بەرهەم هێن. لێرەدا پێنج بیرۆکەت دەخەمە بەردەست بۆئەوەی دەستەی کارەکەت بەرهەم هێنبن:

### ١-کارکردن بکەرە شتێکی بەچێژ:



زۆر گرنگ و پێویستە هەستکردن بەچێژوەرگرتن لە کارکردن لای ئەندامانی دەستەکەت دروست بکەیت" بۆئەوەی بتوانی بەم کارەت لەناوچەی مەرگ یان ناوچە چوارگۆشەییەکان ڕزگاری بکەیت. پرۆژەیەکی تایبەتیان پێ

بسپێرە و داوایان لێبکە بە کەمتر لەکاتی هەمیشە ئەنجامدراو ئەنجامی بدەن، لەگەڵ دەستەبەری باشترین ئەنجامدان و خاسترین بەرهەم.

## ٢-گرەوە ئاستەنگ(تەحەدی)یان بخەرە پێش چاو:

گرەوەئاستەنگ هەرچییەك بێت دەبێت، بۆنمونە گەر ویستت بڕی فرۆشت بە ١٠٪ زیادتر بکەیت ئەوا کۆبونەوەیەك ئەنجام بدە، لەپێش چاوی ئەندامانی دەستەکەت ئامانجەکان روونبکەرەوە و وەهایان لێبکە بیر لەڕێگە گەلێك بکەنەوە کە تواناداربێت بۆ بەیدهاتنی ئامانجی تۆ و چۆنێتی جێبەجێ کردنی پێشنیارەکانیش بخەرە بەر باس. ئەوجا کاتێك بۆ بەدهێنانی دیاری بکە و داوایان لێبکە دەستبەکاربن و لەبارەی سەرکێشییەوە بۆیان بدوێ و ڕایان بێنە لەسەر سەرکێشی قبولکردن بەمەرجی بوونی نەخشەی سەرکەوتنی پێشوەخت، لەگەڵ هاندانیان بۆ ئەنجامدانی کاری نوێ و فراوانترکردنی بوارەکانیان لەچاو باری ئاسایی پێشوتریاندا.

## ٣-بیرۆکەی هەفتە:

لەکۆبونەوەی داهاتوودا دەتوانیت بە بیرۆکەی هەفتە دەست پێبکەیت. بۆنمونە: کۆبونەوەیەك لەڕۆژی دووشەممەدا ببەستە، داوا لەهەموو ئەندامانی دەستەکەت بکە دوو بیرۆکەی نوێت بۆ بێنن بەمەبەستی کەمکردنەوەی ڕێژەی سکاڵای کڕیاران و زاڵبوون بەسەر دۆخەکەدا، رەگەڵ باشترکردنی دۆخی کڕیار و سەردانکاران و پترکردنی بەرهەم، یان هەرشتێکی تر یارمەتیت بکات بۆ باشترکردنی کارایی دەستەکە و ئەنجامدانی کاری کێبڕکێکاری دامەزراوەکەت. یەك هەفتەیان پێ ببەخشە بۆئەوەی بیرۆکە نوێیەکەت بۆ بێنن، هەروەها دەتوانی یەك بەدوای یەك تاقی شێوازی بیرکردنەوەی هەموو ئەندامان بکەیتەوە. ئەوجا هەستە بە دابەشکردنی بەرپرسیارێتی بۆ ئەوەی ئەم بیرۆکە نوێیان بخەیتە بواری جێبەجێکردنەوە. بیرۆکەی هەفتە چەندین سودی هەیە:

- یارمەتی ئەندامانی دەستەکەی دەدات بۆئەوەی داهێنەرتربن.
- یارمەتیت دەکات بۆ بەردەست خستنی بیرۆکەی نوێ لەبۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانت لەکەمترین کاتدا.
- هەموان لەناوچەی ئاسودەبوون و پوکانەوە و تەمبەڵی ڕزگاردەکات. دۆن بیۆت دەڵێت: **" کەسی مەزن ئەو کەسەیە ئاوەز و مێشکی ئەوانی تر بەکاردەهێنێت" بۆ ئەنجامدانی کارەکانی خۆی".**

**٤-کێشەی هەفتە:**

ئەوجا دەتوانی کۆبونەوەیەکی تر ببەستیت و ناوی بنێی کێشەی هەفتە، بەوەی پرسیاری ئەو کێشانەیان لێبکە کە ڕووبەڕووی دەبنەوە، یاخود کێشەکیان بۆ بخەرەڕوو کە پێویستی بە هاوکاری هەموویانە بۆ گەیشتن بە چارەسەری گونجاو، ئەجا هەلێکیان بدەرێ بۆ ئەوەی لە کۆبونەوەی داهاتوودا کێشەکانت بۆ بخەنەڕوو، یاخود بەرەو چارەکردنی هەنگاوبنێت-بەپێی پلانی دیاریکراوی گونجاو-، بیرۆکەی کێشەی هەفتە یارمەتیت دەدات بۆ:

- وەها لە دەستەکەت بکەیت یارمەتیت بدەن بۆ بدۆزینەوەی کێشەکان و چارەکردنیشی.
- باشتر ئاگاداری ئەو کێشانە دەبیتەوە کە ڕۆژانە دوچاری دەستەکەت دەبێتەوە.
- وەها لە کارمەندانت دەکەیت بیربکەنەوە و لەهەناوەوە هەست بەبەرپرسیارێتی و پابەندی بەرامبەر دامەزراوە و دەستەکەیان بکەن.

**٥-سەردانییەکانی هەفتە:**

دەتوانی دەستەکەت هەموو هەفتەیەك بەریتە گەشت، ئەم گەشتەش بۆ کۆمپانیا کێبڕکێ کارەکان یاخود بۆ بازاڕ و شوێنە هاندەر و چاوکارەوەکان دەبێت، بەتایبەت ئەو

شـوێن و ناوەندانـەی کـە بەسـەرکەوتن بـەناوبانگن، ئەمـەش بۆفێربـوونی ئەوەیـە کـە ئـەمانیش وەکـو ئـەوان بتـوانن سـەرکەوتن چـنگ بخـەن، بـەم شـێوەیەش ئەندامـەکانی دەستەی کارەکەت چاوکراوەتر و بەسـودتر دەبـن. هـەروەها دەتـوانی ئەنـدام گـەلێك لـە دەستەکەت بهەنێریتە سەردانی کەسانی کێبڕکێ کارت و دواتر پاش گەڕانەوە ڕاپۆرتێکت پێشکەش بکەن لەبارەی چەشنی کۆبونەوە و چۆنێتی پێشوازی و ئەنجامدانی کارەکان و ئـەمانیش هـەموو ئـەو زانیاریانـەی بەدەسـتیان هێنـاوە بـە هـەموو ئەنـدامانی دیکـەی دەسـتەکەتی بگەیـەنن، ئەمـەش یارمـەتی خـۆت و دەسـتەکەت دەدات بـۆ ئاشـنابوون بەهـەموو گۆڕانکاریـەکانی بـازاڕ و تـۆیش دەتـوانی باشـتر بخەیتـەبازاڕەوە و لەپێشـتر پێشکەش بکەیت.

پێنج بیرۆکەکـەی پێشـووتر هانت دەدەن بۆئـەوەی وەهـا لـە ئەنـدامانی دەسـتەکەت بکـەیت ژیرتـر و بڤکـارتر و داهێنـەر و هانـدراوتر کاربکـەن. هـەروەها پێویسـتە هـانی ئەندامانی دەستەکەت بدەی بـۆ کۆبونـەوە لـەدەرەوەی ڕەوتـی کارکردنـدا، بەمەبەسـتی خواردنەوەی قاوە یان نانی ئێواریٚ، بەتایبەت بە هەفتانە و مانگانـە و پـاش تـەواوکردنی کاتی کارکردن. هەروەها بۆ ڕۆیشـتن بـۆ ئـەو جێگەیـە دەتـوانی سـود لـە ڕای ئەنـدامانی دەستەکەت وەربگریت.

من بۆخۆم کاتێك بەڕێوەبەر بووم ڕاهاتبووم لەسـەر ئەنجامـدانی کۆبوونەوەیـەکی نـان خواردنی مانگانە بەم شێوەیە: یەکێك لە ئەندامانی دەستەکە هەڵدەستێت بـە میوانـداری کردنی هەموانی تر لـە مـاڵی خـۆی بێـت یـان هـەر جێگەیـەکی دیکـە، هەرکەسـێك بێـت پێویسـتە دوو قـاپ خـواردن لەگـەڵ خۆیـدا بهێنێـت، قاپێـك شـیرینی و قـاپێکیش هـەر خواردنێکی تر، هەموومان پێکەوە کۆدەبووینەوە و کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەر دەبـرد. بۆیە دڵنیابە لەوەی ئەم ڕێگەیە بۆتـۆ زۆر یارمـەتی دەرە" بـۆ نزیککردنـەوەی ئەنـدامانی دەستەکەت لەیەکتر و ئافراندنی ڕێز و خۆشەویستی لەنێوانیاندا.

## ٦٢-چۆن لەگەڵ ئەوانەدا ڕەفتاردەکەیت حەزیان لە گۆشەگیرییە؟

((هەموو مرۆڤێکی مەزن یارمەتی لەهەموو کەسێکەوە وەردەگرێت" چونکە ئامانجیان پوخت داهێنانێکی باشترە لە هەبووەکان و باشتریشە لە بەردەست بووەکانی هەر مرۆڤێکی تر))

**ڕاسکین**



کەسی گۆشەگیر حەزی بەکار تەنهاییە و گەر بە دەستەیی کاربکات هەست بە ناڕەحەتی دەکات. گرنگ نییە کە تۆ خۆت ئەم کەسەت هێنابێتە نێو دەستەی کارەکەتەوە یان پێشتریش هەر هەبووە، گرنگ ئەوەیە بزانی چۆن ڕەفتاری ڕەگەڵدا دەکەیت، بۆئەمەش کۆمەڵێك بیرۆکەی پێویست و گرنگت پێش دەست دەخەم:

### ١-چاوپێکەوتنی ئەنجام بدە:

بەتەنهایی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ئەنجامبدە و هەوڵی دۆزینەوەی کێشەکەی بدە.

### ٢-ڕەفتار و مەرامی لەیەکتر جودابکەرەوە:

ڕەنگە ڕەفتاری هەڵە یان نەخوازراوبێت، لەکاتێکدا نیەت و مەرامی پاکە. گریمانەیەك هەیە دەڵێت: **" لەپشتی هەر ڕەفتارێکەوە مەرامێکی ساغ هەیە"**، بۆیە هەوڵی دۆزینەوەی مەرامەکانی بدە و بەجوانی تیشکی بخەرەسەر.

## ٣-دیاریكردنی ئامانج:

ئامانجێكی بۆ پـێش دەسـت بخـە و هـانی بـەدیهێنانی بـدە" بۆئـەوەی لـەم ڕێگەیـەوە ڕەفتارەكانی بگۆڕێت، بۆئەمەش كاتێكی ئەنجامدانی بۆ دیاریبكە.

## ٤-لەكاتی كردارەی گۆڕاندا دەستی یارمەتی بۆ درێژبكە:

فێـری بكـە، ڕای بێنـە و یارمـەتی بـدە" بۆباشـتركردنی بـەهرە و تواناییـەكانی، گـەر لەجۆری شەرمۆكان بوو، ڕای بێنە بۆ بەدەست هێنانی متمانەی ئەوانی تر.

## ٥-هەڵسەنگاندن:

كاتێك ئەوكاتەی دیاریتان كردووە بـەكۆتا هـاتووە جـارێكی تـر چـاوپێكەوتنی ڕەگـەڵ ئەنجامبدە و هەڵسەنگاندنێكی تەواوی ئەوەی ئەنجامی داوە بۆ بەردەست بخە.

## ٦-دوورخستنەوە:

گەر سەرنەكەوتیت لە گۆڕاندنی، پاش ئەوەی بەڕاستی هـەوڵی خۆتـت لەگـەڵ دابـوو، زانیت هیچ سودێكی نییە و ناگۆڕێت، باشتر وەهایە بۆ هێشتنەوەی دەستەكەت بەسـاغی و بـێ كێشـەیی ئەنـدامێكی بكـەیت بـە قوربـانی و دەری بكـەیت، واتـە ئـەم كەسـە دووربخەیتەوە.

## ٦٣-چۆن لەگەڵ کێشەکانی نێو ئەندامانی دەستەکەتدا ڕەفتار دەکەیت؟

((کاتێك کێشە و ئاستەنگت توش دەبێت، لەبیرت بێت خاوەنی ئاوەزێکی مەزنیت))

**هۆراس**

هەرچەندە هەوڵبدەی و تێبکۆشیت بۆ پێکهێنانی دەستەیەکی باش، ئەوا هەر توشی جۆرێك لە ململانێ و کێشەی ناوخۆیی دەبیتەوە.



لەم کاتەدا پێویستە قسەلەڕوو و هاریکاربیت، بەڵام هەوڵ مەدە خۆت لەم کێشانەوە تێوەبگلێنی و خۆیشت لەئاستیدا گێل مەکە و بەداناییەوە دادوەری نێوان کارمەندە ناکۆکەکانت بکە و لایەنگیری هیچ کامێکیان مەکە، تەنها کۆتری ئاشتیبە و هیچی تر.

ولیەم شکسپیر دەڵێت:" **ئافرێنەرانی ئاشتی لەسەر زەوی پیرۆزن**" ، بەڵام وریابە و دەبێت لەکاتی پێویستدا بڕیار توندبیت. بۆ ڕەفتارکردن ڕەگەڵ ئەم جۆرە ناکۆکی و ململانێیانەدا پێویستە بەژیریی تەواوەوە ڕەفتاری بکەیت بۆ دۆزینەوە چارەسەری پێویست و دوورخستنەوەی دەستەکەت لە کێشەی گەورە.

١- هانی کارمەندانت بدە بۆ دۆزینەوەی چارەسەری کێشەکانیان-خۆیان کێشەکانی خۆیان چارەبکەن-، بۆئێمەش دەبێت بوێری تەواویان هەبێت بۆ دانیشتن و گفتوگۆکردن بە دەنگێکی نزم و گونجاو بۆ دۆزینەوەی چارە.

٢- گەر ئەمە سودی نەبوو پێویستە هانا بۆ کەسی سێیەم بەرن، کەسێك هەردوولایان متمانەیان پێی هەبێت.

٣- گەر ئەمەیش سودی نەبوو هانیان بدە کەسێکی تر بکەن بەناوبژیوان و گوێی لێبگرن و پێڕەوی فەرمایشتەکانی بکەن.

## گەر ئەو هەنگاوانە دادی نەدای پێویستە ئەم هەنگاوانەی لای خوارێ جێبەجێ بکەیت:

خۆت بچۆرە نێو کێشەکەوە و بانگی هەردووکیان بکە بۆ نوسینگەکەت، ئەوجا:

أ- باسی ئامانجی کارکردنی دەستەییان بۆبکە.

ب- داوایان لێبکە بەچڕی تیشك بخەنەسەر ئەنجامەکان، نەوەك سەر ڕەفتار یان ئەوەی لەڕابردوودا گوتراوە.

ت- داوا لەهەر لایەکیان بکە باسی تایبەتمەندییە باشەکانی کەسەکەی تر بکات.

پ- پرسیاری باشترین ڕێگەچارەیان لێبکە بۆ کۆتایی هێنان بە دۆخەکە.

ج- پرسیاری ئەوەشیان لێبکە تۆ دەتوانیت چییان بۆ بکەیت؟

ح- داوایان لێبکە نەخشەیەك دانێن بۆ دوورکەوتنەوە لە دووبارە بوونەوەی ئەم کێشەیە.

خ- ئەوەی گتویانە پوختی بکەرەوە و ستایشی هەردوولا بکە بەوەی ئەندامی یەك دەستەی کارن، ئەوجا هەڕەشەی ئەوەشیان لێبکە گەر کۆتایی بەم کێشەیە نەهێنن ئەوا...

د- بەدواداچوونیان بۆ بکە: لەم کاتەدا نابێت بەزوویی بڕیاربدەیت، لایەنگیری هیچ لایەکیش مەکە، هەروەها خۆیشت هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەری کێشەکەیان بۆ مەدە، پێویستە خۆیان چارەی کێشەکانیان بکەن. بەم جۆرە دەتوانی یارمەتییان بدەی بۆ ئاشنابوون بە چۆنێتی ڕەفتارکردن لەم دۆخانە لەداهاتوودا. بە بەدواداچوونکردن و هەوڵدان بۆ چارەکردنی کێشەکان زۆرباش یارمەتی دەستەی کارمەندانت دەدەیت بۆ باشتر کارکردن و خۆبەدورگرتن لە بارگاویکارە ئازاربەخشەکان.

((باڵندە بۆ ئەوەی بفڕێت پێویستی بە دوو باڵە))

**جیسی جاکسۆن**

جارێکیان لەدوو تاتبڕ پرسیارکرا چی دەکەن" یەکەم گوتی:" من تات دەبڕم و دەیکەم بەبەرد"، دووەمیش گووتی:" من لەنێو دەستەیەکدا کاردەکەم، کە بەهەموومانەوە ئەم باڵەخانەیە دروست دەکەیت" دووکەس لەیەك جێگەدا یەك کار دەکەن ، بەڵام دووشێوازی دەربڕینی جیاوازیان هەیە. وەك دەبینی دەستەی کار بەسود و بەکەڵکە، بۆیە گەر دەستەی کارت نییە، هەرئێستا بەڕاستی بیر لەدروستکردنی بکەرەوە، بەڵام گەر هەیشتە ئەوا کاربۆ کاراکردنی بکە، یارمەتی دەستەی کارکەرانت بدە بۆ باشتربوون.

هەوڵبدە خۆت بەدووربگریت لە توانجی نەرێنی لەبارەی دەستەی کارکەرانتەوە. بۆ بێبەختی مرۆڤی قسەتاڵ و دەمشڕ زۆرن لەدەوروپشتت و بەهەموو تواناکانیانەوە کاربۆ کەمکردنەوەی توانایی و بەنەرێنی کردنت دەکەن، کۆنفۆشیۆس لەم بارەیەدا ئاماژەدەکات ودەڵێت:" **ئەوانەی ڕێگەی جیاواز دەگرن ناتوانن ئامۆژگاری یەکتربکەن**"، کەسانی نەرێنی خاوەنی ڕێگەی تایبەتی خۆیانن، بۆیە گوێیان بۆ شل مەکە. دەستەی کارەکەت بکەرە بەشێك لە ژیانت. لەم بوارەدا قسەکەی هیۆودت لەبیربێت کەدەڵێت:" **دووسەر باشترە لەیەك سەر**"(( **دوو ئاوەز لە یەك ئاوەز باشترە**))، شکسپیریش دەڵێت:" **یەك بۆگشت و گشت بۆ یەك**". هەوڵبدە ببیت بەە یاریکارێك لەنێو دەستەکەتدا" چونکە هیچ کەسێك ناتوانێت بەتەنها هەمووشت بکات و لەیەك کاتدا لەدووجێگەبێت. دەستەی کارت بکەرە شێوازی تایبەتیت لەژیانتدا، ئەوجا دەبینی دەکەویتەسەر ڕێگە و بەرەو سەرکەوتن هەنگاودەنێی.

# کلیل دەیەم

## پێ سپاردن..

## ڕێگەیەك بەرەو ئازادی



((هەرکەسێك دووشت بەدەستی بگرێت ئەوا یەکێك لەدەستی دەخزێ و دەردێت))

**سەرچاوە نەزانراو**

# ٦٤-شت بەکەس دەسپێری؟

((لەیەکدا ساتدا هەناسەوەربگری و هەناسەش بدەی کارێکی ئاسان نییە))

**ڤیوتێژس**



چی ؟ بسپێرم؟ تۆ شێت بویتە؟ دەتەوێت لەکارەکەی دەست بکێشمەوە لەکارەکەی خۆم خۆم بۆ کەسێکی تر ؟ دەتەوێت دەستەلاَتداریێتیم نەهێڵی یان توشی سەرزەنشتکردنی سەرکردەکانم ببمەوە؟ وابزانم داوام لێدەکەی دەست لەکاربکێشمەوە؟

ئەم دەستەواژانە بەلای تۆوە ئاشنان؟ بۆچوونی تۆ لەبارەی پێسپاردنەوە چۆنە؟ ئیش بەکەس دەسپێری؟ هەندێك لە بەڕێوەبەران، بەتایبەت تازەکانیان، لە وشەی پێسپاردن هەڵدێن، وەك ئەوەی توشی هەستیاری بووبن لەبەرامبەریدا. بەلاَم ئایا دەزانی ئەمانیش بۆچونێکی باشیان بەرامبەر ئەم کردارەیە هەیە، گەر تێبینی بکەی دەبینی کارمەندێك بەرلەوەی ببێتە بەڕێوەبەر زۆر چالاك و لێهاتوو بووە، کام کار قورس بووە ئەم چێژی لە ئەنجامدانی بینیوە، هەمیشە ڕێزی بۆدەهاتەوە و هەموان سوپاسیان دەکرد لەبەرامبەر ئەنجامدانی کارەکاندا. ئێستایش وا بوەتە بەڕێوەبەر و دەیەوێت هەرکارێك پێویست بێت ئەنجامی بدات بۆ دەستکەوتنی ڕێز و سوپاسنامە و دیاری و خەلاَتکردن. گەر زاڵبێت بەسەر کارەکەیدا مانای وەهایە خۆی هەموو کارەکان ئەنجام دەدات. ئایا پاش ئەم هەمووە ئێمە دەتوانین داوای لێبکەین کار بەکەسانی تر بسپێرێت و بەبریکاریان دابنێت؟ ئەم کەسە لەم کاتەدا ڕاستەوخۆ وەها هەست دەکات تۆ داوای ئەوەی لێدەکەیت دەست لەکارەکەی بەربدات یاخود وەها هەست دەکات کە تۆ بەباشی نازانیت و لەم کاتەدا هەڵوێستێکی بەرگریکارانەی دەبێت لەبەرامبەر بیرۆکەی بریکاردانان

یان پێ سپاردن. لێرەوە پێویستی بە تێگەیشتن لەم کردارەیە دیاردەکەوێت، ئە
پێویستی بەگۆڕینی بۆچوونەکانێتی لەبەرامبەر ئەم کردارەیە.

دەبێت تێی بگەیەنیت کەئەم ناتوانێت لەهەموو ساتێکدا لەگشت جێگەیەك بوونی هەبێت و کارەکان ئەنجامبدات. دەبێت بەوەش ئاشنابێت کە چۆن بار قورسی سەرشانی خۆی بە پێسپاردنی کەسانی تر سوکتر دەکاتەوە. ئەم پێویستی بەوەیە لەمە تێبگات بۆئەوەی بەردەوامبێت لەسەرکەوتن بەسەر



پلەکانەی کارگێڕیدا، یان ئەوەیە بڕوای بەپێسپاردن دەبێت یاخود هەرگیز پێ
ناکەوێت. لەهەندێك دامەزراوە و کۆمپانیادا هیچ بەڕێوەبەرێك پلەبەرزناکەنەوە مەگ
کەسێکی لەجێگەی خۆی دانابێت و کارەکانی خۆی پێ سپاردبێت، تەنانەت هەند
دامەزراوەی تر ئەو بەڕێوەبەرەی کار بە بریکاردانان یاخود پێسپاردن ناکات دەر
دەکەن! گومانی تێدانییە کە بەڕێوەبەر زۆر بەتوانایە و بەباشترین شێوە ئەتوان
کارەکان ئەنجامبدات، بەلاّم ئەمە بۆ هەموو سات و کات و دۆخێك وەهانابێت
زۆرجاریش دەرەقەتی ئەنجامی هەموو کارانە نابێت کە لەسەری کۆدەبنەوە، تاوە
چەناکەی کێشە و ئیشی بۆ کۆدەبێتەوە، لە ڕاپۆرت و کۆبونەوە و وەلاّمدانەوەی نامە
نوسراوەکان و...هتد. گەر بەڕێوەبەر بریکار یان پێسپێردراوێکی نەبێت ئەوا خۆی ب
قەتیس بوویی دەبینێتەوە لەنێو دۆخ گەلێکی زۆر و نەخوازراوی توانا شکێندا. پا
ماوەیەکی کەم ئەم بەڕێوەبەرە دەست دەکات بەگازندەکردن و لەپێشکەوتن دەوەستێ
و ئەنجامی باشتری نابێت، هەربۆیە بزانە کە پێسپاردن یان بریکاردانان لە کورت مەودا
ماوەی دووریشدا سودی زۆری بۆت هەیە.

## ٦٥-ئەو شەش هۆکارەی وەها لە بەڕێوەبەران دەکەن ڕقیان لە پێ سپاردن(بریکاردانان) بێتەوە:

((ئەنجامدانی دووشت لەیەك ساتدا مانای نەکردنی هیچ کامیانە))

**بابلیلیۆس سیرس**

باشە بۆچی بەڕێوەبەران ڕقیان لە پێسپاردنە؟ ئەم هۆکارانە لە کەسێکەوە بۆئەوی تر دەگۆڕێت، هەندێك لەم هۆکارانە قوڵن و پەیوەست بە بەها و باوەڕەکانی خودی کەسەکەوە، ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی چارەکردنی قورس و نائاسانە، بەلآم مانای وەهانییە کە چارە ناکرێت. تاوەکو مرۆیەك بتوانێت بۆچونی بەرامبەر پێسپاردن بگۆڕێت کاتی زۆری دەوێت و ماندووبوون و سەور یان ئارامگری زۆریشی گەرەکە.

بۆنمونە گەر کەسێك لە ژینگەیەکدا گۆشکرابێت کە متمانەکردن تێیدا قەدەغە بووبێت و هەمیشە ئەم دەستەواژانە بەرگوێی دەکەوتن: باوەڕ بە کەس مەکە، کەسەکانی دەوروپشتت خراپن، مرۆڤەکان هەمیشە دەیانەوێت بت خەنە چاڵەوە، متمانە بەسەگەکەت بکە و متمانە بە مرۆڤ مەکە!! ئەم جۆرە کەسانە کە گەورەبوون و بوون بە خاوەن بڕیار ئەوکاتیش هەر ناتوانێت متمانە بەکەس بکات.

ئەم جۆرە کەسە ڕەنگە کارمەندێکی زۆرباش بێت، پێویست نەبووە یەکێکی تر بەبریکاری خۆی دابنێ و شتەکانی پێ بسپێرێت، بۆیە هیچ کەسێك باوەڕی وەها نەبووە کەبۆ ئەندامێتی نەگونجێت" چون هیچ کات بۆچونەکانی خۆی بۆ هاوڕێکانی نەدرکاندووە و لە گوماندابووە. ئەم کارمەندە توشی گرفتی زۆر دەبێت کە بووبە ئەندامی دەستەی کارکەران و بەتایبەتیش ڕاهاتن لەسەر پێسپاردن بەلایەوە زۆر گرانە، ڕەنگە هەمیشە لەدۆخی بەرگریدابێت و زیانی زۆر لەخۆی ودامەزراوەکەیشی بدات" گەر بووبە بەڕێوەبەر.

بەلأم كە روویدا و ناچاركرا پێسپاردن بەكاربێنێت ئەوا خۆی بەم دەستەواژانە چەكا دەكات:" من بەڕێوەبەرم، ئەمە كاری خۆمە"، گەر هاوكارەكانی یارمەتی نەدەن و گۆڕینی بۆچوونە مەنگەكانی ئەوا بەردەوام دەبێت لەسەر زیان گەیاندن بە دامەزراوەكە خۆیشی" بەهۆی پێڕەوكردنی شێوازی ئۆتۆكراتی لە سەرزەنەشتكردنی ئەوانی تر گومانبرن لەهەموو شت و كەسێك. ناهەستكردن بە ئارامی وەهای لێدەكات بەخراپ لە كارمەندانی بڕوانێت و لەسەر هەڵەی بچووك سزای گەورەیان بدات و تەنانەت لەئیشەكەیش دەریان دەكات و هەمیشە سكاڵادەكات و ناقایلە، هەمیشە دەڵێت:" لە رۆژگارەدا ناتوانی متمانە بەهیچ كەسێك بكەیت"، لەم كاتەدا پێویستە كارگێڕ دامەزراوەكە داوای خۆچاككردنی لێبكات و رێنونێنی بكات بۆ گەیشتن بە دۆخی ئارامی متمانەكردن بەوانی تر، ئەگینا لەسەر دروستكردنی كێشە بەردەوام دەبێت.

چەندین هۆكاری تر هەن كە رەفتاركردن لەگەڵیاندا ئاسانترە و بە سوكتر چارەدەبن بەسەریاندا زاڵدەبن بەپێچەوانەی هۆكارەكەی پێشووترەوە. لێرەشدا شەش هۆكارت و بەردەست دەخەم كە وەها لەبەڕێوەبەران دەكات لە پێسپاردن هەڵبێن:

### ١-لەدەستدانی زاڵێتی:

بەڕێوەبەرەكە وەها ڕاهاتوو خۆی هەمووشتێك ئەنجامبدات و بەسەر هەموو لق بارەكاندا زاڵبێت و ئەنجامەكان خۆی دیارییبكات، بۆیە دەترسێت ئەم دەستەلا لەدەستبدات گەر كەسێكی تر لەجێگەی خۆی وەكو بریكار دابنێت یان كارەكانی خۆ پێ بسپێرێت.

### ٢-كات بەفیڕۆدان:

ئەو بەڕێوەبەرەی خۆی كارەكانی ئەنجام دەدات بێ متمانەكردن بە كارمەندانی، بۆی كار سپاردن بەوانی تر بەكات بەفیڕۆ دان دەزانێت" چون پێویستی بە فێركردن

راهێنانەو هەروەها ناچاری قایل بوونە بەهەڵە سەرەتاییەکانی، بۆیە پێی باشترە خۆی کارەکانی ئەنجامبدات و ئەم کات و ڕەنجەی بەفیڕۆ نەدات، بەڵام گەر ناچارکرا بریکارێك بۆخۆی دانێت ئەوا گازەندەی ئەوانی تر دەکات بەوەی کاتی دەکوژن.

### ٣-لەدەستدانی توانای هەڵسوڕاندن و بەرژەوەندی:

کاتێك بەڕێوەبەرەکە لەئەنجامدانی هەندێك کار دەست هەڵدەگرێت وەها هەست دەکات ئیتر توانای هەڵسوڕاندنی کارمەندەکانی نەماوە و ناتوانێت بەرژەوەندییەکان بپارێزێت و بەمەش ڕەنگە کارەکەی لەدەست بچێت.

### ٤-لەدەستچوونی دیاری و بەخشش:

بەڕێوەبەر وەها هەست هەست دەکات بە دانانی بریکار یان پێسپێردکارێك ئەوا هەرچی دیاری و خەڵاتە کەپێشتر پێی دراوە لێرە بەدواوە پێی نادرێت، هەروەها چێژیش لە ئیشەکەی لەدەست دەدات، بۆیە بە پێسپاردن قایل نابێت.

### ٥-ترسان لە سەرزەنەشت کردن:

بەڕێوەبەرەکە دەترسێت کەسێك بکاتە بریکاری و شتەکانی پێ بسپێرێت کەچی نەتوانێت بەباشی ئەنجامی بدات، بۆیە سەرزەنەشت دەکرێت، بەم هۆیەوە ڕەنگە باجی ئەم هەڵانەبدات و لەئیشەکەی دەربکرێت.

### ٦-تاوانبارنەکردنی کارمەندان:

بەڕێوەبەرەکە نایەوێت لۆمەی ئەوانی تربکات بۆیە خۆی کارەکانی خۆی ئەنجام دەدات.

ئایا خۆت لەهیچ کام لەو دۆخانەی پێشووتر دەبینیتەوە؟ لەگەڵ هیچ کامێک لە بەڕێوەبەرەکانی پێشووتر باسکراودا کاردەکەیت؟ یاخود خۆت وەهایت؟ گەر بە بەڵێ وەڵامت دایەوە، ئەوا هەرئێستا دەست بەگۆڕان بکە" چون سودی دانانی بریکار زۆر زۆر دەبێت و قازانج و کاتیشت پتر باشتر دەبێت و ماندووبونیشت کەمتر دەبێت.

## ٦٦-دە سوودی پێ سپاردن-بریکاردانان(تفویض):

((بهێڵە باوەکو هەر مرۆڤێك ئەو هونەرە ئەنجامبدات کە دەیزانێت))

ئەرستۆڤانس



ئێستا بهێڵە باوەکو سودەکانی بریکاردانان یاخود پیسپاردنت بۆ بخەمەڕوو، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی چۆنێتی باشترکردنی دۆخی کات و داراییت و هەموو لایەنەکانی تری ژیانت. لێرەشدا دەسودی زێڕینی پێسپاردنت بۆ دەخەمە بەردەست:

### ١-هەڵسوڕاندنی کات:

کاتێك هەندێك کارت دەخەیتە ئەستۆی ئەوانی تر، بەم کارەت کاتێکی باشت بۆ دەگەڕێتەوە لەبۆ ئەنجامدانی کاری زۆر گرنگ.

### ٢-زیادبوونی بەرهەم:

گەر ویستت کاتت زیادبێ و کاری ناگرنگ ئەنجام نەدەی و بەهرەت نوێتر بێ و کاری باشتر بۆ زیادکردنی ئەنجامت ئەنجامبدەی ئەوا پێسپاردن بەکاربێنە.

## 3–دروستکردنی دەستەیەك كۆڵەكەكانی متمانەبێت:

کاتێك هەندێك لەکارەکانت بە ئەندامانی دەستەکەت دەسپێری ئەوا تۆ متمانەیان پێ دەبەخشین و ئەوانیش هەستی پێدەکەن و بەهۆیەوە تواناییان بۆ زیادبونی ئەنجامدانەکان باشتر دیاردەکەوێت.

## 4–گەشەپێدانی بەهرەکانی دەستەکەت:

کە کار بە ئەندامانی دەستەکەت دەسپێریت ئەوکات یارمەتییان دەدەیت بۆ فێربوونی بەهرە و کاری نوێتر و زیاوبوونی زانیاریەکانیان. پێسپاردن یارمەتییان دەدات بۆ گەشەپێدان بە خودیان و دەرپەڕین لەناوچەی حەسانەوە و تەوەزەلی و بەدەست هێنانی ئامانجی کاربۆکراو.

## ٥–زیادبوونی قایلمەندی کارمەندانت، کەمبونەوەی ڕێژەی دەستلەکارکێشانەوە:

کاتێك ئەندامانی دەستەکەت فێری بەهرە و زانیاری نوێ دەبن لەڕێگەی پێسپاردنەوە ئەوا ئەمە هانیان دەدات بۆ دۆزینەوەی کاری ڕاستەقینەی خۆیان، دروستکردنی ژیانیان، هەروەها پتر لەیەکتریان نێزیك دەکاتەوە" بۆئەوەی یەکێتییەکی مەزن و پتەو پێکبێنن. ئەمەش لای خۆیەوە وەهایان لێدەکات هەست بە قایلمەندی و خۆشویستنی کاربکەن و بۆماوەیەکی زۆریش لەنێو دەستەی کارکردندا بمێننەوە و دەست لەکارکردن نەکێشنەوە.

## ٦–زیادبوونی هاندان:

کاتێك ئەندامانی دەستەکە هەست بە متمانەداری تۆ بەخۆیان دەکەن– واهەست دەکەن تۆ متمانەت پێیانە– و هەلی فراوانی فێربوونی بەهرەی نوێ لەپێشیانە، هەروەها کایەی بەرەو پێشەوە چونیان بۆ ڕەخساوە، ئەمە لای خۆیەوە هانیان دەدات بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی هاندانیان و زیاوکردنی بەرهەمیان.

### 7-بەدیهێنانی زاڵێتی زیادتر:

بەکارهێنانی پێسپاردن بەگونجاوی و سود وەرگرتنی بەردەوام لە بەدواداچوون یارمەتی زۆربوونی دەستەلاتت دەدەن لەسەر شێوازی بەرهەم و ئەنجامەکان. تۆ بە پێسپاردن هەلێك بەخۆت دەدەیت کەلە دوورەوە لە دۆخەکان بنواڕی و ئەوجا بڕیارەکانیشت باشتر و گشتگیرتر و تەنانەت دیاریکراوتریش دەبێت و بەئاسانیش دەتوانی بەسەر دۆخەکەدا زاڵبیت.

### ٨-هەڵسەنگاندنی باشترین کەسی دەستەی کارەکەت:

کاتێك هەندێك کار بە دەستەی کارکەرانت دەسپێریت ئەوکات هەلی ئەوەت بۆ ڕێك دەکەوێت لێیان بڕوانی کاتێك کاری نوێ ئەنجام دەدەن، بەمەش دەتوانی لەئاستی تواناییان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دۆخە نوێیەکان تێبگەیت، بەم کارەش دەتوانی خاڵە بەهێز و لاوازەکانی ئەنجامدانیان دیاریبکەی.

### ٩-کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێ :

پێسپاردن ناچارت ناکات لە هەموو جێگەیەك بوونت هەبێت و خۆت هەمووکارێك ئەنجام بدەی" چونکە تۆ ئەنجامدانی هەندێك لەم کارانەت بە ئەندامانی دەستەکەت سپاردووە، ئەمەش بێگومان هەلی ئەوەت بۆ دەڕەخسێنێت ئەوکارە ئەنجام بدەی کە پێت گونجاوە و حەزت لێیەتی و چێژی لێ دەبینی، ئەمەش لای خۆیەوە هەستکردنت بە دڵەڕاوکێ کەمتر دەکاتەوە.

### ١٠-پێشکەوتن:

کاتێك پێسپاردن ئەنجام دەدەیت دەتوانی خۆت کاری گرنگتر ئەنجامبدەی، ئەمەیش لای خۆیەوە دەرکەکانت بەکراوەیی بۆ دخاتەسەرپشت بۆ پێشکەوتن و سەرکەوتن بەسەر پلەکانەی گەیشتن بەناوەندی خوازراوی پێشیاوت. تۆ ئێستا دەتوانی خۆت بڕیار لەسەر مەزنی و قازانجە گەورەکانی پێسپاردن بدەی.

## ٦٧-ئەوکارانە چین دەتوانی بەوانی تری بسپێری؟

((ئەوانەی حەزیان لەگۆرانی وتنە هەمیشە گۆرانی خۆیان دەدۆزنەوە))

**پەندێکی سویدی**



جۆری ئەو کارانە چین کە دەتوانم بەوانی تری بسپێرم؟ کامیان لەپێشترە بۆ پێسپاردن؟ چۆن دەتوانم متمانە بەوانی تربکەم کە ئەو کارەی پێیان دەسپێرم وەکو ئەوەی دەمەوێت و مەبەستمە بۆم ئەنجام دەدەن؟ ئایا پێت وانییە خەڵکانی تر واهەستبکەن من دەیانقۆزمەوە بۆ بەرژەوەندی خۆم؟
لەزۆربەی کۆڕەکانمدا ئەم چەشنە پرسیارانەم رووبەڕوو دەبێتەوە. بەڕێوەبەران دەیانەوێت کرداری پێسپاردن قازانج بکەن، بەڵام نازان لەکوێوە و چۆن دەست پێبکەن! هەمیشە بەدووی بیانودان بۆ ئەنجام نەدانی پێسپاردن.

هەمیشە بەپێی ئامازەکانی پرۆگرام سازیی زمانەوانیانەی دەمار لەبارەی هێزی خودییەوە وەڵامی پرسیارەکان دەدەمەوە، لەچوارچێوەی ئەنجامدا، لێیان دەپرسم:" گەر پێسپاردن ئەنجام بدەی چی ئەنجامێکت چنگ دەکەوێت؟ ئایا پلانێکت بۆ ئەمە هەیە؟ سامانەکانت چین؟ چۆن دەتوانی ئەم سامانانەت بەباشترین شێوە بەکاربێنی؟ " ئەم جۆرە پرسیارانە یارمەتییان دەدات بۆ چرپیرکردنەوە لە ئەنجامەکانی پشت بەکارهێنانی پێسپاردن نەوەك تیشك خستنەسەر هەوڵدان بۆ خۆدزینەوە لەبەکارهێنانی پێسپاردن.

کاتێك پلەی بەڕێوەبەری گشتی ئوتێلێکی پێنج ئەستێرەیی مۆنتریاڵم بەدەست هێناو دەستم دایە دروستکردنی کەناڵەکانی پەیوەندی، بەستنی کۆبوونەوە، تەواوکردنی ڕاپۆرتی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی ئوتێلەکە، دەبوو نەخشەدانێم، سیستەم چاکبکەم، کۆبوونەوە ئەنجام بدەن و بەدووی ئەنجامەکاندابم، لیستی کۆبونەوەکانم بەم شێوەیە بوو:

١- **ڕۆژانە**: لە کاتژمێر ٩ تاوەکو ٥:١٥ خولەك بۆ تاوتوێکردنی ئەنجامی کارەکانی ڕۆژی پێشووتر و دانانی پلانی کاری ئەمڕۆ.

٢- **هەموو دووشەمانێك**: لە ٣ بۆ ٤ ی پاش نیوەڕۆ، کۆبونەوەی لیژنەی جێبەجێکاری بۆ تاوتوێکردنی بڕیارە گرنگەکان و نەخشەبۆ دانانی.

٣- **هەموو سێ شەممەیەك**: لە ٣ بۆ ٤ ی پاش نیوەڕۆ کۆبونەوە لەگەڵ بەشی ژوورەکان، بۆ تاوتوێکردنی ئەوەی کاریگەری دەبێت لەسەر ئەم بەشە.

٤- **هەموو چوار شەمانێك**: لە ٣ بۆ ٤ ی پاش نیوەڕۆ کۆبونەوە لەگەڵ بەشی خۆراك و تاوتوێکردنی کار و کۆسپەکان.

٥- **هەموو پێنج شەمانێك**: لە ٣ بۆ ٤ ی پاش نیوەڕۆ کۆبونەوە لەگەڵ سەرۆکی بەشەکان بۆ تاوتوێکردنی هەموو کێشەکان و چۆنێتی باشترکردنی ئاستی خزمەت و بەرزکردنەوەی ئاستی بەکارخستنی ژوورەکان.

٦- **هەموو هەینییەك**: لە ١٠ بۆ ١١ ی بەیانی کۆبوونەوە لەگەڵ بەشی دارایی،بۆ متمانەدان (تەسدیقکردن)ی ئەنجامی هەژمارکاریەکان .

٧- **هەموو هەینییەك**: لە کاتژمێر ٣ بۆ ٤:٣٠ خولەك کۆبوونەوە لەگەڵ بەشی بازاڕاری و فرۆش.

ئەمانە و سەرباری کۆبوونەوە تایبەتی و جێبەجێکاریەکان کە ڕاهاتبووم بەردەوام لەگەڵ سەرۆکەکەمدا ئەنجامم دەدان، بۆ ماوەی سێ مانگ بەردەوام بووم لە بەستنی ئەم

کۆبونەوانە، لەم ماوەیەدا هەستام بە مەشق پێکردنی چەند کەسێك کە بەگونجاوم زانین بۆ یارمەتیدانم، بۆیە پاشی سێ مانگ شێوازی کۆبونەوەکانم بەم شێوەیەی لێهات:

١- کۆبونەوە ڕۆژانەییەکان بووبە ڕۆژێك نا ڕۆژێك.

٢- کۆبونەوەی جێبەجێکاری بەشێوەی کۆبوونەوە لەکاتی نانخواردن ئەنجام دەدرا.

٣- کاری کۆبوونەوە ەنجامدان بەبەشی ژورەکانم سپارد بە سەرۆك بەشەکە.

٤- کۆبونەوەی بەشی خۆراکم بە سەرۆکی بەشەکە سپارد.

٥- کۆبوونەوەی سەرۆك بەشەکانم بەکەسانی تر سپارد، بۆیە ناچار نەدەبووم خۆم ئەنجامیان بدەم.

٦- سەرۆکایەتی کۆبونەوەی بەشی فرۆش و بازاڕکاری بەکەسی گونجاو درا.

لەنێو ئەم کۆبونەوانەدا کەی زانیبام ئامادەبونم پێویستە ئامادە دەبووم و دواتر بەکەسێکی ترم دەسپارد، بەم کارەم توانیم نزیکەی دەکاتژمێر لە هەفتەیەکدا بۆم بگەڕێتەوە و لەجێگەیدا کاری گرنگتر ئەنجام بدەم، زۆرجار تەنها وەکو بینەر دەچوومە کۆبونەوەکانەوە. هەروەها سەرجەم کارە لاپەڕەییەکانم بەکەسێکی گونجاو سپارد تەنها ئەو کارانە نەبێت کەدەبوو هەرخۆم ئەنجامیان بدەم، بەڵێ من بۆخۆم بەم شێوەیە کارەکانم بەکەسانی تر دەسپارد، تۆیش دەتوانی هەمان کاری من ئەنجامبدەی، بۆئەمەش پێویستە:

- لیستی هەموو کاری ڕۆژانەت ئامادە بکەیت.
- کارە ڕۆتینیەکانی وەکو یاگاری نوسین و کاری لاپەڕەییت بەکەسانی تر بسپێرە.
- ئەوکارانەی کاتی زۆرت لێدەبەن بەکەسانی تری بسپێرە، بەتایبەت کۆبونەوەکان.
- وەڵامدانەوەی داوەتنامەکان بەکەسانی تر بسپێرە.

تەنها پێویستت بەوەیە خۆت ئەو شتانە ئەنجام بدەی کە دەزانی هەر دەبێت خۆت ئەنجامیان بدەیت. بەکورتی: ئەو کارانەی دەتوانی بەکەسانی تری بسپێری وەکو بڕیارێکە و خۆت دروستی دەکەیت، بەڵام بەر لەوەی پێسپاردن ئەنجام بدەی پێویستت بەوەیە بزانی بۆچی ئەنجامی دەدەی و چۆن ئەوکاتەش دەقۆزیتەوە کەلە پێسپاردنەوە بۆت دەگەڕێتەوە؟ ئەوجا دەبێت لەسەرخۆ دەستبکەیت بەکرداری پێسپاردن. ئەوجا هەر لە دەسپێکەوە دەست بە بەدواداچوونکردن بکە، ئەوجا نەختە نەختە خۆتیان لێ بەدووربخە و متمانە بەکەسی پێسپراو ببەخشە، بۆئەوەی ئەویش متمانە بەخۆی پەیدابکات و کاری پێویست ئەنجامبدات. لەم بوارەدا گوتەیەکی ڕۆناڵد ریگنم لەبیرە کە گوتی:" **کەسانی گونجاو دابمەزرێنە، ڕایان بێنە، پێیان بسپێرە، ئیتر دەست مەخەرە کاریانەوە**".

## ٦٨-پێسپاردن چۆن ئەنجام دەدەیت؟

((دەتوانی كارێك بەكەسێك بسپێریت، بەڵام ناتوانیت بەرپرسیارێتی ئەو كارەی سپاردووتە لەئەستۆ نەگریت))

فرانك.ف.هوپ



ئێستایش باوەكو دەست بەوەبكەین كە چۆن پێسپاردن ئەنجام دەدەیت؟ بەڵام بەر لە ئەنجامدانی ئەمە پێویستمان بە تێگەیشتنی ڕاستییەكی گرنگە، ئەویش ئەوەیە كە: پێسپاردن تیابووی سەركێشییە، هەربۆیە پێویستە هەر لەسەرەتاوە خۆت ڕابێنی لەسەر ئەوەی تاوەكو چی ڕادەیەك تەهەمولی شكست و لەئەستۆگرتنی هەڵەكان دەكەیت؟ ئەوجا سەر لەنوێ خۆت ڕابێنە و ئەمەش یازدە كلیلە بۆ چۆنێتی ئەنجامدانی پێسپاردن:

١) لیستی هەموو كارمەندانت بنوسەرەوە، ئەوانەی حەزیان لەكار پێسپاردنە، خاڵی لاواز و بەهێزیشیان بنوسەرەوە:

**بۆنمونە**

| ناو | خاڵی بەهێز | خاڵی لاواز |
| --- | --- | --- |
| چێنەر | پەیوەندیكارێكی چاكە | ڕقی لەكاری لاپەڕەییە |
| چەتۆ | خێرایە | زۆرجار شتەكان |
| چۆمان | وردەكارە | فێرنابێت |
| چیاڤان | حەزی بە گرموە | خۆدووركرە، هێمنە |
|  | ئاستەنگە | ڕقی لە قسەكردنە بە |
|  |  | دوور بێژ |

٢) لیستی ئەو کارانە بنوسەرەوە کەدەتەوێت بەوانی تری بسپێریت.

٣) کاتێکی دیاریکراو بۆ ئەنجامدانی کارەکە دیاریبکە.

٤) هەوڵبدە هەرکەسێك بەپێی بەهرە و لێهاتوویی کاری پێ بسپێریت.

٥) چاوپێکەوتن لەگەڵ هەمو کارمەندە پێشوەکانت ئەنجامبدە و پرسیاری چۆنێتی چارەکردنی ئەم دۆخەیان لێبکە،لە کاردانەوەیدا دەتوانی تێبینی ئەوەبکەیت کەحەزی لە دووبارە کارکردنە، هەروەها خاڵە حەزپێکراوەکانی کارکردنی دەزانی.

٦) دۆخەکەی بۆ روون بکەرەوە، پێشبینیەکانی خۆتی تێبگەیەنە و دڵنیابە لەوەی لە دۆخەکەت گەیشتووە.

٧) لە کردارەی دیاریکردنی ئامانجدا بەشداری پێبکە.

٨) رێگەی پێبدە کاتی جێبەجێ کردنی کارەکەی دەست نیشان بکات (( وریابە لەو کەسانەی بڕوایان وەهایە دەتوانن بەئاسانی و خێرایی کارەکە ئەنجامبدەن)).

٩) نەخشەکە بنوسەرەوە و لەبەرگیراوەیەکی بدەرێ و لای خۆیشت لەبەرگیراوەیەکی بهێڵەرەوە بۆ بەدواداچوون.

١٠) سیستمێك بۆ چۆنێتی پەیوەندی کردن و پێشکەشکردنی راپۆرتەکان دیاریبکە، هەفتانە سێ جار دەبێت لەگەڵیدا دانیشیتەوە، ئەوجا نەختە نەختە ئەم کۆبونەوانەش کەم بکەرەوە.

١١) بەدواداچوون، ئەم وشەیە تیابووی کلیلی سەرکەوتنە، لەبیرت نەچێت نابێت کار بەوانی تر بسپێری و تەواو دەستیان لێ هەڵبگریت، دەبێت بەجوانی بەدواداچونیان بۆ بکەی، بۆئەوەی دۆخەکان لەدەستی خۆت دەرنەچن.

## گرنگ

١- زيادە ڕەوی مەكە لە پێسپاردن.. ئەگینا دەستەڵاتت لەدەست دەدەيت.

٢- پشتیوانی بڕیاری كەسانی كار پێسپێردراوت بكە، بە بڕیار و هەڵەكانیشیان قایل بە،لەبیرت نەچێت كە خۆتیش هەڵەت كردووە. كۆنفۆشیۆس دەڵێت:" **بهێڵە كەسەكەی تر كاری خۆی بكات بەبێ دەست تێوەردانی تر**" .

٣- نەخشەی جێگرەوەت هەبێت بۆ نەخشەكەی تر و لەكاتی شكست هێنانیدا بەكاری بێنە.

٤- هەر ئەركێكت بەكێ سپارد ڕۆڵەكەی لێ مەستێنەرەوە ئەگینا ئەو كەسە هەست بە خۆ بەكەم زانین دەكات و متمانەی بەخۆی و دەستەكەیشی نامێنێت.

ئێستا تۆ بە تەواوەتی لەسودەكانی پێسپاردن گەیشتووی و دەزانی چۆن كات و پارە و كەم ئەركی و وزەی زۆرت بۆ دەگێڕێتەوە و یارمەتی خۆت و دامەزراوەكەشت دەدات بۆ پتر گەشەكردن و گەیشتن بە لوتكەی نوێ. هەر ئەمڕۆ دەست پێبكە و بهێڵە كە پێسپاردن ببێتە بەشێك لەشێوازی سەركردایەتی كردنت، گەر ڕوویدا و بەخێرایی نەگەیشتیت بە ئەنجامی خوزراو ئەوا خۆت بێ ئومێد مەكە و بەكەم سەیری خۆت مەكە، ئارام و سەورت هەبێت و لەبیرت بێت ئەوكاتەی كارێكت ئەنجامدا تۆیش هەڵەت كردووە و دواتر هەستاویتەوە. هەرگیز دەست لە پێسپاردن هەڵمەگرە، بەڵكو برەوی پێبدە. تۆماس ئەدیسۆن جارێكیان دەڵێت:" **زۆربەی كەسانی شكست خواردوو ئەوانەن نەیان زانیوە چەندە لەسەركەوتنەوە نێزیكن كاتێك خۆیان بەدەستەوە داوە**" . پێسپاردنی هەندێك كار بە دەستەی كاركەرانت یارمەتییان دەكات بۆ هەستكردن بەگرنگی خۆیان و بەكارخستنی تەواوی وزە و تواناكانیان بۆ گەشەپێدانی خود و دامەزراوەكە و بەدەست هێنانی سەركەوتن. لە كتێبی چینی بۆ سەركردایەتیدا هاتووە:" **مەیمونێك بخەرە قەفەسەوە دەبینی وەكو بەرازی لێدێت! ئەوەك لەبەرئەوەی ناژیرێت یان خێرا بەڵكو لەبەرئەوەی شوێن و ڕووبەری گونجاوی دەست ناكەوێت بۆ دیارخستنی تواناكانی**".

# کلیلی یازدەهەم

## کۆبونەوەکان..

## دەبم.. یان نابم



(( کۆبوونەکان دەگونجێت ببنە نەهامەتییەك و پارەی زۆر لە دامەزراوەکەت بەفیڕۆ بدەن، یاخود دەبنە ناز و فەڕیی و ئامرازێك بۆ بەدیهاتنی سەرکەوتنی خوازراو))

**د.ئیبراهیم فەقی**

## ٦٩-ئایا ئەم کۆبونەوەیە زۆر گرنگە؟

((گەر کارەکە بە بێگومانی دەستی پێکرد، ئەوا بەگومان کۆتایی دێت، بەڵام گەر قایل بوو کە بە گومان دەست پێبکات ئەوا بێگومان بە بێگومانی کۆتایی دێت))

**فرانسیس بیکۆن**



هەرگیز ڕوویداوە لە کۆبوونەوەیەکدا پتر لەیەک کاتژمێر خۆت ڕاگرتبێت و دواتر گوتبێتت:" باشە من لێرەدا چی دەکەم؟"، یاخود لە کۆبونەوەیەکدا ئامادە بیووی و وەهات هەست کردبێت کۆتایی نایات و لەخۆت پرسی بێت:" باشە بۆچی ئەم کۆبونەوەیەم ڕێك خست؟". لەبیرتە هەرگیز کۆبونەوەیەکت ڕێکخستبێت بەبێ ئامانجێکی دیاریکراو و لەوێدا گوێت لە سکاڵا و گازەندی سەرۆکت بێت لە کارمەندانی ژێردەستت، بەوەی ناقایلە بە ڕەفتار و شێوازی کارکردنیان. گەر وەڵامەکەت بۆیەکێك لەو پرسیارانەی پێشوو بەڵێ یە ئەوا بزانە کە کات و پارەی زۆرت بەفیڕۆ داوە.

ڕەنگ نەزانیت تەنها لە ئەمەریکای باکوردا ڕۆژانە نزیکەی ٢٠ ملیۆن کۆبونەوە ئەنجام دەدرێت. لە لێکۆڵینەوەیەکی دامەزراوەی سری ئێم (3M) کە لە ساڵی ١٩٨٨ دا ئەنجامی داوە دیارکەوتووە کە بەڕێوەبەرانی جێبەجێ کاریی نزیکەی ٢٣ کاتژمێر لە هەفتەیەکدا بەبەستنی کۆبونەوەوە بەسەردەبەن، تەنها ٥٢٪ ی ئەم هەموو کۆبونەوانەیش کارا و بەسودن، لەکاتێکدا ٢٢٪ ی ئەم کۆبونەوانە دەترێت بە پەیوەندییەکی دووربێژی یاخود بەنامەیەك ئەنجامبدرێت و پێویستی بە کۆبونەوە نییە.

لە گۆڤاری سەرکەوتن(Success)توێژینەوەیەك بلاْوکراوەتەوە کە تێیدا هاتووە: لە توێژینەوەیەکی نوێدا کە لەسەر ٢٠٠٠ بەڕێوەبەری جێبەجێکاریدا ئەنجام دراوە. دیارکەوتووە کە زۆربەی ئەم بەڕێوەبەرانە زۆرینەی کاتەکانیان بە کۆبونەوەوە بەسەر دەبەن بەڕێژەی ٧٩٪، ئەم کاتە لەخۆگرتەی کاتەکانی خۆئامادەکردن بۆ کۆبونەوە ناگرێتەوە، هەروەها جێبەجێکاران وەهای دەبینن کە سێیەکی ئەم کۆبونەوانە بێبەرهەمە و کات و پارەی زۆری تێدا بەفیڕۆ دەدرێت کەدەگاتە ٣٧ ملیار دۆلار لەهەموو کیشوەرەکەدا.

توێژینەویەکی دیکە هەیە دەڵێت: پیاوی کاری ئاسایی نزیکەی ١٢ کاتژمێر هەفتانە بە کۆبونەوەوە بەسەردەبات، هەروەها ٢٢ کاتژمێریش بە کارگێڕی ناوەندیی، بەلاْم بەکارگێڕی بالاْوە نزیکەی ٤ ڕۆژ بەسەردەبات، هەروەها توێژینەوەکە دەڵێت: نزیکەی ٥٣٪ی ئەم کۆبونەوانە بێبەرهەمن و تەنها ٤٧٪ ی ئەم کۆبونەوانە بەکەڵکن، ئەم بەڕێوەبەرانە دەیانەوێت پێمان بڵێن: هەر کاتژمێرێك کەلە کۆبونەوەدا بەسەری دەبەین نزیکەی ٣٠ خولەکی بەفیڕۆ دەدڕوات.

## بۆجاری داهاتوو کە بڕیاردەدەی بە بەستنی کۆبونەوە پێویستە ڕوو لەم پرسیارانە بکەیت:

- ئایا بەڕاستی ئەم کۆبونەوەیە گرنگە؟
- ئامانج لەبەستنی ئەم کۆبونەوەیە چییە؟
- ئایادەتوانم کۆبونەوەکە ئەنجام نەدەم و لەبریدا پەیوەندییەکی تەلەفۆنی یاخود بەنامەیەك کێشەکە چارەبکەم؟
- ئایا لەڕێگەی کۆبونەوەی تاکەکەسییەوە دەتوانم ئامانجەکانم بپێکم؟

**گەر بینیت کۆبونەوەکە ١٠٠٪ گرنگ و پێویستە ئەنجامی بدەی ئەوا دەبێت ئەم پرسیارانە ئاستەی خۆت بکەیت:**

- کێ دەبێت بانگێشتی کۆبونەوەکە بکەم؟
- ئایا بەڕاستی پێویستم بەم هەموو کۆبونەوانەیە؟
- ئایا دەبێت لەم کۆبونەوەیەدا ئامادەبم؟

گەر وەڵامەکەت نەخێر بوو پێویستت بە پێسپاردنە، بەڵام گەر وەڵامەکەت بەڵێیە ئەوا ئەم پرسیارانە ئاراستەی خۆت بکە:

- ئایا دەبێت لەم کۆبونەوانەدا ئامادەبم و تاوەکو کۆتایی دێت نەڕۆم؟
- ئەم کۆبونەوانە چەندە کاتی دەوێت؟

لەکۆتادا لەخۆت بپرسە: ئەو کۆبونەوەیە چەندە کات و پارەی دەوێت و بەرهەمی چییە؟ دەتوانی چەند خولەکێك بەخۆت بدەیت بۆ شیکردنەوەی تێچوونی ڕاستەقینەی کۆبونەوەکە، بیشزانە کە شیکردنەوەی وەڵامەکان و تێچوونی کۆبونەوەکان بڕێکی باشی پارە بۆ دامەزراوەکەت دەگێڕێتەوە. خۆت لە بەستنی کۆبونەوە دوورمەگرە، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێت کۆبونەوە ئەنجامبدەی، بەڵام بەرهەم داربێت و ئامادەبوانیش لەکاتی کۆبونەوەکەدا بۆلای خۆت کێش بکەیت و مەهێڵە کۆبونەوەکە لەدژی خۆت بشکێتەوە.

# ٧٠-حەوت هۆكاری پشت بەستنی كۆبونەوەكان:

((گرنگ نییە خەڵكی چی لەبارەی بەستنی كۆبونەوەكانەوە دەڵێن یاخود بڕوایان چۆنە، گرنگ ئەوەیە كۆبونەوە هەر هەیە و هەمیشەییە))

**كلید و.برلسۆن**



كۆبوونەوە بووەتە شتێكی گرنگ و پێویست بۆ سەركەوتنی دامەزراوەكان، هەروەها چەندین كاتیش هەیە كەدەتوانرێت كۆبونەوە نەبەسترێت و لەبریدا نامەیەك بهەنێردرێت یاخود بەتەلەفۆن كێشەكە چارەسەر بكەیت یان كەسێك بهەنێری یاخود بانگی كەسێك بكرێت، بەلاَم زۆرجار نامە هۆكارە بۆ زیان گەیاندن بەخۆت و دامەزراوەكەت، وەرە باوەكو پێكەوە بەجوانی بیربكەینەوە: ئایا بڕوات وەهایە كە نامە كارابێت؟ بەڵێ بێگومان بەسود دەبێت گەر بۆخۆشی بێت و بتەوێت زانیاری زێدەبار بەكەسێك بگەیەنیت بەتایبەت لەڕێگەی خۆراكپێدانی پەرچكراوە( فیدباك)وە، بەلاَم بهێڵە باوەكو پرسیارێكت لێبكەم: بۆ نوسینی ئەو نامە پرسیارییە چەندە كاتت دەوێت؟ ئەی كاروانكارت چەندە كات بەفیڕۆ دەدات بۆ نوسین و بلاَوكردنەوەی ئەم نامانە؟ هەروەها لەو خولەكەوەی نامەكەت هەنارد چیتر تۆ ناتوانی هەڵی بسوڕێنی و چی هەڵەیەكت تێیدا كردبێت تازە لەدەست دەرچووە و گەر هەڵەتێگەیشتن ڕوویدات ئەوا توشی خەمۆكی و كات بەفیڕۆدان و ونێتی و تەنانەت بیرۆكراتیەتیشت دەكات، ئەمەش لای خۆیەوە هۆكارە بۆ نەهێشتنی هاندان لای كارمەندانت. لەڕاستیدا توێژینەوەكان بەوە ڕاگەیشتوون كە نامە هیچ

سودێکی نییە و بێکەڵکە بۆ پەیوەندی کارگێڕی. لەڕاستیدا مەبەست لێرەدا ئەوە نییە کە هەموو جۆرە نامەیەك بێ کەڵکە بەڵکو لە ڕوانگەی کارگێڕی و بەڕێوەبردنەوە سودێکی ئەوتۆی نابێت و زۆرجار هەڵە تێگەیشتن ڕوودەدات.

کۆبونەوەکانیش بۆ زۆر مەبەست دەبەستێرێت: هەندێك بەڕێوەبەر نازانن لەکۆتایی ڕۆژی کار(دەوام)دا چیبکەن! هەندێکی تریش بۆخۆ بەسەرقاڵ پیشان دان کۆبونەوە ئەنجام دەدەن، یاخود بۆخۆ بە گەورەپیشاندان، یاخود هەر بۆخۆشییە و کردویانە بەخوو کە دەبێت هەفتەی جارێك یان دووجار کۆبونەوە ئەنجام بدرێت، لێرەشدا گرنگترین هۆکارەکانی پشت بەستنی کۆبنەوەکانت بۆ دەخەمەڕوو:

**١-نەخشەڕێژی:**



نەخشەڕێژی (پلاندانان) یەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی پشت بەستنی کۆبونەوەکانە، نەخشەڕێژییە هەمووجۆرەکان دەگرێتەوە، جا بازارکاری بێت یاخود فرۆشتن، یان فراوانکردن یان سەرلەنوێ دەستپێکردن و ..هتد، گرنگ ئەوەیە ئامانجی بەڕێوەبەرەکە لە بەستنی ئەم کۆبونەوەیە خۆراکپێدانی پەرچکراوەی ئەرێیی دەبێت لەگەڵ خستنەڕووی بیرۆکەی نوێ بۆ دارشتنەوەی نەخشەی باشتر.

٢-بڕیاردروستکردن:

بەڕێوەبەرەکە ئەندامانی بانگێشتی کۆبنەوەیەك دەکات و تێدا تاوتوێی بابەت یان دۆخێك بکەن و بڕیارێکی بەکۆمەڵی لەبارەوە بدەن، ئەم بڕیارە جیاوازە لە بڕیاری تاکەکەسی ویەکلانەی بەڕێوەبەر" چون ئەم بڕیارە کاراترە.

### ٣-گەیاندنی زانیاریەکان:

ڕەنگە بەڕێوەبەرەکە کۆبونەوە بە کارمەندانی بکات بۆ گەیاندنی تازەترین زانیاریەکان بەئەوان، هەروەها تازەترین ئاراستەکانی بازاڕی کار و چۆنێتی جولانەوە ڕەگەڵ کۆمپانیا کێبڕکێ کارەکاندا.

### ٤-چارەکردنی کێشەکان:

هەندێك کۆبونەوە دەبەستێرێت بۆ چارەکردنی کێشەی نێوان کارمەندان و چارەکردنی سکالأی کڕیاران و ئەو گازندانەی کاریگەری لەسەر ئاراستەکانی کارکردن هەیە. ئامانجی بڕێوەبەر لەپشت بەستنی ئەم کۆبونەوەیەوە گەیشتنە بە باشترین ئەنجام و چارەسەر.

### ٥-هاندان و پاداش:

ڕەنگە کۆبونەوەکە بۆ پێ هەڵدان و ڕێزلێنان بێت لە کارمەندێکی کارا لەپێش چاوی هەموانی تر، ئەمەش بۆ هاندانی ئەوانی ترە.

### ٦-مەشقپێکردن:

یەکێکی تر لەهۆکارەکانی پشت بەستنی کۆبونەوەکان مەشقپێکردن و بەرزکردنەوەی ئاستی توانایی و باشترکردنی شارەزاییانەو ئەمەش لەشێوەی خستنەڕووی زانیاری و ڕێنمایی دەبێت، لەگەڵ فێرکردنیان بە شێوازە نوێیەکانی فرۆش یان خزمەتی کڕیاران یاخود هەرجۆرێکی تر لەو مەشقانەی کە بەسود دەبێت بۆ دامەزراوەکە.

### ٧-دروستکردنی دەستەی کار:

کۆبونەوەکان بەسود دەبێت بۆ دروستکردنی دەستەی کارز دەستەی کار هاوبەرپرسیارن، بڕیاردەرن، ئامانج دیاریکار و هەنگاونەرن بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە خوازراوانە.

وەك دەبینی کە کۆبونەوەکان تەنها ئەوە نییە کارا و بەسودبن، بەڵکو یەکێك دەبێت لەهۆکارەکانی سەرکەوتنی ڕاستەقینە، ئەوەی لێرەدا پێویستە تەنها فێربوونی چۆنێتی بەستن و قازانجکردنی کۆبونەوەکانە" لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانتدا.

## ٧١-حەوت جۆر خەڵك لە نێو كۆبونەوەكاندا:

((لیژنە چییە جگە لـە کۆمـەڵێك خـەڵك خولـەك ڕەچـاودەکەن کەچـی کاتـژمێر بـەفیڕۆ دەدەن))

**میلستۆن بریل**



### ١-زاڵ :

ئەم جۆرە کەسانە بۆماوەیەکی زۆر لە دامەزراوەکەدا کـاری کـردووە، بۆیـە واهەسـت دەکـات کـە خـاوەنی شـارەزاییەکی باشـە و لەهـەموان بـەزانیاریترە، بۆیـە هەوڵدەدات زاڵبێت بەسەر شێوازی کۆبونەوەکاندا.

### ٢-خوێندەوار:

ئـەم جـۆرە بـڕوای وەهایـە وەڵامـی هـەموو پرسـیارەکانی لـەلادا بەردەسـتەو بۆیـە شـیکردنەوە و ڕوونکردنـەوەی زۆر بـۆ ئـەوانی دەڵێـت و دەخاتـەڕوو هەربۆیـە بەهۆیـەوە ئەوانی تر هەست بەبێزاری دەکەن لەکاتێکدا بخۆیشی کەسێکی بێمەڵام و چاکیشە.

### ٣-پچڕێنەر:

دەبینی ئەم کەسە لەناکاو قسەدەکات، حەز دەکات هـەموان بـزانن کـە ئـەمیش شـت دەزانێت و وەڵامی هەموو پرسیارەکانی لەلادا بەردەستە و تەنانەت زۆرجـاریش لەبابەتـە دەردەچـێت و باسـی شـت گـەلێك دەکـات نەلـەدوور و نـەش لـەنێزیك پەیوەنـدی بـە بابەتەکەوە نییە.

## 4-حەزکار بەقسەی لاوەکی:

ئەم جۆرە کەسانە حەزیان بەوەیە لەگەڵ کەسی تەنیشتیدا قسەبکات، جا گرنگ نییە بەلایەوە کێی تر قسە بۆ هەموان بکات، ئەم کەسە دەیەوێت سەرەنجی ئەوانی تر بۆلای خۆی کیچش بکات و لە کۆبونەوەکە بەدووربێت.

## ٥-نەرێنی:

ئەم کەسە هەمیشە هەستە نەرێنیەکانی دەربارەی کۆبونەوەکە دەخاتە ڕوو، یاخود بەرامبەر ئەوانی تر، مرۆڤێکی نەرێنی سۆزدارە، ئەوانی تر وەها تێدەگەیەنێت کە ئەم کۆبونەوەیە سودێکی نییە و باشتر وەهایە هەرنەبەستێرێت و داوا لەوانی تریش دەکات وەکو ئەو بیربکەنەوە بۆئەوەی هەست بە پەشیمانی نەکەن.

## ٦-شەرمۆك:

ئەم جۆرو کەسە متمانە و ڕێزلەخۆگرتنی لەدەستداوە، ئامادەی ئەنجامدانی هەمووشتێکە تەنها لە ئەوەنەبێت لەم کۆبونەوەیەدا قسەبکات، لەڕاستیدا ئەم کەسە ئامادەبوونی لەم کۆبونەوەیەدا وەکو کارتۆنێك وەهایە و لەسەر کورسیەك دانرابێت، بەڵام سەرباری ئەمە بەتەنها گەر خۆی کاربکات کەسێکی کارا و زۆرجاریش بەکارکردنی لەگەڵ دەستەکەیدا کارایی خۆی دەنوێنێت.

## ٧-شێواو-پەشۆکاو:

کاتێك گوێ لەم جۆرە کەسانە دەگریت هەرچی دەکەیت لێیان ناگەیت و یەك دێری بەسودیان لێ وەرناگریت. گەر پرسیارێکت لێکردن دەبینی وەڵامی پرسیارێکی تر دەدەنەوە، یاخود دوو وەڵامت دەداتێ و لێت دەپرسێت:" مەبەستت چییە؟ یاخود کامیان باشترە؟".

کاتێك بزانی چۆن ڕەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەی نێو کۆبونەوەکاندا ڕەفتاردەکەیت ئەوا ئاشنای خاڵە بەهێزەکان دەبیت بۆ چۆنێتی باش بەکارهێنانیان، تۆ دەتوانی لەجهانی تایبەتی ئەواندا بیاندوێنی و پێیان بگەی، بەگومانبە لەوەی هەرکەسە تەنها یەك شێوە لەو کەسێتیانەی تێدابێت! بەڵکو پتر لەیەك چەشنە کەسێتیان هەیە. هەوڵبدە کۆبونەوەکانت بەچێژبکە و هەر لەسەرەتاوە لەشێوازی ڕەفتاری هەموان دڵنیابە و تێبینی بکە. بزانە تاوەکو باشتر هەوڵی تێگەیاندنیان بدەی ئەوەندەش ئەم کۆبونەوانەت بەسود و کاریگەرتر و بەئەنجامتر دەبن.

## ٧٢-دەهۆكاری پشت شكست هێنانی كۆبونەوەكان :

((خودی كۆبونەوەكان شتێكی ناكارا و بێبەرهەم نین، بەڵكو ئەوە خەڵكن وەهای لێدەكەن))

**د.ئیبراهیم فەقی**

بۆچارە ڕەشی زۆرێك لە كۆبونەوەكان چارەنوسی شكست دەبێت، ئەمە سەرباری ئەوەی كە زۆرێك لە دامەزراوە و بەڕێوەبەرانی جێبەجێكاری بڕێكی زۆری پارە لەبۆ سەرخستنی ئەم كۆبونەوانە خەرج دەكەن، باوەكو ئێستایش لێت بپرسم: بۆچی زۆرێك لە بەڕێوەبەران سەرباری ئامادەكاری وردیش كەچی كۆبونەوەكەیان شكست دەهێنێت؟ وەرە باوەكو پێكەوە سەیرێكی ئەو هۆكارانەبكەین كە لەپشت شكست هێنانی كۆبونەوەكانن:



### ١-نەكردنی ئامادەكاری پێویست:

نەبوونی ئامادەكاری پێویست و گونجاو هۆكارێكی گرنگی پشت شكست هێنانی كۆبونەوەكانە. بەڕێوەبەر بەبێ ئامادەكاری پێش وەخت داوای كۆبونەوە دەكات و چی بەمێشكیدا هات هەمووی دەڵێت. نەبوونی ئامادەكاری بەزیان و بێ سودە، كێشە و ناكۆكی لەنێوان ئەندامە ئامادەبووەكانی كۆبونەوەكەدا دروست دەكات و بەهۆیەوە شكست بە كۆبنەوەكە دەهێنێت.

## 2-نەبوونی ئامانج:

ئەنجامدانی کۆبونەوە بەبێ ئامانج وەکو لێخورینی ئۆتۆمبێلە بەبێ ئاراستەی دیاریکراو، هەردووکیان بەهیچ کۆتاییان دێت. بانگێشت کردن بۆ کۆبونەوە بەبێ ئامانجی دیاریکراو مانای شکست و زیانە گەیاندنە بەهەمووان. زۆرجار بەستنی کۆبونەوە بووەتە خوو، هەربۆیە بنچینەی شکستیش دەبێت.

## ٣-دانەڕشتنەوەی خشتەی کار:

ڕەنگە بەبێ داڕشتنەوەی خشتەی کاری ئاراستەکردن لە کۆبوونەوەکە بەڕێوەبەرێك کۆبونەوەیەك ئەنجام بدات، خەڵکان بۆ کۆبونەوەکە دەچن بەبێ ئەوەی بزانن بۆچی بۆی دەچن. نەبوونی خشتەی کار هۆکاری پشت فراوانبوونی ئەندێشە و بڵاوبوونەوەی واتەوات و دەرکی قسەی قۆڕ بۆ هەموان دەکاتەوە. ئەمەش ناچاری بەڕێوەبەردەکات لەهەندێك دەرك بدات کە هیچ پەیوەندییەکی بە کۆبونەوەکە نییە و کاتی خۆی و هەموانی تریش بەفیڕۆ بدات و کۆبنەوەکەش شکست دەهێنێت.

## ٤-زیادە ژمارەی ئامادەبووان:



بەڕێوەبەری بانگی کارمەندێکی زۆر دەکات بۆ کۆبونەوەکە و وەهای باوەڕە تاوەکو زۆرتربن ئەم باشتر کاریان دەکاتەسەر و ئامانجەکانیان بۆ ڕوونتردەکاتەوە. بەلأم توێژینەوەکان سەلماندوویانە تاوەکو ژمارەی بەشداربووانی کۆبونەوەکان زۆربێت هەلی قسەکردن و ویتەویت و پەشیمان کردنەوە زیادتردەبێت، هەروەها کاتی کۆبونەوەکەش زیاد دەبێت، تەنانەت گەر خۆراکپێدانی پەرچکراوە(فیدباك) ئەنجام بدرێت بەهۆی زۆری ئامادەبوانەوە نرخی ئەم فیدباکە کەم دەبێتەوە و بەبەهایش نابێت.

### ٥-ئامادەبوون لە زۆر كۆبوونەوەدا:

ئایا ئەنجامدانی كۆبونەوەی زۆر هۆكاری باشتربوونی ئەنجامەكانە؟ بەپێی شارەزایانی كۆمەڵناسی و بەتایبەت ڕۆبێرت ب.نلسۆن و پیتەر ئیكۆنۆمی نوسەری كتێبی" كۆبونەوە كارێكی باشتر" وەڵامی ئەو پرسیارەی پێشوتر نەخێر دەبێت. زۆری كۆبونەوەكان هۆكارە بۆ ورووژاندنی داڕووخان لای ئەندامانی دەستەی كارت. زۆر و دووبارەبوونی كۆبونەوەكان وەهات لێدەكات لە ئەنجامدانی كارەكانت جیاوازتربیت، وەڵامدانەوە بۆ هەموو بانگێشتەكان كارێكە بۆ كەمبوونی بەرهەم و هۆكاریشە بۆ بێزاربوون و كەمبوونەوەی بەهای كۆمەڵایەتی.

### ٦-ناكۆكی تایبەتی:



لەكاتی بەستنی كۆبونەوەكەدا بەڕێوەبەر هەڵدەستێت بە ڕێگەدان بە هەندێك لەكارمەندانی بۆئەوەی لەكاتی كۆبونەوەكەدا بەرامبەر یەكتر بوەستنەوە، بەو بڕوایەی ئەمە دەبێتەهۆی ئەنجامێكی باشتر، بەڵام لەڕاستیدا ئەمە ڕێگەیەكە بۆ دروستبوونی بەرەكاری و بەهۆیەوە كۆبونەوەكە شكست دەهێنێت.

### ٧-ڕەخنە:



گەر بەڕێوەبەر كۆبونەوەكەی بۆ ئەوەبەستبێت كە ڕەخنە لە ڕەفتار و بۆچوونی ئەوانی تر بگرێت ئەوا ئەندامانی كۆبونەوەكە هەست بەترس و داڕوخاوی دەكەن، ئەمەش بێگومان هۆكارە بۆ شكست هێنان بەم كۆبونەوەیە.

**٨-بەشدارێتی نەکردن:**

لەزۆر کۆبونەوەدا دەبینی تەنها بەڕێوەبەر قسەدەکات و ڕێگە بەوانی تر نادات فزەبکەن، ئەوجا دەپرسێت گەر یەکێك تێبینییەك یاخود قسەیەکی هەبێت! لەزۆربەی کاتەکانیش وەلامێك بۆ تێبینیەکانی ئامادەبوان نابێت، ڕەنگە یەك یاخود دووکەس قسەبکەن، یان هەر هیچ نەگوترێت. ئەم جۆرە کۆبوانەوانە بیرۆکراتین و هۆکاری پشت بێزارکردنی ئەوانی ترە و ئامادەبوان ناچاردەکەیت هەست بە کەمێتی خۆیان بکەن و ئەمەیش هۆکارە بۆ شکست هێنانی کۆبونەوەکان.

**٩-دیارینەکردنی کاری داهاتوو:**

کاتێك کۆبونەوەکە زۆربەباشی بەڕێوە دەچێت و هەموان دەتوانن بەشداربن و کێشەیش دروست نابێت، بەڕێوەبەر لەکۆتادا داوا لە ئامادەبوانی ناکات لەداهاتوودا دەبێت چیبکەن. بەڵکو تەنها سوپاسی ئامادەبوان دەکات و بەهیچ شێوەیەك ئاراستەی کارمەندانی ناکات. هەربۆیە کۆبونەوەکە بەشکست کۆتایی دێت.

**١٠-نەکردنی بەدواداچوون:**

بەڕێوەبەر بانگێشتی کارمەندانی دەکات بۆ کۆبونەوە و ئاراستەکانی دیاری دەکات و دواتر کۆبونەوە کۆتایی دێت، بەلام گرنگی بە بەدواداچونکردن بۆ ڕێنماییەکانی ناکات و چی شتێکی لە کۆبونەوەکەدا بە ئەندامانی سپارد دواتر لەبیری دەکات. **بزانە کە بەبێ بەدواداچوون کۆبونەوەکان سەرکەوتوو نابن.**

بێگومان دەشتوانی هۆکاری تر بۆ شکست هێنانی کۆبونەوەکان بدۆزیتەوە، بەلام بڕوام وەهایە-بەپشت بەست بە لێکۆڵینەوەکانم- لیستەکەی پێشووتر هۆکارە سەرەکیەکانی لەخۆ گرتووە. هەوڵبدە جارێکی تر لە کۆبونەوەکاندا نەکەویتە ئەو هەڵە باوانەوەی کە دەبنە هۆی شکست هێنانی کۆبونەوەکە، لەم چوارچێوەیەدا قسەیەکی

جیم ڕۆن ی نوسەری کتێبی:" لەژیانێکی ناوازەدا"ت بۆ دەهێنمەوە کە دەڵێت:" **هۆکاری پشت شکست بڕیاری هەڵەیە و هەموو ڕۆژێك دووبارە دەبێتەوە**"، بۆیە وریابە لەدووبارە بەستنی کۆبونەوەی ناکارا، هەوڵبدە لە هەڵەکانی پێشووترتەوە فێربیت، لەهەڵەی ئەوانی تریشەوە فێربە و بەرەو سەرکەوتن ڕێگەت بدۆزەرەوە. پەندێك هەیە تێیدا هاتووە:" **لەهەڵەی ئەوانی ترەوە فێربە" چونکە کاتت ئەوەندە زۆر نییە بکەویتە هەمان هەڵەوە**" .

## ٧٣-پازدە بڤە لەکاتی ئامادەبوون لە کۆبونەوەکاندا:

((ئەوەی مرۆڤ دروستی کردبێت دەتوانێت بیگۆڕێت))

**فریدریك مۆرفرسۆن**

**بەرلەوەی بڕۆی بۆ هەر کۆبوونەوەیەك ئەم لیستە بخوێنەرەوە:**




١) کەدەزانیت ئامادەنیت مەڕۆ بۆ کۆبونەوەکە و باشتر وەهایە دوای بخەی بۆ کاتێکی تر.

٢) هەرگیز دوامەکەوە لە کۆبونەوەکە، جابیانو و هۆکارەکانیش هەرچییەك بن.

٣) بانگێشتی کەسی زۆر مەکە بۆ کۆبونەوەکە، تاوەکو ژمارەکە زۆربێت کۆبونەوەکە بێبایەختر دەبێت.

٤) خۆت ئەو زانیاریانە دابەش مەکە کەئیشی کارڕەوانکارتە، بۆئەوەی کاتی زۆرت لەدەست نەچێت.

٥) قسە بەکەس مەبڕە.

٦) هیچ قسەیەك بە دوژمنکارانەی تایبەتیانە وەرمەگرە.

٧) شەڕە قسەمەکە.

٨) مەبە تاکە کەسێك قسەبکات، ڕێگە بەوانی تریش بدە.

٩) لە ڕێکنەکەوتن مەترسە، گەر تایبەتی نەبوو.

١٠) هەڕەشە لەکەس مەکە.

١١) ڕێگە بە زمانی زبر و پیس مەدە و بەکاریشی مەهێنە.

١٢) نەرێنیانە قسەمەکە.

١٣) رشێگە بە قسەکردنی لاوەکیانە مەدە.

١٤) کاتی زۆرتر لە کاتی کۆبونەوەکەت بەکارمەهێنە.

١٥) لەبیری نەکەیت ڕاسپاردە و سوپاس گوزاری پاش تەواوبوونی هەموان ئاراستەی ئامادەبووان بکەی.

## ٧٤-بیست بنەما بۆ سەرخستنی کۆبونەوەکان:

((تۆ لەبەرئەوەی سەرکردەی دەستەکەتی، بۆیە تۆ بەرپرسی لە ئافراندنی ئەو ژینگەیەی کە تاوتوێکاریەکان دەکەن بە پێشنیار و بڕیاری باشتر))

**کلیدوبراسۆن**



ئێمە ئێستا لەو هۆکارانە تێگەیشتن کە خەڵکی لەپێناویدا کۆدەبنەوە و ئەو فاکتەرانەشمان زانی کە دەبنەهۆی شکست هێنانی ئەو کۆبونەوانە، هەروەها ئەو هەڵانەشمان خستەڕوو کەلەکاتی بەستنی کۆبونەوەدا پێویستە لێی بەدووربین، ئێستایش کاتی ئەوە هاتووە گرنگترین بنەماکانی سەرخستنی کۆبونەوەکانت بۆ بخەمەڕوو، ئەوانیش:

### ١-ئامادەبە:

هەوڵی داڕشتنەوەی خشتەی کارێك بدە کە هەموو ئەو بابەتانەی تێدابێت کە دەتەوێت باسی لێوە بکەیت، هەروەها کات و ڕۆژ و شوێنی لێ قسەکردنیش بنوسەرەوە، جا تایبەت بێت بە کاری کۆبونەوەکە یاخود نا.

### ٢-پێشتر خشتەی کارەکان بەدابڕێژراوی دابەش بکە:

بەلای کەمەوە پێویستە هەر کەسێك سێ ڕۆژ بەر لە کۆبونەوەکە خشتەی کارەکانی کۆبونەوەکەی پێبدرێت، بەمەش هەلی بەشداری کردن و هەوڵدان بۆ خۆئامادەکردن بەوانی تریش دەدەی، لەگەڵ ڕێکخستنی کاتی کار و مەوئیدەکانی دیکەیان.

## 3-تەنها کەسە گرنگ و سەرەکیەکان بانگێشت بکە:

توێژینەوەکان سەلماندوویانە سەرکەوتووترین و باشترین کۆبونەوەکان ئەو کۆبونەوانەن کە ئامادەبوانی لەنێوان شەش بۆ هەشت کەسن، بۆیە وریابە و دەبێت کەسانی مەبەست و گرنگ داوەت بکەیت.

## ٤-هەمووان ئامادەبکە:

بەر لە بەستنی کۆبونەوەکە دڵنیابەرەوە لەوەی هەموو ئەندامەکانت ئاشنای کۆبونەوەکەن و دەبێت بزانن چی ڕوودەدات و دەوترێت و ئەوانیش دەبێت چی بکەن. گەر یەکێکیان ڕاپۆرتێکی هەیە یاخود ڤیدیۆیەکی هەیە بۆ پێشکەش کردن پێویستە بەباشی ئامادەی بێت، بەم شێوەیە زامنی بەباش تەواوبوونی کۆبونەوەکە دەکرێت و خۆت لە شتی لەناکاو بەدوور دەگریت و توشی هەڵچوونیش نابیتەوە.

## ٥-پێشتر دەست بەسەر کێشەکاندا بگرە:

بەر لە بەستنی کۆبونەوەکان لە نەبوون یان خامۆشبوونی کێشەی نێوان ئەندامانی کۆبوونەوە دڵنیابەرەوە، بەم کارەش خۆت لەکاردانەی نەرێنی لەکاتی کۆبونەوەکەدا بەدوور دەگریت.

## ٦-بەرلە کاتی دیاریکراو ئامادەبە:

ئامادەبوونت بە کاتێکی باش بەر لەدەستکردن بە کۆبونەوەکە هەلی ئەوەت پێدەدات کە بەباشی بە بابەتەکاندا بچیتەوە، بە شوێن و کەرەستەکانیشتدا بچۆرەوە. هەروەها ئامادەبوونی پێش وەختت لە ڕووداوی لەناکاوی نەخوازراو بەدووت دەخاتەوە و متمانە وڕێزیشت لای ئامادەبوانت پتر دەبێت.

### ٧-گرنگی بە ڕێکخستن بدە:

داوا لەیەکێك لە ئامادەبووان بکە، بۆ نمونە کار ڕەوانکارەکەت کە ئاگای لەکات بێت و کەسێکی تریش بیرۆکەکان بنوسێتەوە بە خاڵی کورت، بەم شێوەیە لەکاتێکی دیاریکراودا ڕێگە بەوانی تر دەدەی بەشداری کۆبونەوەکە بن و گیانی یەك دەستەیی لەنێو کارمەندانتدا برەو پێ دەدەی.

### ٨-ئامانجتیان بۆ ڕوونبکەرەوە:

کاتێك کۆبونەوەکە ڕێك دەخرێت ئامانجی پشت بەستنی ئەم کۆبونەوەیە بۆ ئامادەبوان ڕوونبکەرەوە. ڕاستە دەستەکەت ئاشنای خشتەی کارەکان و ئامانجی پشت بەستنی ئەم کۆبونەوەیەتن، بەلآم گرنگە جارێکی تر ئامانجەکەتیان بۆ ڕوونبکەیتەوە و بەبیریان بهێنیتەوە، بۆنمونە دەڵێیت:" ئێمە ئەمڕۆ کۆدەبینە بۆ دۆزینەوەی باشترین چارەسەر بۆ نەهێشتنی گازەندی کڕیاران"، یاخود:" دەمانەوێت ١٠٪ ڕێژەی فرۆشمان بەرزبکەینەوە"، گرنگ نییە ئەمڕۆ چیت ئامانجە گرنگ ئەوەیە بەر لە دەستکردن بە کۆبنەوە ئامانجەکانت بۆ هەموان ڕوونبێت و ڕوونبکرێتەوە.

### ٩-بنچینەیەکی بەهێز دابڕێژە:

هەولبدە کۆمەڵێك ڕێسا بخەیتە پێش دەستی هەموو ئامادەبووان، وەکو:

أ- ڕێز لە بۆچوونی ئەوانی تر بگرە.

ب- ڕێز لە هەستی ئەوانی تر بگرە.

ت- هەلی قسەکردن بەوانی تریش بدە.

دانانی ئەم جۆرە بنەما و ڕێسایانە هەمووان متمانەپێکراوتر دەکات و باشتر لەیەکدی تێدەگەن و لەقسەی لابەلا ناترسێن.

## 10-کاتی کۆبوونەوە دیاریبکە:

گرنگ ئەوەیە کاتی دەست پێکردن و کۆتایی هاتنی کۆبونەوە دیاریبکەی، کاتی حەسانەوەیش دەست نیشان بکە. لەبیرت بێت کاتێك تۆ رێز لەکاتی دیاریکراوی خشتەی کارەکەت دەگریت رێزت لای هەمووان باشتر دەبێت و گەر کاتی زۆرترت پێویست بوو لە ئامادەبووان بپرسە گەر قایل نەبوون پێت ناخۆش نەبێت و قسەکانت بۆ جاری داهاتوو هەڵبگرە.

## ١١-لەکاتی کۆبونەوەکەدا کاتێك بۆ حەسانەوە دیاریبکە:

ناتوانی هەمووان ناچاربکەی بۆماوەیەکی زۆر گوێ بۆیەك کەس بگرن بەبێ حەسانەوە، بۆیە بوونی کاتی پشوو یان حەسانەوە و خواردنەوەی شەروەتێك یان پەرداخێك ئاو یاخود رۆیشتن بۆسەر ئاو و جگەرەکێشان هەلێکی باش دەدات بۆ نوێ بوونەوەی توانای وەرگرتنی زانیاری لای ئامادەبووان و باشتر پەیوەستبوون بە کۆبونەوەکەوە.

## ١٢-ژینگەیەکی ئارام بئافرێنە:

رێگە بەهەمووان بدە کە بەبێ ترس لە سزا بە رێزەوە بۆچونەکانیان دەربڕن.

## ١٣-راوێژ بەئەوانی تر بکە:

هەوڵبدە هەمووان بەکاراییەوە بەشدار پێبکەی، بۆچوون و رایان وەربگرە و پرسیاری کراوەیان ئاراستە بکە و هانی قسەکردنیان بدە.

## 14-گوێ بۆ گرنگیدانەکان بگرە:

باشترین رێگە بۆ دروستکردنی هۆگری گوێگرتنە لەوانی تر، وەهایان پیشان بدە وەك ئەوەی تۆ بەباشی گوێیان لێ دەگری و گرنگییان پێ دەدەی، هانیان بدە بۆ قسەکردن و پرسیاریان لێبکە و هانیان بدە بۆئەوەی هەست بە گرنگی دانی تۆ بەخۆیان بکەن.

### ١٥–هێمن و لەسەرخۆبە:

گرنگی بەوە مەدە لە کۆبونەوەکەدا چی ڕوویدا و لەلایەن چەند کەسێکەوە چی گوترا، گرنگ ئەوەیە بەسەر سۆزەکاندا زاڵبیت و ئەوانی تر لەتۆ گەیشتبن، بۆیە کارێکی ئاساییە لەپێناو بەرژەوەندی دامەزراوەکەدا لەگەڵ تۆدا ناکۆکبن یاخود هاوبۆچون نەبن.

### ١٦–لەخشتەی کارەکان دەرمەچۆ:

گەر ڕوویدا لەناکاو باسی بابەتێکت کرد لەدەرەوەی بابەتە سەرەکیەکە ئەوا بەخێرایی بگەڕێوە بۆسەر ڕێڕەوی تایبەتی خۆت، هەروەها گەر کەسێکی تر لە بابەتە دەرچوو بە قسەی جوان و خۆش ئاراستەی بابەتە سەرەکیەکەی بکەرەوە. هەوڵبدە لەخشتەی کارەکە دەرنەچیت و مەچۆرە سەرباسکردنی خاڵێکی نویتر تاوەکو خاڵەکەی پێشووتر بەباشی نەگەیەنیت و ئامانجەکەتی پێ نەپێکیت.

### ١٧–دان بەهەڵەکەتدا بنێ و دواتر لەسەرکارکردنت بەردەوامبە:

تۆ مرۆڤیت و هەڵەکردنیش شتێکی هەبووە، گەر هەڵەت کرد دانی پێدا بنێ و خۆت تێك مەدە و دواتر بگەڕێرەوە بۆ قسەکردنی دروست و بزانە تەواوی و بێ خەوشی تەنها لای خوایە و بۆ خوایە.

### 18–گیانی پابەندی لەناخی هەمواندا بچێنە:

کۆبونەوەکە گرنگ نابێت گەر هەموو ئامادەبووان هاوبۆچونت بن، بەڵام گرنگ ئەوەیە تێگەیشتنێك لەنێوانتاندا هەبێت بۆئەوەی پشتیوانی ئەوانیش بەردەست بخەیت، یاخود تەنانەت یارمەتیان بدەی بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێك شت.. بیرۆکەکە ئەوەیە یارمەتی و پشتیوانی ئەوانی بەدەست بێنی گەر پێویست بوو بۆ پێشکەوتن.

**١٩-خشتەی کاری داهاتوت دابڕێژە:**

بەر لە تەواوبوونی کۆبونەوەکە دڵنیابەرەوە لە پوختکردنەوەی گرنگترین مەبەست و بڕیارە سەرەکییەکان و ئەو بۆچونانەی پێی گەیشتوی، ئەوجا نەخشەی کاری داهاتوو دابڕێژەوە و بەرپرسیارێتیەکان دیاریبکە و داوا لە خۆبەخشەکانیش بکە ئەنجامی بدەن و بەجێبەجێ کردنی هەندێ ئامانجی دیاریکراو دەتوانیت کۆبونەوەکە تەواوبکەیت بەتایبەت کاتێك زانیت نەخشەکەت چوەتە بواری جێبەجێ کردنەوە و ئامانجی پشت کۆبونەوەکە بەدیهاتووە.

**٢٠-پێویستە بەدواداچوون بکەیت:**

گەر شتێکی گرنگ هەبێت لە بەڕێوەبردندا هاوتای نەخشەدارشتن بێت ئەوا بەدواداچوونە. دڵنیابە لەوەی کە تۆ بەپێی نەخشە و پلانەکە بەدواداچوون بۆ کارەکەت دەکەیت بۆ زامنکردنی سەرکەوتنی خۆت و سەرکەوتنی کۆبونەوەکەشت. پاشی ٢٤ کاتژمێر گرنگی بە دابەشکردنی ڕوونکردنەوە و ئەنجامدراوەکانبدە، هەروەها دەتوانی لەهەموو جێگەیەکی دانێێ و هەلی خوێندنەوەی بۆ هەمووان برەخسێنی .

کاتێك بیست بنەماکە پێڕەو دەکەیت خۆیشت سەیرت لەئەنجامی کۆبونەوەکانت دێت! دەبینی بەهێز و ژیر و کاراتریت وەك لەجارانت، کات و پارەی زۆریشت لە بەفیڕۆدان بۆ دەگەڕێتەوە، هەروەها ئەوانەی لە دەوروپشتی تۆن ڕێزی زیادترت لێدەگرن و بەچاوی سەرکردەوە لێت دەڕوانن.

## ٧٥-خشتەی کار.. چییە؟

((خشتەی کار وەکو نەخشە وایە، دەتگەیەنێت بە ئامانجی خوازراو بە کورتترین و ئارامترین ڕێگەش))

**د.ئیبراهیم فەقی**



خشتەی کار یەکێکە لەگرنگترین ئەو ئامرازانەی بەڕێوەبەر دەتوانێت بۆ باش بەڕێوەچوونی کۆبونەوەکانی سودی لێ وەربگرێت. خشتەی کار کات و پارەی زۆرت بۆ دەگێڕێتەوە، کارمەندانت هۆشیارتر دەکات بەرامبەر کۆبونەوە و کارەکان، کە ئەمەیش هانت دەدات بۆئەوەی بەچڕی تیشک بخەیتەسەر بابەتەکانی کۆبونەوەکە، بزانە ڕۆیشتن بۆ هەر کۆبونەوەیەك بەبێ خشتەی کاری ڕێکخراوی باش ئامادەکراو باشترین و خێراترین ڕێگەیە بۆ شکست" چون بەبێ بوونی خشتەی کار بەئاسانی لە بابەت گەلێك دەدەیت هیچ پەیوەندییەکیان بە بابەتی بنچینەییەوە نییە و بەهۆیەوە کاتێکی زۆر بەفیڕۆ دەدەیت و ئەوانی تریش پەرێشان و بێزاریش دەکەیت. بۆ نەگبەتی زۆرێك لە بەڕێوەبەران بەبێ داڕشتنەوەی خشتەی کار کۆبونەوەکانیان ڕێك دەخەن و سەیریشیان لەسەر نەکەوتنی کۆبونەوەکانیان دێت! لێرەدا پێویستە بەر لە بەستنی هەر کۆبونەوەیەك دڵنیابیتەوە کە کۆبونەوە پێویست و گرنگە، ئەوجا ئامانجی کۆبونەوەکەت بنوسیتەوە و ئەو بابەتانەیشی دەتەوێت تاوتوێی بکەیت لەکاتی کۆبونەوەکەدا و ئەو ئەنجامەیش دیاریبکەی کە دەتەوێت پێی بگەیت. پاشی ئەمە پێویستت بە تۆمارکردنی ناوی هەموو ئەو کەسانەیە کە پێویست دەکات بێنە کۆبونەوەکەوە و کاتی کۆبوونەوە و شوێنەکەیشی دیاریبکە. داوا لە کاربەوانارت بکە لەم خشتەی کارەت چەند دانەیەك بۆ لەبەربگرێتەوە و بیهەنێرێت بۆ کەسانی داوەت یان بانگێشت کراو و باشتر وەهایە ئەمەیش بە سێ ڕۆژ بەر لەدەستپێکردنی کۆبونەوەکە بێت. تۆ بەم کارەت یارمەتییان دەدەیت بۆ باشتر خۆ ئامادەکردن.

لێرەدا نمونەی چۆنێتی دروستکردنی خستەی کارت بۆ بەردەست دەخەم:

نمونەی خشتەی کار

**خشتەی کاری کۆبوونەوەی فرۆشەکان**

ڕۆژ و بەروار: پێنج شەممە ١٤ ی مارسی ٢٠١٤ .

شوێن: هۆڵی کۆبونەوەکان.

کاتی دیاریکراو: ٧٥ خولەك .

لە : ٣ ی پاش نیوەڕۆ تاوەکو ٤:١٥ خولەکی پاش نیوەڕۆ.

ئامانجی کۆبونەوەکە: زیادکرنی بڕی فرۆشەکان بەرێژەی ١٠٪ .

**بابەتی تاوتوێکردن ( بابەتی کۆبوونەوەکە)**

| | | |
|---|---|---|
| ١- | پێداچوونەوە بە ڕوونکاریەکانی کۆبونەوەکەی پێشووتر | ١٠ خولەك . |
| ٢- | خەلآتکردنی بەڕێز جۆن بەهۆی کارەباشەکانیەوە | ٥ خولەك. |
| ٣- | بەڕێز ڕۆلین دەست بە پێش گوفتاری کۆبونەوەکە دەکات | ٥ خولەك. |
| ٤- | بەڕێز دوسن ڕاپۆرتێك پێشکەش دەکات | ١٠ خولەك . |
| ٥- | تاوتوێی بۆچوونەکان | ١٥ خولەك . |
| ٦- | بڕیارەکان | ١٠ خولەك. |
| ٧- | نەخشەی کار | ١٠ خولەك. |
| ٨- | کۆتایی کۆبونەوەکە | ١٠ خولەك . |
| | تێکڕای کات | ٧٥ خولەك . |

**سوپاس**

پێویستە ئەم خشتەی کارە وەکو داوەتنامەی فەرمی بۆ هەموو ئامادەبوان بهـەنێریت.

دڵنیابە لە باشی بەکارهێنانی ڕێگە و مەزنی دەستکەوتنی سەرکەوتنی کۆبونەوەکانت.

## ٧٦-شەش کلیل بۆ بەستنی کۆبونەوەی کارا و بەهێز:

(( کۆبونەوەی مەزن و بەرهەم بەخش تەنها نابەسترێن، بەڵکو بەباشی ڕێکخراوە و گرنگی پێدراوە))

**نهێنیەکانی سەرکەوتنی بەڕێوەبەر**



پاش چەندین ساڵ لە ئەزمون کە دەکاتە بیست و پێنج ساڵ، لە ڕێگەی توێژینەوەی پتر لە هەزارکتێب و پارچەڤیدیۆ و کۆبونەوەکردن بە سەدان بەڕێوەبەر و قسەکردنی جۆراو جۆر لەگەڵیاندا، گەیشتینە شەش کلیلە چارەسەری وەها کە کۆبونەوەکانت بەسود و بەچێژ و بەرهەمدار دەکەن.

### ١-بەدواداچوونکردن بۆ پێشنیارەکانی کۆبونەوەی ڕابردوو:

پێویستە بە بەدواداچوونکردنێکی گشتگیرانەی کۆبونەوەکانی ڕابردوو دەست بە کۆبونەوەکە بکەیت: ئەو شتانەی لە کۆبونەوەکەی پێشووتردا سەرکەوتن یان شکستیشی هێناوە، ئەمانە بخەرە نێو نەخشەی کاری داهاتووتەوە.

### ٢-ڕێز و خەڵات:

هانی کارمەندانت بدە، ئەوەیان یادبخەرەوە کە ئەمان تایبەتمەندن لەکارەکانیان، هەروەها پێویستە بە ڕوونی خەڵاتی کەسانی بەهێز و کارجوان بکەی و هەمووانیش هان بدە بۆ ئەوەی پیرۆزبایی لە هاوڕێکەیان بکەن و هانی ئەمانیش بدە بۆ جوان یان خاسکاری" بۆئەوەی لەداهاتوودا ئەمانیش خەڵات بکرێن.

### ٣–میوانێکی جوانبێژ داوەتی کۆبونەوەکە بکە:

ڕەنگە ئەم میوانە کەسێکی قسەکاری ڕەوانبێژی بەناوبانگ بێت، یاخود سەرۆکی کۆمپانیاکە، یاخود کارمەندێکی زۆر لێهاتووت بێت" بۆئەوەی کارمەندەکانت فێری چۆنێتی قایلکردنی میوان و کڕیاران بن و گلەیی و کێشەکانیان نەهێڵێت. بێگومان بیرۆکەی گوتاربێژی بەناوبانگ و سەرکەوتنی هانی کارمەندانت دەدات بەباشترین شێوە خۆیان ئامادەی کۆبنەوەکە بکەن.

### ٤–ڤیدیۆیەك پیشانی ئامادەبوان بدە:

ڤیدیۆیەك لەبارەی گەشەپێدانی کەسێتی یاخود لەبارەی هاندانەوە ئامادە و پێشکەش بکە" بۆئەوەی چێژ بە کۆبونەوەکە ببەخشیت و سود لەم کاتە وەربگریت و بەرهەمداری بکەیت، هەروەها دەتوانی ڤیدیۆی هاندان و خزمەتی کڕیاران یاخود هەرشتێکی تری لەم جۆرە پێشکەشی ئامادەبووان بکەی. دەبێت سوود لەم چەشنە ڕێنماییە وەربگریت و بیکەیت بە بنەمایەك بۆ سەرکەوتنی کۆبونەوەکانت.

### ٥–خوو بەقسەکردنەوە مەگرە:

خۆ مەرج نییە لەسەرتۆ کە هەر قسەبکەیت و دەمت دانەخەیت، دەبێت ئەم بەرپرسیارێتییە دابەشی بکەی" بۆئەوەی هەلی سەرکردایەتی کردنی کۆبونەوەکە بەوانی تریش ببەخشیت، بەم ڕێگەیەش پارمەتییان دەدەی بۆ دیارخستنی توانایی و بەهرە کارگێڕیەکانیان و زیادکردنی متمانە بەخۆکردن.

### ٦–ناوی هەموانت لەبیربێت:

کاتێك لەگەڵ ئەوانی تردا قسەدەکەیت بەناوی خۆیانەوە بانگیان بکە، بێگومانبە لەوەی ئەمە کاریگەری گەورەی لەسەر دەرونیان دەبێت و گرنگی پێدانی تۆ لەپێش چاو دەگرن و واهەست دەکەن تۆ بەڕاستی گرنگییان پێ دەدەی.

## ٧٧-کەی کۆبونەوە دەبەستیت؟

((سێ شت هەن لەژیاندا بتوانی پێشبینییان بکەی: باج، مردن، کۆبوونەوەی زۆر)).
**مایک مۆر**



کات و شوێنی هەڵبژێردراوی کۆبونەوەکەت کاریگەری گەورەیان دەبێت لەسەر ئەنجامی کۆبونەوەکەت، جا بەسەرکەوتن بێت یاخود شکست. ئێستایش باوەکو بزانین کەی پێویستت بە بەستنی کۆبونەوەیە:

### ١-کۆبونەوەی قاوەڵتی:

لەکاتی قاوەڵتی بەیانیدا دەتوانی کارمەندانت کۆبکەیتەوە. گەر بەڕێوەبەرەکە کارابێت ئەم جۆرە کۆبونەوانە بەرهەمدار و گرنگە و تاکۆتایی ڕۆژەکە کاریگەری لەسەر ئامادەبوانی کۆبوونەوە دەبێت و تەنانەت هەندێك جاریش تاوەکو یەك هەفتە کاریگەری لەسەری دەمێنێت.

### ٢-کۆبونەوەی کارەکانی ڕۆژانە:

بەڕێوەبەر دەتوانێت بەیانیان کاتژمێر ٩ کۆبونەوە بەکارمەندانی بکات بەمەبەستی زامنکردنی بەباشی و گونجاوی بەڕێوەچونی کارەکان، ئەم کۆبونەوەیە بەزۆری تێناپەڕێت لە پازدە خولەك و پێویستی بە بەڕێوەبەرێکی بەهێز و هاندەری کارمەندانە. زۆرێك لە کۆمپانیاکان ئەم کۆبونەوانە بە پێویست دەزانن. کۆبنەوەی کردارەکانی ڕۆژانە، هەموو ڕۆژێك زۆرێك لە کارمەندانی کۆمپانیا و دامەزراوە جۆراوجۆرەکان لە

ناوەندی خۆیـان لـەكاتی دیـاریكراودا كـۆ دەكرێنـەوە. لایـەنی خراپـی ئـەم كۆبونەوەیـە ئەوەیە كە بە ناپێویست و ڕۆتین بكرێت، بۆیە لـەم كاتـەدا زۆرێك لەكارمەنـدان ئامـادەی كۆبونەوەكە نابن.

### ٣-كۆبونەوەی بەیانیان:

ڕەنگــە بەڕێوەبــەر بڕیــاری بەســتنی كۆبنەوەیــەك بــدات لــە كاتــژمێر ٩ بــۆ ١٠ ی سەرلەبەیانی یاخود لـە ١٠ بـۆ ١١ ی سـەرلەبەیانی، ئـەم جـۆرە كۆبونەوانـە بـەزۆری بـۆ بڕیاردانی بەكۆمەڵە،هەرچەندە هەندێك لەكاتی كارمەنـدان دەكوژێـت، بـەڵام بەسـودە بـۆ زیادكردنی فرۆش و باشتركردنی ڕاژە.

### ٤-كۆبونەوەی نانی نیوەڕۆ:

لەكاتی نانی نیوەڕۆدا بەڕێوەبەر دەتوانێت كۆبونەوەیەك ڕێك بخات، ئـەم كۆبونەوەیـە بــەزۆری لەیــەك كاتــژمێر زیــاترە و دەگاتــە دوو كاتــژمێر، ئــەم جــۆرە كۆبونەوانــە سەركەوتووە" چونكە كارمەندەكان خۆیان بـۆ نـان خـواردن ڕوو لەجێگەیـەكی دیـاریكراو دەكەن، هەروەها پاشـی نـان خـواردن ئاسـتی وزەیـان نـزم دەبێتـەوە كـە پێویسـتی بـە هاندان و دووبارە وروژاندنە بۆ باش كاركردن و چنگ خستنی ئەنجامی خوازراو.

### ٥-كۆبونەوەی پاش نیوەڕۆ:

ئەم كۆبونەوانە بەزۆری كاتژمێر ٣ ی پاش نیـوەڕۆ بـۆ ٤ ئـەنجام دەدرێـت. زۆرێـك لـە كۆمپانیاكـان ڕۆژێكـی تایبـەتیان بـۆ ئـەم جـۆرە كۆبونەوەیـە دیـاریكردووە و ڕەنگـە دووشەممان یاخود هەموو دووڕۆژ جارێك بێت و هەلی پێشـتر زانینـی كـاتی كۆبونـەوە بـە كارمەنـدان دەدرێـت، ئـەم جـۆرە كۆبونەوانـە بەكەڵكـە بـۆ باشـتركردنی دۆخـی ڕاژەی

کارمەنــدان، چــارەکردنی گازەنــدە و ســکالآکان، باشــترکردنی بەرهــەم و زیــادبوونی فرۆشەکان..هتد.

### ٦-کۆبونەوەی درەنگان:

بەڕێوەبەر داوا لەکارمەندانی دەکات کاتـژمێر ٥ ی سـەر لـەئێوارێ بـێن بـۆ کۆبونـەوە، ئـەم کۆبونەوەیـە لـە ١ کاتـژمێر زیـادتر ناخایـەنێت، لـەم کاتـەدا خەڵکـەکان کـەمترین هاندانیان ماوەتەوە و ڕۆژێکی زۆر سەختیان بەڕێکردووە، حەزیان لە گەڕانەوەیـە بۆمـاڵ، بۆیە ئەم جۆرە کۆبونەوانە کەمترین شەڕەقسە و جیاوازی بۆچوونی تێدا دیاردەکـەوێت و زووترین بڕیاری تێدا دەدرێت و هەمووان بەئاسانی بەبڕیارەکان قایل دەبن" چونکە گرنگ ئەوەیە کە زوو لەم کۆبونەوەیە ببنەوە و بڕۆنە ماڵەوە.

### ٧-کۆبونەوەی بەپەلە:

کاتێـک گرەوەئاسـتەنگێك توشـی بەڕێوەبـەر و کاروبـاری کۆمپانیـا و دامەزراوەکـە دەبێتەوە بەڕێوەبەر داوای کۆبونەوەی بەپەلەدەکات، لەم کاتەدا پێویسـتە زۆر بـە وردی و ژیرانەوە کار و قسەکانی بخاتەڕوو. لەبەرئـەوەی ئـەم کۆبونەوانـە بەپلـەن بۆیـە باشـتر وەهایە بەڕێوەبەر ئاگاداری هەموو کارمەندانی خوازراوی بکات کە بـۆ کۆبونـەوە بانگیـان دەکات و کاتی ئەم کۆبونەوانە پێشتر دیارینـەکراون  و کـەی ویسـترا دەتوانرێـت ئـەنجام بدرێت. بۆ چارە ڕەشی زۆرێك لـە بەڕێوەبـەرەکان هـەواڵ و پـێش هاتـە نوێیـەکان تـەنها بۆخۆیان هەڵدەگرن و بـە کارمەنـدانی ڕاناگەیـەنن، زۆرێکـی تریشـیان بـەبێ ئامادەکـاری دەڕواتە کۆبونەوەکەوە، ئەمەش هەموان توشی شۆك دەکات و لەبری قازانج زیان بەخۆی و دامەزراوەکەیشـی دەگەیـەنێت و قـازانجی ئـەم جـۆرە کۆبونەوانـە بـەزۆری کـەمترە لـە زیانەکانی.

## ٨-ئاهەنگی هاندان:

بەڕێوەبەر ئەم جۆرە كۆبونەوانە ئەنجام دەدات بۆئەوەی كارمەندێكی لێهاتوو یان پێشكەوتوو خەڵات بكات، ئەم جۆرە كۆبونەوانە كورتن و مەبەست لێی هاندانی ئەوانی تریشە بۆ باشتر كاركردن، لەم كۆبونەوانەدا دەتوانرێت شەروەت یان قاوەیەك پێشكەش بكرێت و ئاهەنگی كورت و خۆش بەبۆنەی ئەم خەڵاتكردنەوە بگێڕدرێت.

## ٩-كۆبوونەوەی بابردنی هزری:

بەڕێوەبەر ئەم جۆرە كۆبونەوانە دەبەستێت بۆ تاوتوێكردنی بیرۆكەیەك یاخود دانی بڕیارێك، ئەم كۆبونەوەیە لە هەرجێگە و كاتێك بێت دەتوانرێت ببەسترێت. گرنگ نییە لەكوێیە ڕەنگە لە نوسینگەی بەڕێوەبەرەكەش ببەسترێت. ئەم كۆبونەوانە كورت مەودان و بەزۆری پتر لە پازدە خولەك ناخایەنن. ئەم كۆبونەوانە ڕێگەیەكی ناوازەیە بۆ پونیاتنانی دەستەی كار بە بەئامانجی چاندنی متمانە بەخۆكردن.

## ١٠-كۆبونەوەی مانگانە:

بەزۆری ئەم جۆرە كۆبونەوانە هەموو سەری مانگێك ئەنجام دەدرێت بۆ تاوتوێكردنی قازانج و چۆنێتی كارەكان وبەراوردكردنی بەدۆخی دارایی ڕاستەقینە. بەشێوەیەكی گشتی بەڕێوەبەرەكە داوا لە چاودێری دارایی دەكات ڕوونكردنەوەیەك لەبارەی هەژمارەكانەوە بخاتەڕوو بە بەراوردكارییەوە. زۆرێك لە دامەزراوەكان لەبەرگیراوەی ئەم جۆرە كۆبونەوانە پێش وەخت پێشكەشی ئامادەبوان دەكەن، دواتر داوا لە بەڕێوەبەر دەكرێت قسەی خۆی بكات، ئینجا پێشنیارەكان دەخرێنەڕوو و نەخشەی كاری مانگی داهاتوو دادەنرێت. ئەم جۆرە كۆبونەوانە یان زۆر هاندەرە یاخود ڕوخێنەرە! پشت بەستە بە قازانج و زیانەكان و ڕەفتارەكانی بەڕێوەبەر. زۆرێك لە بەڕێوەبەران ئەم هەلە دەقۆزنەوە بۆ پتر هاندانی كارمەندانیان، لەكاتێكدا هەندێك بەڕێوەبەری تر قسەی

ناخۆش و بێزارکار بە کارمەندانی دەڵێتەوە و دواتر هەڕەشەی دەکردنیان دەکات. لێرەوە پێویستە زۆر وریای ئەم جۆرە کۆبونەوە مانگانەیە بیت و کاربکەیت بۆ نەهێشتنی خەوشییەکان بەرێگەی تەندروست و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتیەکان و داڕشتنەوەی نەخشەیەکی باشتر و بەهێز بۆ زیادکردنی قازانج و داهات و سەرزەنەشت نەکردنی ئەوانی تر.

•

## ١١-کۆبونەوەی وەرزانە و نیوەی ساڵانە و ساڵانە:

ئەم کۆبونەوانە تارادەیەکی زۆر لە کۆبونەوە مانگانەییەکان دەچێت، تەنها جیاوازیەکەی ئەوەیە ژمارەی ئامادەبوان زۆرن، هەندێك لە بەڕێوەبەرانی جێبەکاریش ئامادەی دەبن بۆ خستنەڕووی هەندێك گۆڕانکاری کرۆکی.

## ١٢-کۆبونەوەی گەورەی ساڵانە:

ئەم جۆرە کۆبونەوانە هەمیشە ساڵانە دەبەسترێت و شێوەیەکی کلاسیکی تایبەتی هەیە. لەم کۆبونەوەیەدا سەرۆك کۆمپانیا و جێبەجێکار و کارگێڕییە ناوەندیەکان و چاودێرەکان و خودی کارمەندانیش تێدا بەشدار دەبن.

بەزۆری ئەم جۆرە کۆبونەوانە لە شوێنی نایاب و خۆشدا ئەنجام دەدرێت و کەسانی بەناوبانگ و زۆر زیر بانگێشت دەکرێن و زۆرجاریش برگەی بۆخۆشیشی تێدایە. لەم جۆرە کۆبونەوانەدا خەرجییە گەورەکانی وەکو ئامادەکاری و تێچونەکانی گەشت و خۆراك و خواردنەوەکانیش تاوتوێ دەکرێت، بۆیە پێویستی بە ئامادکردنێکی زۆر باشی پێشوەختەیە. گەر کۆبونەوەیەکی وەها گەورە ئەنجام دەدەیت ئەوا بەلای کەمەوە شەش مانگ بەرلە ئەنجامدانی دەست بەخۆ ئامادەکردن بکە و بەلای کەمەوە سێ جێگەی گونجاو هەڵبژێرە و داوا لە کارمەندانت بکە بەکۆڕا باشترینیان هەڵبژێرن و لیستی گرنگترین وردەکاریەکان بنوسەرەوە، لەبیرت بێت ئەو ئوتێل یان هۆڵەی هەڵی دەبژێریت

پێویستە کارمەندانی پێشینەی میوانداریکردنی ئەم جۆرە کۆبونەوانەیان هەبێت و هەمووشتێکی تایبەت بەم کۆبونەوەیان لەلادا بەردەست بێت. بۆئەمەش برۆ بۆ ئوتێلەکە خۆت چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێوەبەری ئوتێل یان هۆڵە دیاریکراوەکە و بەڕێوەبەرانی بەشی خۆراك و ژوور و مێزەکان بکە و هەڵیان بسەنگێنە.

هەروەها باشتر وەهایە کەسێکی بەتوانای ڕێکخاری کۆبونەوەکان دیاریبکەی بۆ یارمەتی دانت لە ڕێکخستنی کارەکان و بەدووربوون لەهەر دۆخێکی لەناکاو ڕوودراوی نەخوازراو. توێژینەوەی بڕی خەرجیەکان بکە لەگەڵ ١٠٪ ی زیاوەیش بۆ کاتی لەناکاو. زیادتر لەیەك جۆر قسەکار بدۆزەرەوە بۆئەوەی خۆیشت نەختێك بحەسێیتەوە. ئەوجا پێویستە بزانی بۆچی ئەم کۆبونەوەیە ڕێك دەخەیت و ئەم هەلە بەباشی بقۆزیتەوە.

## ٧٨-کۆبونەوەکانت لەکوێ دەبەستیت؟

((دووبارەکردنەوەی بڕیاری هەڵە بەڕۆژانە دەبێتەهۆی شکست هێنانت))

**جیم ڕۆن**



ئیستایش باوەکو تیشک بخەینەسەر ئەو شوێنانەی دەگونجێت بۆ ئەنجامدانی کۆبوونەوە:

**١-کۆبونەوە لە شوێنکار:**

**(أ)نوسینگەی بەڕێوەبەر:** ڕەنگە بەڕێوەبەر بانگی چەند کارمەندێکی بکات بۆ کۆبونەوەی تایبەتی لە نوسینگەکەی خۆی ، باشی ئەم کۆبونەوەیە ئەوەیە تێچوونی نییە، بەلام خەوشیەکەی زۆر پچڕاندنە بەهۆی پەیوەندییە تەلەفۆنیەکانەوە، سەرباری ئەوەی زۆر کارمەند هەست بە ئاسودەیی ناکەن لە نوسینگەی بەڕێوەبەر.

**(ب)هۆلی کۆبونەوەکان:** زۆرێك لە کۆمپانیاکان خاوەنی هۆڵێکی تایبەتین بۆ کۆبوونوە و لەخۆگرتنی مێزێکی گەورە و هەموو ئامێری دەنگی و بینایی. ئەم هۆلی کۆبونەوانە زۆر بەسودن چونکە کات و پارەی زۆر بۆ دامەزراوەکە دەگێڕێتەوە و بەخێرایی دەتوانی کۆبونەوەی تێدا ئامادەبکەی. بەلام کێشەی ئەم هۆڵە پچڕاندنەکانە، بەتایبەت لەو کاتەی هەموان پشوویەك وەردەگرن زۆرینە دەگەڕێنەوە بۆ جێگەکەی خۆیان و سەیری ئەو نامانە دەکەن کەبۆیان هاتووە و پێداچونەوە بەچۆنێتی ئەنجامدانی کارەکانیان دەکەن، زۆرجاریش درەنگ دەگەڕێنەوە نێو هۆلی کۆبونەوەکە چونکە کەدەڕۆنە دەرەوە بۆ پشوو وەرگرتن زۆر سەرقاڵ دەبن. بەشێوەیەکی گشتی، کۆبونەوە لەنێو شوێنی کاردا باشترە، وەك گوتم کات و پارەی زۆر دەگێڕێتەوەو جا کۆبونەوە هەرچۆن و کەی و بۆچییەکیش بێتو بەلام باشتریش وەهایە کە هۆلی کۆبونەوەکان لە

هـەر دامـەزراوە و كۆمپانيايەكـدا لەجێگەيـەكى نێزيـك نـەبێت لەشـوێنى ئيشـكردنى كارمەندەكانەوە و ژاوەژاوى نەياتەوەسەر.

### ٢–كۆبونەوە لەدەرەوەى ناوچەى كار:

ئەم كۆبونەوانە دەتوانرێ لە ميوانخانەيەك يان چێشتخانەيەك ياخود ناوەندێكى كۆڕيى يـان هـۆڵێكى تايبـەتى ئـەنجام بـدرێ، يـاخود هـەر جێگەيـەكى تـر كـە لەگـەڵ بۆچـوونى بەڕێوەبەر و دەستەى كاردا گونجاوبێـت، ئـەم شـوێنى كۆبونەوانـە تێچـونيان زۆرە بـەلاَم ڕێگەيەكى باشيش دەبێت بۆ بەديهێنانى گۆڕانكارى لە دەستەكەدا. كۆمەڵێك دمـەزراوە و كۆمپانيا هـەن مانگانـە خـواردنێكى بەكۆمـەڵێك ڕێـك دەخـەن و بانگێشـتى گوتاربێـژێكى بەهێز دەكەن بۆ هاندانى كارمەندانيان.

بـڕوام وەهايـە دەتـوانى كۆبونـەوە لـەدەرەوەى شـوێنى كـارت لـە هەرجێگەيـەك بێـت ئـەنجام بـدرێت، مـن بۆخـۆم چـەندين كۆبونـەوەم لـە باخچـە گشـتيەكاندا ئـەنجام داوە ! بۆچـى نـا؟ هـەواى پاقـژ و ديمـەنى جـوان و كەشـێكى ئارامبەخشـە. بـڕوام پێبكـە ئـەم كۆبونەوانـە لـە كۆبونـەوە فەرميـەكان باشـتر و بەبەرهـەم و سـەركەوتووترە. جارێكيـان گەشتێكم بۆ سەر كەنارى دەريا ڕێكخست، كارمەندام بە خێزانيانـەوە ئامـادەبوون، يـەك كاتژمێر كۆبونەوەم لەگـەڵ كـردن، ئـەوجا خێزانـەكانيش بەيـەكتر ئاشـنا و ناسـياوبوون، چێژيشيان لەكەش و جوانى دەرياكەش وەرگرت. بێگومان هەر كەسە و تێچوونى گەشتى خۆى لەئەستۆ گرتبوو، بەلاَم زۆرجارى تر كۆمپانيا پارەى خۆراكى بـۆ خـەرج دەكـردن. ئەم كۆبونەوانـە زۆر لەيـەكترى نێزيـك دەكردينـەوە و كـاتى گونجـاوى پـێ دەبەخشـين و كۆبونەوەكەشمان سەركەوتوو دەبوو. ئەنديشەت بقۆزەرەوە، هـيچ كەسـێك نييـە بڵێـت: كۆبونەوكان هەردەبێت فەرمى بن، بەڵكو دەبێت بەبەرهەم و كارا و هاندەربن.

## ٧٩-کۆبونەوەکان ڕێزگرتن لەخود

((گرنگی بە ریشك بدە لقەکان خۆیان گرنگی بەخۆیان دەدەن))

**پەندێکی چینی**



لەساڵی ١٩٨٦ دا ڕۆیشتمە نێو کۆبونەوەیەکەوە لە کالیفۆرنیا، کەتایبەت بوو بە خۆ ناساندن، هەموومان دە بەشداربوو بووین، کۆبونەوەکە بەباشی بەڕێوەچوو، لەبەرئەوەی دووڕۆژ پێکەوە بووین بۆیە بەباشی یەکترمان ناسی. لەدووەمین ڕۆژی کۆبونەوەکەدا قسەبۆکارمان لەنێو باخچەکە ڕای گرتین و بە بازنە دایشیشتاندین و داوای لێکردین بە نۆرە پەسنی تایبەتمەندییە باشەکانی کەسەکەی تربدەین. ئەوجا داوای لێکردین هەریەکەمان ١٠ تایبەتمەندی باشی خۆمان بنوسینەوە لەماوەی دەخولەکدا، بێگومان ئەمە وەهای لێکردین هەست بەگرنگی و مەزنی و ڕێزداری خۆمان بکەین.

ئەم بیرۆکەیەم زۆر بەلاوە پەسەند بوو، بەجۆرێك بڕیارمدا لە کۆبونەوەکانمدا بەکاری بێنم و ناوی (( بازنەی ڕێز لەخۆگرتن))م لێنابوو، لەئەنجامیشدا دەستەکەم هەستیان بە مەزنی و باشی خۆیان دەکرد و دەستیان دایە تێبینی کردنی تایبەتمەندییە سوپاس گوزاریەکانیان. کەواتە تۆیش بۆچی هەوڵی تاقیکردنەوەی ئەم شێوازە نادەی؟ ئەمە هیچی تێ ناچێت، بەڵام وەها لە کارمەندانت دەکات هەست بەگرنگی خۆیان بکەن و بەباشی ڕێز لەخۆیان بگرن. ڕەنگە بینیبێتت کە هەندێك کۆبونەوە فەرییە و هەندێکی تریش گەرییە، ئێستا دەبێت ئاشنای هەموو شتانەبیت کەلەکۆبونەوەکاندا پێویستت پێیانەو بۆئەمەش ئەم بەشە بەباشی بخوێنەرەوە و بەپوختی بە خاڵی یەك بەدوای یەك

دایان بڕێژەرەوە، ئەوجا بیخەرە بواری جێبەجێکردنەوە و دەبینیت دەکەویتەسەر ڕێگەت بەرەو بەدیهێنانی ئامانجت. هەوڵبدە داهێنەربیت و کۆبونەوەکانت چێژبەخش بکەیت، چاوەڕێی ئەوەمەکە کۆبونەوەکانت بەرهەمداربن دەبێت خۆت وەهایان لێبکەی.

**بڕیاربدە کە کۆبونەوەی سەرکەوتوو بەستیت ...**

# کلیلی دوازدەیەم

## دامەزراندن..

## جیاوازی دروست دەکات..



((وەك چۆن شوێنی شیکاریەکان دەکەویت ئاوهـایش شـوێنی دڵـت بکـەوە، یـەکێکیان هەڵمەبژێرە، بەڵکو هەردووکیان کۆبکەرەوە))

**ریچارد ئا.مۆرۆن**

## ٨٠-ئامادەبە..کارەکە ئاسان نییە:

((کەروێشك ڕووخسارێکی جوانی هەیە، بەڵام ژیانی تایبەتی کەروێشك فەتارەتە. بەڕاستی بوێری ئەوەم تیانییە باسی ئەو شتەخراپانەت بۆ بکەم کە کەروێشك ئەنجامی دەدات))

**پەندێکی سەرچاوە نادیار**



ڕیچارد کە بەڕێوەبەری بەشی دەرامەتی مرۆییە لە کۆمپانیایەکی گەورەدا جارێکیان گوتی:" پێنج ساڵ بەر لەئێستا، هەستم بەوەکرد پێویستم بەکەسێکی ترە هاوبەشی ژیانم بکات، بۆیە دەستم دایە گەڕان لەهەموو جێگەیەك بۆ هاوسەرێکی باش دەگەڕام، چاوم بەزۆر ئافرەت کەوت و حەزی خۆم بۆ دەربڕین، بەردەوام لەگەڕاندا بووم تاوەکو لەکۆتادا کارۆلینم دۆزیەوە. کارۆلین ئافرەتێکی تەمەن ناوەنجی و جوان، ژیر و ئاسودەبەخش بوو، بۆماوەی دووساڵ خەریکی مەوعیدکاری بووین، گرنگ نەبوو بۆکوێ دەڕۆیشتین گرنگ ئەوەبوو کاتێکی خۆشمان بەسەردەبرد. بۆیە داوای هاوسەرگیریم لێکرد، ئەوکاتەی پێم قایل بوو وەهام هەست دەکرد بەختەوەرترین مرۆڤی سەر زەویم، بەڵام بە تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆرکەم بەسەر مانگی هەنگوینیماندا هەستم بە گۆڕانێکی ریشەیی کردەوە لە ڕەفتاری کارۆلیندا، زۆر دڵپیس بوو، گەر نەختێك لە ئیشەکەم دێر بهاتمایەتەوە کێشە دەستی پێدەکرد و بۆماوەی یەك هەفتە قسەی لەگەڵ نەدەکردم، هەموو هەوڵێکمدا بۆ ڕزگارکردنی هاوسەرگیریەکەمان، بەڵام دواجار ناچاربووم قاپە ژەهرەکە بخۆمەوە و بە جیابونەوە قایل بووم، بەڵێ ئێستا بەتەنها دەژیم، پێویستە دیسانەوە دەست بەگەڕان بکەم، بەڵام دەترسم دیسانەوە هەڵەی کوشندە بکەم و کەسی

نەگونجاو هەڵبژێرم، بەڵێ ژن خواستن و کارمەند دامەزراند وەکو یەك وەهاتان ، نازانی باشت کردووە یان خراپ تاوەکو بەتەواوەتی لێی نێزیك نەبیتەوە"، ریچارد ئەمەی گوت و لێی دا و ڕۆیشت.

بەڵێ بێگومان دامەزراندنی کارمەندێکی نوێ و کردنی بە بەشێك لەدەستەی کارت وەکو هاوسەرگیری وەهایە کە کەسێکی تر بە هاوبەشی ژیانت دیاریبکەی، بۆیە پێویستت بە هەنگاونانی پێویستە بۆ دانی بڕیاری دروست و دۆزینەوەی کەسی گونجاو و چاوپێکەوتنی و دواتریش دامەزراندنی. بەڵام پاشی ماوەیەك دەبینی ئەم کەسە ئەوە نەبووە کە تۆ بەدوویدا دەگەڕایت، لەکاتی چاوپێکەوتنەکەدا خۆی بە قورێکی جیاوازی لەخۆی سواغدا و پیشاندابوو، بەڵام ئێستا کە قوڕی ڕاستەقینەی خۆی دیارکەوتەوە بەکەڵکی دامەزراند نایات.

لەگەڵمدا هاوڕای بەوەی دامەزراندنی کارمەند کارێکی ئاسان نییە؟ هەرگیز ڕوویداوە کەسێکت دامەزراندبێ و دواتر ناچاربوویتە دەری بکەی یاخود خۆی نامەی دەست لەکارکێشانەوەی پێشکەش کردووە؟ گەر تۆیش وەکو مرۆڤەکانی تر بیت ئەوا وەڵامەکەت بەڵێ دەبێت. لێرەدا هەموو ئەو ئامرازە پێویستانەت بۆ دەخەمە بەردەست کە پێویستن بۆئەوەی کارمەندی باش لە خراپ جودابکەیتەوە و خراپ دانەمەزرێنی، بۆئەمەش پێویستت بە فێربوونی بەهرە و ستراتیژیەتی ئاوەزی و پیشەیی نوێیە بۆ دانی بڕیار لەسەر بنەمای ئاوەزە زانست(لۆجیك) و پەیبردنە ڕووداو(حەدەس)ت، بەڵێ ئەمەیە ئامانجی پشت ئەم بەشە.

## ٨١-نۆ هۆکار دەبنەهۆی زۆربوونی تێچوون لەکاتی دامەزراندندا:

((زیانی گەورە بە بچوك دەست پێدەکات، هەربۆیە پێویستە گرنگی بە زیانە بچوکەکان بدەی بۆ خۆلادان لە زیانە گەورەکان))

**د.ئیبراهیم فەقی**

ئایا هەرگیز تێچوونی دامەزراندنی کەسێکت هەژماردووە؟ زۆر بەڕێوەبەر هەن گرنگی زۆر بە فرۆشەکان، بازاڕکاری، بودجە دەدەن و هیچ گرنگییەك بە دامەزراندن نادەن. لە لێکۆڵینەوەکاندا هاتووە کە: بەڕێوەبەران هەرگیز بەشدارنابن لە کردارەی دامەزراندنی کارمەندی نوێدا، وای دەبینن کاری ئەوان نییە و کاری ئەوان شتی ترە. جارێکیان لەگەڵ خاوەن کۆمپانیایەکی ناوەنجیدا قسەم کرد و لێم پرسی کە ئایا بەشداریت لەکردارەی دامەزراندندا؟ گوتی:" من بڕوام بە پێسپاردنە، بەڕێوەبەرێکم بۆ ئەم کارە داناوە. کەواتە ئیتر خۆم بۆچی بەشداربم؟ دەتەوێت لەهاندانەکانیان کەم بکەمەوە لەکاتێکدا ئەوکەسەی من دامناوە بەتەواوەتی ئاشنای ئیشەکەی خۆیەتی؟" .

گوتم: نەخێر، ئەوجا پرسیارێکی ترم ئاراستەی کرد:" چی ڕوودەدات گەر کەسی نەگونجاوی دامەزراند؟"، پێکەنی و گوتی:" ئەمە شتێکە دەبێت لەگەڵیدا بژین! بۆخۆی لەهەڵەکانیەوە فێردەبێت".

بۆ چارە ڕەشی ئەم بەڕێوەبەرە بەهەڵە لە بیرۆکەی پێسپاردن ودەستەی کار گەیشتبوو، خۆی لە بەشداری کردن لە کردارەی دامەزراند دوورخستبووەوە تەنها لەبەرئەوەی بڕوای بە پێسپاردن هەبوو! بەڵام مەبەست لێرەدا ئەوەیە: گەر کەسی پێسپێراو بەهەڵە کەسێکی دامەزراند ئەوا ڕێژەی هاندانی زۆرینەی کارمەندانی نێو دامەزراوەکەت نزم دەبێتەوە. ڕۆژێکیان سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێڕی کۆمپانیایەکی گەورەم چاوپێکەوت و لە بۆچونیم پرسی لەبارەی کردارەی دامەزراندنەوە، ئەویش

گـوتی:" دامەزرانـدنی كەسـێكی هەڵـە ڕەنگـە ببێتـەهۆی ئـەوەی هـەموومان بـۆ دواوە بەرێتەوە، بەم هۆیەوە كات و پارە و شەكەتی ناپێویسـت خـەرج دەكـەین، بۆیـە مـن لـە كـردارەی بڕیـاردان لـە دامەزرانـدنی كەسـاندا بەشـدار دەبم" ، ئـەوجا ئـەم پرسـیارەم ئاراسـتە كـرد:" بـەلام تـۆ كارمەنـدت زۆر زۆرەو كەواتـە چـۆن كاتـت دەبێـت و دەتپەرژێتەسـەر بەشـداریكردن لـە دامەزرانـدنی كارمەنـدی نوێـدا؟"، بەچـاوێكی زۆر متمانـەوە لێـی ڕوانـیم و گـوتی:" مـن ئـەم كاتـە دەدۆزمـەوە. كارمەنـدانمان وەكـو كڕیارەكانمان وەهاتان، گەر كەسی گونجـاو دانەمـەزرێنین، ڕەنگـە كڕیارمـان نـەمێنێت"، گومانی تێدا نییە ئەم جۆرە بەڕێوەبەرە سەركەوتووە و بەهای كارمەندی بـاش ئاشـنایە. دامەزرانـدنی كەسـی هەڵـە دەبێتـە هـۆی زیـان گەیانـدنی زۆر. بـاوەكو بـەدیاریكراوتر قسەبكەین و لـەو نـۆ هۆكـارە بكۆڵینـەوە كـە وەهـا لـە بەڕێوەبـەر دەكـەن هەڵەبـەكات و لەكردارەی دامەزراندا پارە و كاتی زۆر خەج بكات، ئەوانیش:

## ١-لەدەستدانی كات بۆ دامەزراندن هەڵەیە:

كـاتی زۆر بـۆ نەخشـەدانان، هەڵبـژاردن و چـاوپێكەوتنی تایبـەتی و دەسـتكەوتنی سەرچاوەكان و دواتر دامەزراندنی دادەنێی و بـە فـیڕۆ دەدەی، هـەروەها كـاتی زۆریشـت لەدەست دەچێت لە ناساندنی ئەم كەسە تازەیە بە كار و سروشتی كارەكە.

## ٢-لەدەستدانی پارە بە مەشق و ڕاهێنان:

دامەزراوەكەت پارەی زۆر خـەرج دەكـات لـە مەشـق پێكردنـی كارمەنـدان. كۆمپانیـای IBM ڕێگە بە كارمەندی فرۆشەكان نادات بە تەنها كاربكات مەگەر هەشت مـانگ بەسـەر دامەزراندنیدا ڕۆیشتبێت! ئەم كۆمپانیایە مەشقی باش بە كارمەندەكەی دەكـات و فێـری لێهاتوویی فرۆش و بەهرەی تایبەتیشی دەكات. دەزانـی ئـەم كۆمپانیایـە چـەندە پـارەی لـەكیس دەچـێت گـەر پـاش مەشـق پێكردنەكـە كارمەندەكـە دەسـتی لەكاركێشـایەوە و

لەکۆمپانیاکە ڕۆیشتە دەرەوە، بێگومانی کۆمپانیاکە پارەیەکی بێشوماری بەفیڕۆ دەڕوات.

### ٣-هەڵەکان:

کارمەندی نوێ هەڵەی زۆر دەکات تاوەکو فێری ئیشەکەی دەبێت و متمانە بەخۆی دەکات. ئەم هەڵانە ڕەنگە ببێتەهۆی لەدەستدانی هەندێك كڕیار، کارمەندێك لەبەشی شتن نزیکەی پێنج سەد پەرداخی شکاند لەماوەی سێ مانگی سەرەتای ئیشەکەیدا، ئەمە سەرباری ئەو شتانەی تریش کە پێشبینیت نەکردووە، بێگومانبە لەوەی بەر لە مەشق پێکردنی ئەم کارمەندە هەڵەی گەورە ئەنجام دەدات.

### ٤-موچە و زیادەکەی:

بێگومانین لەوەی کە موچەی دراو بە کارمەند بەجۆرێك لە وەبەرهێنان دەزانین، بەڵام کاتێك کارمەندەکە ناکارا دەبێت و بەرهەمێکی نابێت موچەکەی وەکو خەرجی لێدێت، خەرجی زۆر، بۆیە ئەو موچەیەی بە کارمەندێکی نەگونجاوی دەبەخشیت زیانە.

### ٥-کاریگەری خراپ:

بوونی کارمەندێکی نەرێنی لە بیرۆکە و ڕەفتار لەنێو کارمەندەکانی تردا دەتوانێت ژەهرەکەی بڵاوبکاتەوە و کار لە باوەڕیان بە خۆیان و دامەزراوە کارتێدا کردووەکەیان بکات و بەهۆیەوە متمانە لەدەست بدەن.

### ٦-دابەزینی گیانی ماناوی لەشوێنکاردا:

گەر ئەم کارمەندە جۆرێك لە پەرکەمی هەبێت و بەردەوام ئامادەی بەرگری بێت و لە نانەوەی ئاژاوە بەردەوام بێت، ناچاری دەرکردنی دەبیت، ئەمەش لای خۆیەوە کار لە

گيانی ماناوی كارمەندانی تـرت دەكـات. بێگومـان كـردارەی دەركردنـی هـەر كارمەنـدێك كاريگەری خراپی لەسەر دەرونی ئەوانی تر دەبێت.

### ٧-ورتەورتەكان-دەنگۆكان:

كارمەندی خراپ ڕەنگە ببێتە هۆی دروستكردنی قسەی پاشەملێ بۆئەوانی تـر و ورتـە ورتی زۆر دروستبكات، كاتێك كارمەنـدەكان دەزانـن هەڵـەكراوە لـە دامەزرانـدنی ئـەوكات واتەواتـەكان زۆرتـر و بـەهێزتر دەبـن. هەنـدێك دەڵـێن: تـۆ بـەهۆی خزماتییـەوە داتمەزراندووە، كەسانی تریش دەيان چيرۆكی تر دەگێڕنەوە و دەخەنەپاڵت.

### ٨-لەدەستدانی متمانە:

دەسـتەی كارمەنـدانت متمانـەكردنيان بـەتۆ لاواز دەبێـت، بـەهۆی ئـەم هەڵـە بڕياردانەتەوە. بۆيە زۆر وريا و بەهۆش و بێ دڵەڕاوكێبـە لـەكاتی دامەزرانـدنی كارمەنـدی نوێدا.

### ٩-دووبارە دامەزراندنەوە:

كاتێك بڕياری دامەزراندنەوەی كەسێكی تر دەدەی لەجێگەی ئەويتر ئەوكات ديسانەوە پارە و كات و وزەيـەكی زۆرت بـەفيڕۆ دەدەی. ئەمانـە هۆكارگـەلێكن وەهـا لـە كـردارەی دامەزراندن دەكەن ببێتە كردارەيەكی تێچوون زۆر، ئـەم بەشـە يارمـەتيت دەدات بـۆ خـۆ بەدوورگرتن لەم هەڵە و كەموكورتيانە لەكاتی بڕياردان لە دامەزراندنی كارمەندێكی نوێ.

## ٨٢-هەشت هۆکار وەها لە بەڕێوەبەران دەکات کەسانی نوگونجاو دابمەزرێنن:

((گەر ئەوەندە ژێری پێشبینی کێشەیەك دەکەیت، ئەوەندەش ژیریت تێدایە کە چارەسەری بۆ بدۆزیتەوە))

**د.ڕۆبێرت شۆلر**



دۆزینەوەی کارمەندە باشەکان کارێکی گران نییە. بەڵام لێرەدا چەند پرسیارێك هەیە: ئایا ئەم کەسە باشانەی دایان دەمەزرێنی بۆ ئیشەکەش گونجاو و باشن؟ ، خاوەنی بەهرەی گونجاون؟ ئاراستەیەکی دیاریکراویان هەیە؟ ئایا ئەوان ئامادەی مەشق و ئامادەکردنن؟ حەزیان لەڕۆیشتنە بەمیلێکی زیادتر؟ ئایا ئەوان حەزیان بە سەرکەوتن وگەشەی دامەزراوەکەی تۆ و خۆیشیانە؟ هەموو ئەم پرسیارانە و پرسیارگەلی زۆرتریش پێویستی بە وەڵامە بەر لە دامەزراندن. ڕەنگە ئێستا بیرۆکەیەکی هەڵەت هەبێت لەبارەی چۆنێتی دامەزراندنی کارمەند و خراپیەکانیەوە. ئێستایش وەرە باوەکو پێکەوە ئەو بڕیارانە بدەین کە وەها لە بەڕێوەبەران دەکات بڕیاری ناڕاست بدەن و کەسانی نەگونجاو دابمەزرێنن:

### ١-نەبوونی ئەزمون:

ڕەنگە بەڕێوەبەر هەستێت بە دامەزراندنی کارمەندێکی نوێ، لەبەرئەوەی ئەم بەڕێوەبەرە ! لەکاتێکدا ئەم بەڕێوەبەرە هیچ ئەزمونێکی لەگەڵ ئەم جۆرە کارەدا نەبووە.

**٢-نەبوونی ئامادەیی پێشوەخت:**

ڕەنگە بەڕێوەبەر لیستی ئەوشتانەی پێویستیەتی ئامادە نەکردبێت، هەمیشە بیر لەو پرسیارانە دەکاتەوە کە بەدیاریکراوی ئاراستەی کارمەندەکەی بکات و نازانێت کام جۆرە وەڵامی کەسی بەرامبەر گونجاوە.

**٣-سوك سەیرکردنی دۆخەکە:**

بەڕێوەبەرەکە کاتی تەواو بەم تازە کارمەندە نادات و لەکاتی چاوپێکەوتنەکەدا وەڵامی پەیوەندیەکان دەداتەوە، وەها دەزانێت دامەزاندن کارێکی قەشمەجاڕیانە و هیچە و کاتی زۆری پێویست نییە.

**٤-پەیوەندیەکان:**

بەڕێوەبەر چاوی بە کارخوازێکی تازە دەکەوێت، تەنها لەبەرئەوەی کارمەندێکی تر پێیدا هەڵداوە بۆیە بە ژیر و گونجاوی دەزانێت و پەسندانەکە بەم دۆخەوە دەبەستێتەوە و بڕیاری دامەزراندنی دەدات.

**٥-بڕیاردان بەپشت بەستن بە ناونیشان:**

بەڕێوەبەرەکە بەپشت بەستن بە ڕووخسار و ئەوانەی چاوی بینیویەتی بڕیاردەدات.

**٦-بڕیاردانی پشت بەستوو بە هەستەکان:**

بەڕێوەبەر بەپشت بەستن بە هەستەکانی چەندان کەس دادەمەزرێنێت و گرنگی بە ڕاستی و کەتواری نادات، بۆیە دەکەوێتە هەڵەی دامەزراندنی کارخوازی نەشیاوەوە.

### ٧-گوێ نەگرتن:

بەڕێوەبەرەکە هەرقسەدەکات، بەبێ ئەوەی بواری بەکارمەندەکە بدات قسەبکات.

### ٨-نەگەڕانەوە بۆ بڕوانامە و بەهرەکان:

بەڕێوەبەرەکە بە چاوپێکەوتنە تایبەتیەکە قایل دەبێت و دواجار بڕیاری دامەزراندنی دەدات بەبێ گەڕانەوە بۆ بەهرە و بڕوانامەکانی .

بەڵێ ، ئەم هۆکار و ڕەوتارانە وەها لەبەڕێوەبەر دەکەن بەهەڵە بڕیاربدات، بڕیاری نادروست دەربکا و کەسانی نەگونجاو دابمەزرێنێت .

## ٨٣-دەهۆکار بۆ دۆزینەوەی کەسی ناوازە:

((سەرکەوتن و شکستت وەکو بەڕێوەبەر بەپلەی یەکەم پەیوەستە بە توانایيتەوە بۆ هەڵبژاردنی دەستەکەت))

د.ئیبراهیم فەقی



دۆزینەوەی بەهرەی کارخواز یەکێکە لەئیشەکانی کارگێڕی، هەندێك لە بەڕێوەبەران بەئاسانی دەتوانن کارخوازی بەهرەدار بدۆزنەوە، لەکاتێکدا بەڕێوەبەرگەلی تر پشت بە ئاژانسەکانی دامەزراندن دەبەستن لەبۆ دۆزینەوەی کارمەندی گونجاو بۆ ئیشەکە، ئێستایش لێرەدا باوترین ڕێگەکانی دۆزینەوەی بەهرەی ڕاستەقینەت بۆ بەردەست دەخەم:

### ١-کارمەندانی ئێستا:

بەرلەوەی لە جێگەیەکی دیکە بەدووی کارمەندی بەهرەداردا بگەڕێی، هەلێك بەکارمەندانی خۆتبدە بۆ دۆزینەوەی بەهرەکانیان.

### ٢-کارمەندانی پێشوو:

ئەو کەسانە دەگرێتەوە پێشتر لە دامەزراوەکەی تۆدا کاریان کردووە و بەهەر هۆکارێك بووە وازیان لەئیشکرد هێناوە-جگە لە بێتوانا و دژمنە تایبەتیەکان-ڕەنگە بەدووی پێشکەوتنی زیادتر لەجێگەیەکی تر ئەم ئیشەیان بەجێ هێشتبێت، ئەم کەسانە باشترن لەکەسانی تازە و نامۆ" چون پێشتر ئاشنای دامەزراوەکەی تۆ بوونە.

### ٣-هەڵبژاردن و پاك پشتگیری:

دەتوانی پەیوەندی بە بەڕێوەبەرگەلی ترەوە بکەیت و باسی ئەوکەسانەی بۆ بکەی کە پێویستت پێیانە، دەتوانی لەکارمەندانیشت بپرسیت لەوەی گەر کەسێکی بەم تایبەتمەندیانە ئاشنان ئەوا دەتوانن بانگێشتی دامەزراندنی بۆ بکەن.

### ٤-کۆلێج زانکۆکان:

ناوەدگەلێك هەن تایبەتن بە دامەزراندن کەلە خوێندنگە و زانکۆکاندا بەردەستن، زۆر بەسود دەبێت گەر پەنا بەوانیش ببەی و هەندێکلەو خوێندکارانەت بۆ بهەنێرن کە خوێندنیان تەواوکردووە و ئەو زانیاریانەشت پێشکەش بکەن کەلەبارەی ئەو کارخوازانەوە پێویستتە.

### ٥-سەندیکاکان:

زۆرجار دەتوانی پەنا ببەیتەبەر سەندیکا گەلێکی وەکو ئەندازیاران و ئاوەدانکردنەوە و هەژماری و ..هتد، داوایان لێبکەی گەر کەسێکی گونجاو بۆئەوکارەی تۆ ئاشنا باوەکو بۆتی بهەنێرن.

### ٦-ناوەندەکانی دامەزراندن:

لەهەموو ناوەندێکی دامەزراندندا ناوی ئەو کەسانە هەن کە کارخوازن، دەتوانی پەیوەندییان پێوەبکەیت، دەبینی دەیان کەسی کارخوازی گونجاوت بۆ دەخەنە بەردەست.

## ٧-کێبڕکێکارانت :

سەرباری ئەوەی توشی بەربەرچدانەوەیەکی نەرێنیانە دەبیتەوە بەلآم هەوڵی دۆزینەوەی کارمەندی گونجاوت بدە لەنێو دەستەی کاری کێبڕکێکارانتدا. گەر کارمەندەکە بەو موچە وکەشە قایل بێت کە تێیەتی ئەوا هەرگیز ئەو دامەزراوەیە جێ ناهێڵێت، پێچەوانەش ڕاستە.

## ٨-کۆنە کارمەندان:

ئەمان کەسانی خانەنشین بوو دەگرێتەوە، ئەو کەسانەی هێشتاکە بەدوی گرەوەناستەنگدا دەگەڕێن، دەتوان سود لە شارەزاییەکانی ئەمانیش وەربگریت، ەتوانی لەڕێگەی سەندیکای ملوانکەی زێڕینەوە بیان دۆزیتەوە.

## ٩-بانگەشە:

دەتوانی لەڕێگەی لاپەڕەی بانگەشەی ڕۆژنامەکانەوە چەندین کەسی بەهرەمەندت دەست بکەوێت. گەر پشت بەم ڕێگەیە دەبەستیت ئەوا بزانە  کە پێویستە بانگەشەکەت دیریکراو و سەرەنج ڕاکێش و ڕاستەوخۆ بێت. هەروەها تایبەتمەندی و بڕوانامە و بڕی موچەش دیاریبکە و گەر بەپلەیت دەتوانی ژمارەی تەلەفۆنی لە بانگەشەکەدا بەکاربێنی ، بەلآم تەنها پێویستە لەکاتی لەناکاودابێت، ئەگینا باشتر وەهایە تەنها ناونیشان و ئیمێل یان ناونیشانەی پۆستەکەت لەسەر بانگەشە بنوسی.

## ١٠-ئاژانسەکانی دامەزراندن:

ئەم ئاژانسانە ناوەندگەلێکی باشن بۆ دۆزینەوەی بەهرەی ڕاستەقینە، چونکە بە ڤیدیۆ کەسانی پاڵێوراوت بۆ دەخاتەڕوو. ئەم ئاژانسانە باشترین کارمەندنت بۆ دەخەنەبەردەست لەگەڵ زەمانی یەك ساڵ. گەر ڕوویدا و کارخوازێکت هەڵبژارد و بەدڵت

نەبوو ئەوا بۆتی دەگۆڕن، بەڕاستی هەلێکی زۆرباشە بۆ هەڵبژاردنی باشترین، بەڵام تێچوونی زۆرە.

دەتوانی سود لە ڕاژەی ڕاوێژکاران وەربگریت لەسەربنەمای نیوچەکاتی و بەچاوپۆشین لەو ئامرازانەی لەڕێگەیەوە بەهرەکانت چنگ دەکەوێت، گرنگ ئەوەیە بزانیت کە باشترین ڕێگەت بەسودی دامەزراوەکەت گرتۆتەبەر.

## ٨٤-چۆنێتی خستنەڕوو و هەڵبژاردنی باشترین؟

((هەرگیز كەس گەلێك دامەمەزرێنە لەشێوە و ناوەڕۆكدا لەتۆبچن" چون دەبنە هۆی دروستكردن و پێكهێنانی دەستەیەكی كەم كاریگەر و توانا))

**ریچارد. ئا.مۆرن**



دوایین جار كەی بووە دەركی دامەزراندن خستۆتەسەر پشت؟ چەند كەس ئامادەی دامەزراندن بوون؟ ڕەنگە پتر لە سەد كەس! توێژینەوەكان وەهای دەگێڕنەوە كەتۆ پتر لە سێ سەد كەس دەبینی بۆ دامەزراندنی یەك كارمەند! لەم كاتەدا یەك پرسیار بەجوانی خۆی دەپرسێنێت: چاوت بەهەموویان كەوتووە؟ گەر وەلامەكەت نەخێرە كەواتە چیت كردووە؟ ڕەنگە بزانی زۆرێك لەو كەسانەی بەدەم داواكاریەكەی تۆوە دێن كەسانێكی پیشە و بەهرە جیاوازن، كورتە ژیاننامەی خۆیان دەهەنێرنە هەموو جێیەك بەئومێدی زوودامەزراندن. ڕەنگە هەندێك كەس تەواو گونجاوبێت بۆ دامەزراندن و هەندێكی تریش نەگونجاو. بۆیە پێویستت بە بینینی هەموو كارخوازەكانە، بۆئەوەی بتوانی باشترینیان هەڵبژێری، بۆئەمەیش دەتوانی سود لەم ڕێنماییانە وەربگریت:

١- ئەو داواكاریە بدۆزەرەوە كە وتارێكی لەگەڵدا هەنێردراوە، ئەمەش مانای وەهایە ئەم كەسە گرنگی زۆر بە دامەزراندن دەدات.

٢- ئەو داواكاریانە هەڵبژێرە كە لەگەڵ كارەكەتدا گونجاون و ئەوانەی نەگونجاون توڕیان بدە.

٣- هەر داوایەکی ناپاك و نارۆشن ڕەتبکەرەوە، بەتایبەت گەر هەڵەی زمانەوانی زۆری تێدابوو، ئەم جۆرە داواکاریە مانای وەهایە خاوەنەکەی نارێك و کار لەکۆڵ کارەوەیە.

٤- لەو کەسانە بترسە زۆر بە زوویی لەکارەکانیان دەڕۆن ولەسەر ئیشێك نامێننەوە و لەنێوان دامەزراوەکاندا تەراتێنیانە.

٥- لەو کەسانەش وریابە زوو زوو کارەکانیان دەگۆڕن، لەوەی: ئەم کەسە پێشووتر وەکو ئەندازیار کاری کردووە، دواتر بووە بە مەیکێرو ئەوجا شاگرد و دواتریش کرێکاری بلۆك.. ئەم کەسانە خۆشیان نازانن چییان دەوێت.

٦- بەدووی دەستهاتی تایبەتدا بگەڕێ، بۆنمونە بڕوانامەی تایبەت یاخود پلەیەکی تایبەت.

٧- لەو کەسانە وریابە کە بەڵگەی پشتیگیرییان پێ نییە، وەکو ئەو دەرچوانەی زانکۆ کە ساڵی دەرچون و جۆری بڕوانامەکانیان نانوسن.

ئەم جۆرە هۆکارانە و هیتریش بەپشت بەستن بە بیست و پێنج ساڵ ئەزمون و شارەزایی خۆم لە بەڕێوەبردندا لەلامدا دروست بوونە و یادم گرتوون. بێگومان مەرجیش نییە کەسێك ئیشی زۆری گۆڕیبێت یاخود بە دەستوخەتێکی ناخۆش داوای دامەزراندنەکەی نوسی بێت هەموویان نەگونجاوبن، گەر بەختت هەبێت دانەیەکیان بۆتۆ گونجاو دەبێت، گرنگ ئەوەیە تۆ ئێستا تێگەیشتبیت و بزانیت چۆن کارمەندی خوازراو و پێویستت هەڵدەبژێریت و چێژ لە هەڵبژاردنیان ببینی و دواتریش سودی باشی لێ ببینی و پەژیوان نەبیتەوەو ناچار نەبیت دەری بکەی و بەم هۆیەوەش کات و پارە و وزەی زۆرت لەکیس بچێ .

## ٨٥-کردارەی دامەزراندن:

((من بۆ جیاکردنەوەی شتەکان پشت بە چاو نابەستم، بەڵکو پشت بە ئاوەز دەبەستم کە باشترین ڕێگەیە بۆ بڕیاردان لەسەر کەسەکان))

**سنیکا**

دامەزراندن هونەرێکە پێویستی بە فێربوون و یادگرتن و تێگەیشتن و ئەنجامدان و یادگرتنە، ناتوانی بە وشەیەك یاخود بە دێڕێکی ئاسان پێناسەی دامەزراندن بکەی" چون کردارەیەکی تەواوکارە و پێویستی بە بەهرەی هێزی و پیشەییە. لەبەرئەوەی بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتووی پێویستە فێری چۆنێتی هەڵبژاردنی کارمەندی گونجاوبیت، بەتایبەت لەڕێگەی گرتنەبەری پێنج هەنگاوی پێویستەوە، ئەوانیش: نەخشەڕێژکردن، چاوپێکەوتنی تایبەتی، هەڵبژاردن، پێداچوونەوە بە بڕوانامە و بەهرەکان و دواجاریش دامەزراندن. ئێستایش باوەکو بزانین چۆن ئەم هەنگاوانە بەکاردەهێنین و بەباشترین شێوە سەرکەوتوو دەبین لەبەکارهێنانیاندا:

### ١-نەخشەڕێژکردن:

یۆرپیرس دەڵێت:" **سەرەتای خراپ هۆکارە بۆ کۆتایی خراپ**" ، بۆیە تۆ پێویستت بەوەیە نەخشەیەکی ورد و دروستت هەبێت. دەبێت هەموو هەنگاوەکانی کردارەی دامەزراندن یادبگرین، بۆئەمەش نەخشەی چۆنێتی ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ کارخوازدا دیاریبکە لەگەڵ چۆنێتی لێکۆڵینەوە لە بڕوانامە خراوە ڕووەکان و دواجاریش بڕیاردان، گرنگ ئەوەیە بزانی بۆچی ئەوکەسە هەڵدەبژێری، پێویستە ئەم هەمووە بنوسیت و نەخشەی گونجاو دابڕێژی یاخود لیستی پێداچوونەوە بۆ ڕاستکردنەوەی قسەی کارخواز دابڕێژی. دەبێت بزانی لەم کاتەدا پێویستت بەمانەشە:

أ- جۆری بڕوانامە و بەرپرسیاریەتیەکانی.

ب- پێویستیەکانی کارەکە.

ت- جۆری کەسی مەبەست و خوازراو.

پ- بڕوانامە و پیشە و شارەزاییە پێویستەکان.

ج- کاتی دیاریکراو بۆدامەزراندنی کەسی مەبەست.

ح- کاتی دیاریکراو بۆ چاوپێکەوتنی کەسی کارخواز و ویستراو.

خ- شوێنی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکە.

د- پێویستت بەیارمەتی کەسی ترە یاخود نا؟ ئایا ئەم کەسە شوێن و کاتەکە ئاشنایە و دەزانێت چی پێویستە ئەنجام بدات؟

ژ- لیستی ئەو پرسیارانە دابڕێژەرەوە کە لە کارخوازی دەپرسیت" بۆ خۆلادان لە کردنی پرسیاری لابەلا و نەپچڕاندنی قسەکانی کارخواز.

ر- لیستی هەڵسەنگاندنت دیارییکە کە ئەمە وەکو ڕێبەری تۆ وەها دەبێت بۆ هەڵبژاردنی کەسەکە. دەتوانی بیکەت بە پێوەرێك بۆ هەڵبژاردنی کەسی گونجاو، ئەم لیستە دەتوانرێت لەخۆگرتەی وەکو: یەکەم قسەو دیمەن، سڵاوی دەست، کەسێتی، ئامانجەکانی، ئاستی زانیاری، بەهرە و توانابیەکانی فێربوونی، شارەزایی و ..هتد ئەمانەبێت.

لەکاتی دامەزراندا پێویستە بەهەموو دەقەکانی داواکاریەکەدا بڕۆیتەوە و بەدووی هەموو شتانەدا بگەڕێی کە پێویستی بە ڕشوونکردنەوەی زیادترە. کاتێك ئامادە دەبیت و لەکردارەی نەحشەرێژکردن دەبیتەوە دەتوانی بڕۆیتە هەنگاوی دووەم و سود لەو هەنگاوەش وەربگریت.



## ٢-چاوپێكەوتنی تایبەتی:

چـــاوپێكەوتنی تایبـــەت لەچـــوار برگـــە و هـــەنگاوی ســـەرەكی پێكـــدێت، ئێســـتایش هـــەموویانت بـــۆ ڕوون دەكەمەوە:

أ- پێشوازی: بەر لەوەی چاوپێكەوتن ڕەگەڵ كەسی خـوازراودا بكـەیت گرنگـی بـە ڕێكخستنی شوێن چاوپێكەوتنەكەبدە، دەتوانی لەتەنیشتی كارخوازەوە دانیشیت، یاخود لەكورسی بەرامبـەری، دەشـتوانی لەپشـتی مێزەكـەی خۆتـەوە دانیشـیت، ئەمـە هێـز و مەزنیت پیّ دەبەخشـێت بـەڵام بـۆ كـارخواز نائاسـودە بـەخش دەبێـت. كاتێـك دەزانیـت هەمووشتێك ئامادەیە بە بزەوە بەخێرهاتنی كەسی كارخوازبكە و بەناوی خۆیەوە سڵاوی لێبكە و سوپاسی بكە كە هاتووە بۆ چاوپێكەوتنی تـۆ. ئـەوجا بـەو كەسەشـی بناسـێنە كەلەگەڵتـدا هـاتووە بـۆ چـاوپێكەوتنەكە و دواتـر داوای لێبكـە دانیشـێت. زۆرێـك لەبەڕێوەبـەران پێیـان باشـە بەتوندیـەوە دەسـت بـە چـاوپێكەوتن بكـەن، وای دەبیـنن گوشارخستنەسەر كارخواز یارمەتی باشتر ناسینیان دەدات لەڕووی كەسێتی و ڕەفتـار و كاردانـەوەكانی، بـۆ چـارە ڕەشـی ئـەم بەڕێوەبەرانـە لـەبیریان چـووە كـە چـاوپێكەوتن بۆخۆی گوشارە لەسەر كارخواز جاوەرە تۆیش گوشاری بخەیتەسەر! ڕەنگە بەهۆی ئـەم هەموو گوشارە زۆرانەوە ئەو زانیاریانەی دەست نەكەوێت كەمەبەستیەتی لەكاتێكدا ئـەم كارخوازە كەسی مەبەستیشە. بڕواش ناكەم هیچ كەسێك حەزبكات لەگەڵ بەڕێوەبـەرێكی وەها توند و مەترسیداردا ئیشبكات.



بیرۆكـــەی پشـــت چـــاوپێكەوتن هانـــدانی كارخوازە بۆ حەسانەوە و هەست نەكردنیـەتی بـــەترس و دڵـــەڕاوكێ، بۆئەوەشـــە ســـەهۆڵی نێوانتان بتوێتەوە و هۆگری لەنێوانتدا چێ بێت، هەروەها پێویستە بەوەش ئاشنای بكەیت كەلـە چاوپێكەوتنەكەدا باسی چی ڕەگـەڵ دەكـەیت و

چەندیش دەخایەنێت چاوپێکەوتنەکەتان. فەرموو ئەمەش نمونەیەك: ((بەرێز کیڤن حەزدەکەم زیادتر لەبارەی تۆوە بزانم، ئەوجا زانیاریت لەبارەی دامەزراوەکەت پێ دەبەخشم و تاوتوێی کارەکەش دەکەین، ئەوجا وەلأمی هەرپرسیارێکی تۆیش دەدەمەوە کە بە مێشکتدابێت، ئەم چاوپێکەوتنە نزیکەی یەك کاتژمێری پێ دەچێت"، ئەوجا لاپەڕە و پێنوسەکەت ئامادەبکە و گەر کەسێکی تریشت لەگەڵدایە دەتوانی داوای لێبکەی تێبینیەکانت بە وردی و کورتی بۆ بنوسێتەوە، لە کاتێکدا تۆ لەگەڵ کارخوازەکەدا تاوتوێی کارەکەدەکەن و قسە و زانیاری ئالوگۆڕ دەکەن.

ب- دەستەبەری زانیاری: پێویستە تۆ کە بەڕێوەبەری زۆر باسی ئیشەوردەکانی کۆمپانیاکەت نەکەیت، گرنگ ئەوەیە بەرچاو ڕوونیەك بە کارخواز بدەیت و هیچیتر، ئەوجا ڕاستەوخۆ باسی کارەکەی لەگەڵدابکە، لەگەڵ لەپێش چاوگرتنی کات و هەلی گونجاو بۆ پرسیارکردن و کۆکردنەوەی زانیاریەکان.

ت- کۆکردنەوەی زانیاری: بەپشت بەستن بە کورتە زانیارییە پێشکەش کراوەکەی تۆیش پرسیاری کراوە ئاراستەی کارخواز بکە، کاتێك هەلی قسەکردنی لەبارەی خۆیەوە پێ دەبەخشیت ئەمە یارمەتی دەدات بۆ پونیات نانی متمانە بەخۆی و ئەمەیش هانی دەدات بۆئەوەی بە بوێرانەتر و ژیرانەتر قسەبکات و وەلأم بداتەوە. گوێی لێبگرە و قسەکانی پێ مەپچڕێنە، هانی قسەکردنی بدە و گرنگی پێدانەکانتی بۆ دیاربخە. سەرت وەکو ئاماژەی قایلمەندی و بەڵێ گوتن بۆی بجوڵێنە و بزەی سەر لێوەکان ڕابگرە، دەبێت کاردانەوەکانت هەمیشە وشەی زل و مەزنبن، جوانە! ئایا ئەمە ڕاستە؟ بزانە کە کاردانەوە و ڕەفتارەکانی تۆی بەڕێوەبەر هەلی زۆرت دەداتێ بۆ سەرخستنی چاوپێکەوتنەکە یاخود شکست پێ هێنانی. وەك چۆن تۆ هەولی خوێندنەوەی ئەو دەدەی بەرامبەریشت بەهەمان شێوە هەولی خوێندنەوەی تۆ دەدات. بۆیە کاتێك پرسیارێکی ئاراستە دەکەیت پێویستە کاتی تەواوی پێبدەی بۆ وەلأمدانەوە.

ئەم جۆرە پرسیارانەی ئاراستەبکە بۆ زانینی توانای بۆ سەرکردایەتی کردن:

نمونە:

- گەر تۆ بەڕێوەبەر بویت و کارمەندێکت درەنگ هات چۆن ڕەفتاری ڕەگەڵ دەکەیت؟
- چی دەکەیت گەر کارمەندێك لەپێش چاوی ئەوانی تر شکاندیتیەوە؟
- چۆن دەتوانی بۆچوونی خۆت دەربڕیت گەر کارمەندێك پرسیاری لێکردی لەبارەی کێشە تایبەتیەکانەوە؟
- گەر کڕیارێك زۆر تورەبوو چۆنی ڕەفتار ڕەگەڵدا دەکەیت؟
- لەکاتی دابەزاندنی بودجەدا چۆن ڕەفتاردەکەیت؟

ئەم پرسیارانەشی ئاراستەبکە" بۆ زانینی کەسێتیەکەی:

بۆنمونە:

- زۆر حەزت لەچییە؟
- دوایین کتێب خوێندودەتەوە چی بووە؟
- باشترین ئەو سەرکردانەی کارت لەگەڵ کردوون کێ بوون؟
- خراپترین سەرکردە کەتۆ کارت لەگەڵدا کردبێت کێ بووە؟
- لەکاتی هەڵسەنگاندنتدا سەرکردەکەت چی پێ دەگوتی؟
- گەورەترین سەرکەوتن/شکست لەژیانتدا چی بووە؟
- دەتەوێت چۆن کەسەکان چاوپێکەوتنت لەگەڵدا بکەن؟

هەوڵبدە بێ لایەنانە قسەی لەگەڵدابکەی، بەهێمنی پرسیارەکانی ئاراستەبکە و گرنگی بەهەر قسەیەکی نەشیاو و نابەجێیش بدە کەلەبارەی کارەکەی پێشووتریەوە حەزی پێیەتی. وریابە لەوەی کاتێك نەتوانێت کەلێنەکانی نێو نوسراوە پێشکەشکراوەکانی پڕبکاتەوە، بەتایبەت مێژووەکەی.

پ- کۆتایی : پاش ئەوەی هەموو پرسیارەکانی ئاراستە دەکەیت و وەڵامی گونجاوت چنگ دەکەوێت، پێویستە ئەم هەنگاوانەش بنێی:

- بە هەنگاوی دواتری ئاشنابکە.
- پێی ڕابگەیەنە گەر چاوپێکەوتنی تری هەبوو.
- کاتی بڕیاردان لەسەر وەرگرتنی یان وەرنەگرتنی پێ بڵێ.
- سوپاسی بکە و تاوەکو دەرەوەی شوێنی چاوپێکەوتنەکە ڕەوانەی بکە.

**تۆیش پاش تەواوبوونی کۆبونەوەکە پێویستە ئەمە ئەنجام بدەی:**

لەلیستی هەڵسەنگاندا هەموو شتێکی چاوپێکەوتنەکە تۆماربکە، هەموو تێبینیەکان هەر لەکاتی هاتنەژوورەوەیەوە تاوەکو کاتی ڕۆیشتنی بنوسەرەوە. ادنانی هەندێك كات بۆ نوسینەوەی بۆچونی تۆ بەرامبەری یارمەتیت دەدات بۆ هەڵبژاردنی باشترین. گەر کەسێکی تریشت لەگەڵدابوو ئەوا داوای بۆچوونی ئەویش بکە و سودی لێوەربگرە و لەڕاستی دڵنیابە.

**٣-هەڵبژاردن:**

کاتێك لە ج.س.بینی م پرسی لەبارەی چۆنێتی هەڵبژاردنی کارمەندانی؟ گوتی;" من بانگیان دەکەم بۆ خواردنی قاوەڵتی و هێلکەیان پێشکەش دەکەم. گەر کەسێك بەبێ تامکردنی هێلکەکە ڕاستەوخۆ خوێی پێداکرد ئەوا من ئیشی نادەمێ چونکە بەبێ ئەزموندن لەخۆیەوە کاردەکات بۆیە وردەکار و ژیریش نییە" ، ڕەنگە بینی لەمەدا زێدەڕۆیی بکات



بەلأم بۆچوونێکی ساغی هەیە. هەڵبژاردنی کارخوازی گونجاو مانای وەهانییە کەتۆ

تـەواو کـردوتن بـە کارمەنـد. ئایـا ئەمـە بـەلای تـۆوە نامۆیـە؟ وەرە بـاوەکو بـۆتی ڕوونتربکەمـەوە: دامەزرانـدنی کارمەنـد پـاش یەکـەم چـاوپێکەوتن وەکـو کڕینـی ماسـی وەهایە لەئاودا، کە بەتام دیارە و نازانیت دەستت پێی دەگات یان کە بەدەستت گەیشت ژەهراویش نییە، کاتێك یەکەمین جار چاوت بە کەسێك دەکـەوێت وەهـا هەسـت دەکـەیت مرۆڤێکی بالآ و ناوازەیە، بەلآم کاتێـك دووم جـار چـاوپێکەوتنی لەگەڵدا ئـەنجام دەدەی دەبینی کەسێکی ئاساییە و بۆجاری سێیەمیش دەبینی بۆ ئیشـەکە گونجـاو نییـە. بۆیـە پێویستە پتر لەجارێك کارخوازت ببینی و چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام بدەی.

هەڵبژاردن مانای هەڵبژاردنی کارخوازی گونجاو و شیاوە بۆئەوەی دووەم جـار بێتـەوە بۆ چاوپێکەوتن. ئەوجا پاشی دووەم چاوپێکەوتن دوو یـان سـێ کـەس هەڵبـژێر و جـاری سێیەم باشترینیان هەڵبژێرە، بەڵێ ئەمە ئەوەیە کە برایان ترایسی نـاوی لێنـاوە: بڕیـاری سێیی لەکتێبی (( لایەنی دەروونی بـۆ ئەنجامـدان و دەسـتکەوتن)). کاتێـك لـە کـردارەی هەڵبژاردنی کارخوازت دەبیتـەوە، ئـەوجا باشـتر وەهایـە دەسـتەی کارەکەشـت لەگەڵتـدا یارمەتی دەربن و پرسیان پێبکە و بزانە تاچەند کارمەندی گونجاوت هەڵبژاردووە. ئـەوجا هەنگاوبنێ بۆ خاڵی داهاتوو:

## ٤-پێداچونەوە بە بڕوانامەی کەسانی شیاو/دڵنیابونەوە لەڕاستی سەرچاوەکان:

باڤلۆڤ دەڵێت:" **فێربە، بەراوردبکە، ڕاستیەکان کۆبکەرەوە**"، بـە داخـەوە زۆرێـك لـە بەڕێوەبـەران خۆیـان لـە پشـت ڕاسـتکردنەوەی زانیاریـە خـراوە ڕووەکـانی کارمەندەکـە دەدزنەوە و بەدواداچـوونی بـۆ ناکـەن، تـەنها پێشـنیارێك دەکـەن و وازی لـێ دەهێـنن و کاتێکیش کارلەکار دەترازێت سەیریان لێ دێت و دەڵێن: بۆچـی وەهـا بـوو؟! گەڕانـەوە بۆسەرچـاوەی زانیاریـەکان کـارێکی زۆر تەندروسـت و گرنگـە. بـەر لـەوەی کـارخوازی هەڵبژێردراوت دابمەزرێنی دەبێت هەموو ئەوزانیاریانەی لەبارەیەوە پێویسـتن بەردەسـتی

بخەی جا باشبێت یان خراپ. دەتوانی چەند پرسیارێك ئاراستەی سەرچاوەی زانیاریەکانی بکەی:

- ئایا بەڕێز کیڤن لای ئێوە کاری کردووە؟ کەی؟
- بۆچی وازی لەئیشەکە هێناوە؟
- هەستتان چۆنە بەرامبەر ڕۆیشتنی؟
- کار و بەرپرسیارێتی لای ئێوە چی بوو؟
- خاڵی لاواز و بەهێزی چییە؟
- خووی خراپی هەبوو؟ یاخود کێشەی تایبەتی؟
- لە بەرهەمەکانی کۆمپانیاکەدا چۆن بەشداربووە؟
- چی جۆرە کەسێکی پێ باشە و پێ خراپە؟

**کاتێك لە ئاراستەکردنی پرسیارەکانی پێشووتر دەبیتەوە، ئەم پرسیارە ئاراستەی خۆت بکە:**

- هیچ شتێکی تر هەیە لەبارەوە دەبێت بیزانم؟

ئەم پرسیارە کۆتاییەکی کراوەی هەیە و وەهات لێدەکات زانیاری گرنگترت چنگ بکەوێت لەبارەی کارخوازەکەتەوە، گرنگ ئەوەیە دروستی بروانامە و زانیارییە پێشکەشکراوەکانی دووپات بکەیتەوە، هەروەها دەتوانی لە تۆماری دڵنیایی ئەو کەسە بکۆڵیتەوە" لەڕێگەی پەیوەندی کردن بە کۆمپانیای دڵنیایەوە.

**٥-دامەزراندن:** پاش لێبونەوەت لەچوار قۆناغەکەی پێشووتر و بەدەست هێنانی کۆڕای دەستەکەت، ئەم پرسیارانە ئاراستەی خۆت بکە:

- ئایا ئەم کارمەندە باشترین و بەسودترینە بۆمن؟

- ئایا ئەمە لەوجۆرە كەسانەیە كەبۆماوەی پازدەساڵی داهاتوویش هەرلەم دامەزراوەی مندا دەمێنێتەوە؟
- گەر لەبەشی فرۆش كاربكات وەها رەفتاردەكات كەخۆمیش شتی لێبكڕم كە خاوەنی كۆمپانیاكەم؟
- ئایا لەگەڵ دەستەكەمدا هاوكار و هاوجێ دەبێت؟

گەر وەڵاكانت هەمووی بەبەڵێ بوو، هەستی تایبەتی خۆیشت پێت دەڵێن ئەمە كەسی گونجاوە، ئەوا خۆت تەلەفۆنی بۆبكە و ئەم هەواڵە خۆشەی پێبدە.



## ٨٦-کردارەی پاش دامەزراندن:

((دامەزراند کۆتایی سەرەتانییە، بەڵکو سەرەتای کۆتاییە))

**د.ئیبراهیم فەقی**



ئێستایش تۆ پێویستت بە پیرۆزبایی لێکردنە، هەنگاوی گونجاوت گرتۆتەبەر و هەموو هەوڵێکت داوە بۆ دامەزراندنی باشترینان لەو شوێنە چۆڵەی هەتە و دەتەوێت کەسی گونجاوی بۆ بدۆزیتەوە. ئیترچی؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کەزۆرێك لە بەڕێوەبەران بەم شێوەیە وەڵامی دەدەنەوە:" باشە، ئێستا خراوەتەسەر کارەکەی، ئێستا پێویستە بوونی خۆی بسەلمێنێت، هەلێکمان پێدا و پاقیمەنی لەئەستۆی خۆی دەبێ!" ، ئەوکاتەی ئەم کارمەندە نوێیە دەست لەکاردەکێشێتەوە زۆریان سەیرلێدێت یاخود کاتێك خۆشیان پاشی شەش مانگ بڕیاری دەرکردنی دەدەن هەر سەیریان لێدێت! بێگومانم لەوەی هەموو کارێکت کردووە بۆ دەستڕاگەیشتن بەم کەسە خوازراوە، بەڵام ئێستا ئەرکێکی ترت کەوتۆتەسەر شان ئەویش یارمەتی دانی ئەم ئەنجامە تازەیەی دەستەکەتە بۆ سەلماندنی بوونی خۆی لە کۆمپانیاکەتدا. لەڕاستیدا لەم کاتەدا وەکو بەڕێوەبەر پێویستت بە ئەنجامدانی کردارەیەکی تریشە کەناوی دەنێین: (( کردارەی پاش دامەزراندن))، لەچوار هەنگاوی سەرەکی پێکدێت:

### ١-پێشکەشکردن یان خستنەڕوو:

زۆر بەڕێوەبەر ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بۆ دامەزراندنی کارمەندێکی ناوازە دەدات بەبێ ئەوەی ئەو کارمەندە بزانێت موچەکەی چەنددەبێت و داهاتووی بەچی دەگات، لەکۆتایشدا ئەم کارمەندە باشەیان لەدەست دەردەچێت. بەڕاستی شەرمە ئەم هەموو

هەوڵ و ماندوبوونە بۆ دۆزینەوە و دامەزراندنی باشترین کارمەند کەچی دواتر بەئاسانی لەدەستی بدەی! بۆیە باشتر وەهایە هەر لەسەرەتاوە باسی موچە و پێشبینی زیادبوونی بکەی و لەکاتی چاوپێکەوتنی تایبەتیدا بۆی روون بکەیتەوە و لەسەری رێك بکەون و دواتر وەکو شتێکی چاوەروان نەکراو نەیبینێت. خستنەرووەکانت تۆماربکە لەگەڵ لەپێش چاوی گرتنی ئەمانەش:

أ- دەستەواژەیەکی کورت بۆ بەخێرهاتنکردنی کەسە بەربژێر و کاربۆرەخساوەکە وەکو ئەندامێکی نوێی دەستەی کارکردنت.

ب- نازناو و کاری دیاریبکە.

ت- رۆژ و بەرواری دامەزراندنی .

پ- ناوی سەرۆك کارەکەی.

ج- موچەی مانگانەی.

ح- لیستی سودەکانی، گەر هەبوو.

خ- ماف پشوەکانی.

د- ماوەی کارکردن لەژێر چاودێری وتاقیکردنەوە.

ژ- واژووی هەروولا.

زۆر گونجاوە باسی کاتی تاقیکردنەوەیشی لەگەڵدابکەی و کۆتایی ماوەکەی بۆ دیاریبکەی، هەروەها دەبێت ئەم خستنەرووە لەلایەن کاربۆرەخساوەکەوە واژوو بکرێت، ئەوجا دۆسیەیەکی دەدەیتێ بۆئەوەی لە دۆسیەکانی خۆیدا هەڵیبگرێت، وێنەیەك لەجۆری کار و شێوازی دڵنیایی یاخود باجی پێویست بهەنێرە بۆبەشی هەژمارکاری.

## ٢-گونجاندن و ئاراستەکردن:

هەرلەیەکەم رۆژی کارکردنیەوە هەوڵی ناساندنی ئەم کارمەندە بەوانی تری کۆمپانیاکەت بدە، ئەوجا خۆت یاخود کەسێکی لەگەڵدا بهەنێرە و بەناو کۆمپانیا و

بەشەکانی دامەزراوەکەتدا سوڕبخوات و ئاشنایان بێت و هەر زانیارییەکی دەربارەی دامەزراوەکەت گەرك بوو بیدەرێ و باشتر ئاشنای بکە بە دامەزراوەکەت، ئەم هەنگاوەش لە کۆمپانیایەکەوە بۆئەوی تر دەگۆڕێت. ناساندنی تەواوی کارمەند بە ئەندام و بەشەکانی کۆمپانیاکە لەهەندێك کۆمپانیا یەك هەفتەی بۆ دانراوە و لەهەندێکی تریش دەگاتە یەك ساڵ، هەرچۆنێك بێت ئەمە پێویستی بە ژیری و توانای زووفێربوونی کەسی خوازراوە. مەهێڵە کارمەندە نوێیەکە لەخۆیەوە کاربکات مەگەر تەواو دڵنیابێت لەوەی کارەکەی ڕاستە و تواناداره بۆ ئەنجامدانی. هەرچۆنێك بووە پێویستە لەیەکەم ڕۆژی دامەزراندنیدا تۆ لەگەڵیدابیت یاخود کەسێکی تری بخەیتە تەك ئەگینا ئەو کارمەندە هەڵدێ یان باش فێرنابێت.

## ٣-مەشق و ڕاهێنان:

مەشق و ڕاهێنان کردارەیەکی بەردەوام و پێویستە هەر لەسەرەتاوە کۆڵەکەکانی پونیات بنرێت.. مەشقکردن بەکارمەندە نوێیەکە هەر لە یەکەم ڕۆژی دەست بەکاربوونەوە دەست پێدەکات و ئەمەیش متمانە بەخۆکردنی پێ دەبەخشێت، ئەوجا ئەمە فێری ئەوەیشی دەکات چۆن بەباشترین شێوە کارەکانی ئەنجامبدات.. ئەم کردارەی مەشق پێکردنە باشتر وەهایە خۆت پێی ئەنجامبدەی، یاخود کەسێکی باشی بۆدانێی و بەجوانی لەسەر کارەکەی ڕایبهێنێت.

## ٤-هەڵسەنگاندن:



هەڵسەنگاندن ئامرازێکی زۆرباشە بۆ دروستکردنی پەیوەندییەکی زۆرباش. زۆرێك لە کۆمپانیاکان پاشی مانگێك لەدامەزراندن هەڵسەنگاندن بە کارمەندە تازەکەی دەکات، ئەوجا پاشی سێ مانگ و دواتریش شەش مانگی داهاتوو، ئەوجا هەڵسەنگاندنی ساڵانە.

بەڵام من هەمو رۆژێك كارمەندە نوێیەكانم هەڵدەسەنگاند! ڕەنگە زۆرت لەمە سەیربێت و بڵێی: كات و دەستپەتاڵی زۆری دەوێت، لەڕاستیدا كارمەندی تازە زیانی زۆرت پێ دەگەیەنێت گەر خۆاكپێدانی پەرچدانەوە( فیدباك)ی ماوەی یەك مانگی پێ نەدەی، پێویستە ئاراستەكانی ڕاست بكەیتەوە بۆئەوەی لەگەڵ كاری ڕۆژانەیدا بگونجێت، بۆیە ئەو ئاراستەیەی من گرتبووم بەدواداچوونكردن بوو بۆ كارەكانی ڕۆژانەی كارمەندە نوێیەكە و یارمەتی دانی بوو بۆ گۆڕینی لاساریەكانی و ئەوجا هەموو هەفتانەیەك پێكەوە دادەنیشتین و هەڵسەنگانمان بۆ كارەكانی دەكرد و ڕێكخستنمان بۆ دەكردەوە. من بۆماوەی سێ مانگ بەردەوام دەبووم لەسەر ئەنجامدانی ئەم كارە، ئەوجا بڕیاری ئەوەدەدەم كە پێش كەوتووە یان هەر لەجێگەی خۆیەتی، دواتر دانیشتنی هەفتانەم دەكرد بە دوو هەفتە جارێك و ئەوجا هەموو مانگێك. لەلای هەر كارمەندێك لەدامەزراوەكەمدا ڕاپۆرتێك یان لاپەڕەیەكی هەڵسەنگاندنی ئەم كارمەندە تازەیە هەبوو، كە پاش ئەوەی دەیدا بە سەركردەكەی ئەویش بۆمنی دەهێنا. ڕەنگە بەم قسانەی من بڵێی قسەی زیادە و هیچن و كەس بۆی ناكرێت و نایبەرژێت ئەم كارە ئەنجامبدات، منیش بێگومانت دەكەمەوە لەوەی كە گەر هەڵسەنگاندنی باش بۆ كارمەندەكەت نەكەیت ئەوا بەخێرایی دەری دەكەیت و دواتریش ناچاری دووبارە دامەزراندنەوەی كارمەندێكی تردەبیت. بزانە كە كارمەندانت باشترین یارمەتی دەر و كارڕەوانكاری تۆن و لەڕێگەی هەڵسەنگاندنیانەوە دەتوانی خەوشی و لاساریەكانیان نەهێڵیت و بیانخەیتەسەر ڕێگەی ڕاست و بۆخۆتیان كێش بكەیت.

كرداری بەدواداچوونی پاش دامەزراندان یارمەتی كارمەندی نوێ دەدات بۆ زوو ڕزگاربوون لەكاتی هەڵسەنگاندن و گونجادن، ئەمەیش ڕێزلەخۆگرتنی بەرزتردەكاتەوە و متمانەی باشتری بەخۆی دەبێت، هەروەها ئاشنای دەكات بەو كار و هەنگاوانەی پێویستە بیانگرێتەبەر و ئەنجامیان بدات كە پێویستن لەسەری بۆ سەرخستنی كاری دامەزراوەكەت و ڕایی كردنی ئیش و كاری خۆیان، ئەمەیش بەسوود بۆخۆت و

دامەزراوەکەشت دەگەڕێتەوە، لەبەرامبەریشدا کارمەندە نوێیەکە هەست بەوەدەکات کە بەڵێ ئەمە ئەو جێگە دروستەیە کەبە دوویدا گەڕاوە و وادۆزیویەتیەوە.



## ٨٧-بیست هەنگاوی بڤە لەکاتی دامەزراندنی کارمەندی نوێدا:

((هەموو مرۆڤێکی پێگەیشتوو تامی شکستی چێشتووە، بەلاّم شکستی بەردەوام مانای زامنکردنی بەدیهاتنی سەرکەوتن نییە))

**گوتەی سەرچاوە نادیار**

١) گەر بەتەواوەتی خۆت ئامادە نەکردووە هیچ جۆرە چاوپێکەوتنێکی تایبەتی ئەنجام مەدە.

٢) لەکاتی ئەنجامدانی چاوپێکەوتندا رێگە بە پچڕاندن مەدە.

٣) تەنها بە ڕووخسار بڕیار لەسەر کارخوازەکە مەدە.

٤) هەر لەسەرتاوە بڕیارمەدە.

٥) کارخوازی ناوازە لەجێگەی نەشیاودا دامەمەزرێنە.

٦) ئەوانەی کە بەدەست نوس کورتە ژیاننامەی خۆیان پێشکەش کردووی لەبیریان مەکە، هەلێکیان بدەرێ، مەرج نییە دواکەوتوو و بێ کەڵك بن.

٧) لە کارخوازە بێ کارەکان مەسڵەمێرەوە.

٨) هەرخۆت قسەمەکە، ڕێگە بەوی تریش بدە.

٩) پرسیارێك مەکە بە بۆچی دەست پێبکات، ڕەنگە وەلاّمی بەرگریکارانەت چنگ بکەوێت.

١٠) باسی شتە هەستیارەکانی وەکو " گانگانۆکێ، ئاین، بنچینە و نەتەوە..هتد" مەکە.

١١) هیچ بەڵێنێك مەدە.

١٢) ئومێدی درۆی پێ مەبەخشە.

١٣) بەداخ مەبە بۆ دامەزراندنی هیچ کەسێك.

١٤) پەلەمەکە لەدەرکردنی بڕیاری دامەزراندن.

١٥) بەبێ پشتگیری دەستەی کارت هیچ کارخوازێك دامەمەزرێنە.

١٦) بەبێ پێداچوونەوە بە داتا و زانیاریەکانی هیچ کارخوازێك مەکەرە کارمەندنت.

١٧) ماوەی چاوپێکەوتنی کەسێتی بەبێ مۆڵەتی کارخواز زۆر درێژ مەکەرەوە.

١٨) بەپشت بەستن بە هەستی خۆت هەلی کار بەکەس مەدە.

١٩) بەپشت بەستن بە ڕاستیەکان بە تەنها هەلی کار بەکەس مەبەخشە.

٢٠) بەهۆی پێشکەشکردنێکی ناباش و ناسەرەنج ڕاکێشەوە کارخوازێکی گونجاو لەدەست مەدە.

## ٨٨-دەرکردن..کارێك هەر لەسەرەتاوە لەسەری ڕێك کەوتوون:

((ئەوان لێرەدا لەسەرەتادا پیاوەکان لەقەنارەدەدەن، دواتر تاقییان دەکەنەوە))

**مۆلێر**



هەرگیز کارمەندێکت دەرکردووە؟ گەر بەبەڵێ وەڵام دەدەیتەوە، ئەی هەستت بەرامبەر ئەم کارەت چۆنە؟ هەرگیز نەمبینیوە بەڕێوەبەرێك بە بەڵێ و پێم خۆشبووە ئەم کارمەندەم دەرکردووە وەڵامی دابێتەوە. زۆرجار وەڵامەکان بەم شێوەیە دەبێت:" هەستم بە تاوان کرد، زۆر ئازارم چێشت، نەمدەتوانی بەئاسانی دەری بکەم، ئەو ڕۆژە نەمتوانی بنووم، تەنانەت زۆرێك لە بەڕێوەبەران ڕەتی بەکارهێنانی دەرکردنیشیان دەکردەوە و داوایان لەکەسێکی تر کردووە لەبریاندا ئەم کارە ئەنجام بدات. هەرچەندە تۆ لەکرداری دەرکردندا بەهێزبیت، بەڵام هەرگیز بە ئەنجامدانی هەست بە خۆشی ناکەیت. جۆرج ئالیۆت زۆر ڕاستگۆبوو کاتێك گوتی:" **لەهەموو ڕۆشتنێکدا وێنەیەکی مردن هەیە**"، بەڵام زۆرجار ناچاری خۆ ڕزگاکردنی لە سێوەخراپبوەکە بۆئەوەی سێوەکانی تریش خراپ نەکات. لەڕاستیدا کردارەی دەرکردن بەشێکی گرنگی کاری بەڕێوەبەرە، هەر بەڕێوەبەرێك نەتوانێت کردارەی دەرکردن ئەنجامبدات ئەوا باشتر وەهایە کردارەی دامەزراندنیش ئەنجام نەدات، یاخود بەلای کەمەوە نەبێتە بەڕێوەبەری یەکەم. دەرکردن توانایەکە وەکو هەر بەهرە و توانایەکانی تر، دەتوانی توێژینەوەی بکەی و لێی بکۆڵیتەوە و فێری ئەنجامدانی بیت، یادی بگریت بۆئەوەی ببێتە کارێکی ئاسان و بێ مەلاّم و تەندروست بۆتۆ. **((هیچ کارێك تەواو نەبووە تاوەکو بەتەواویوو دادەنرێت))**

**فوجی**

**بەرلەوەی بڕیاری دەرکردنی هەر کارمەندێك دەربکەی، خولەکێك بەخۆت بدە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە:**

- هیچ ئەگەرێکی ترم بۆماوەتەوە؟
- ئایادەتوانم لەڕێگەی گواستنەوەی بۆ بەشێکی تر بیهێڵمەوە؟
- ئایا دەگونجێت هەلی تری پێبدرێت؟
- هەموو شتێکم بەباشی لەگەڵ ئەنجامداوە بۆئەوەی بگاتە سەرکەوتن؟
- بەباشی ڕاهێنانم پێکردووە؟
- ئایا هەموو ئەو زانیاریانەم لایە ڕاستن؟
- ئایا من بەخێرایی ئەم بڕیارەم داوە؟

**گەر وەڵامەکانت بۆ هەموو پرسیارەکان بەڵێ یە، ئەوا پێویستە هەرئێستا دەری بکەیت، ئەوجا ئەم پرسیارانە لەخۆت بکە:**

- کەی ئەمە ئەنجام بدەم؟
- ئایا من بەتەواوی دۆسیەکانەوە ئامادەم؟
- کەسێکی تر هەیە جێگەی بگرێتەوە؟

پاش ئەمە بوەستە و خۆت ئامادەبکە بۆ دانی بڕیاری دەرکردن و پێڕاگەیاندنی بەسەرکەوتوویی.

## ٨٩-کردارەی دەرکردن:

((پێویستە توندوتیژبم تەنها بۆئەوەی بەسۆزبم))

**ولیام شکسپیر**



ڕۆنــی بەڕێوەبــەری گشــتی ئــوتێلێکی بچـکۆلانە زۆری سـەیر لێهـات و گـوتی:" چـی کردارەی دەرکردە، بۆ تـۆ بـڕوات وەهایـە کـە یـەك خولـەکیش لەدەسـتی خـۆم دەدەم بـۆ توڕدانـەدەرەوەی سـێوێکی خـراپ لـەنێو سەبەتەکەم؟ "، گوتم: کەواتـە هەمیشـە چـی دەکەیت؟ گوتی:" کەسەکە بـانگ دەکـەم بۆ نوسینگەکەم و پێی ڕادەگەیەنم کە دەرکراوی. بەڵێ من لەکاتی دەرکردنی کارمەندا بـەم شێوەیە ڕەفتاردەکەم و ئەمەم بەلاوە پەسەند و باشە"، ئەوجا هەمدیس لێم پرسـییەوە: خولی دامەزراندنی کارمەند لای تۆ چەندە؟ گوتی :" بەدیاریکراوی نازانم، بـەڵام ئـەوەش دەزام کە ٥٥٪ ناوەندی تێکڕای ئوتێلکارییە".

بەڕاستی سەیربوو نەیدەزانی تێکڕای خـولی دامەزرانـدن لـە ئوتێلەکـەی خۆیدا چـەندە دەیزانی لەئوتێلەکان بەگشتی چەندە! لەڕاستیدا دەیویست تێکڕابەرزەکە بشـارێتەوە و سەرزەنشتی ئەوانی تر بکات.

دەرکردن کاری بەڕێوەبەرە بۆیە پێویستە فێری چۆنێتی ئەنجامـدانی بێـت وەکـو هـەر کارێکی تری کارگێڕی، بۆیە ڕێگەم پێبدە کە کردارەی دەرکردنت بـۆ ڕوونبکەمـەوە کەلـە چوار قۆناغ پێکدێت:

**١-چاوپێکەوتن و نامەی بەدواداچوون:**

فرانسیس بیکۆن دەڵێت:" **من هەموو مرۆڤێك بەقەرزاری پیشەکەی دەزانم**"، لە هەنگاوی یەکەمدا لە نوسینگەکەی خۆت چاوت بە کارمەندەکەت بکەویت و هەڵسەنگاندنی تەواوی بدەرێ و بۆچونی خۆتی لەبارەی ڕەفتارەکانیەوە بخەرەڕوو. دڵنیابە لەوەی بەباشی لە هەڵسەنگاندنەکەت تێگەیشتووە، ڕێگەی پێبدە بۆچوونی خۆیت بۆ دەرببڕێت، ئەوجا نەخشەیەکی کاری بۆ دابڕێژە و پێی ڕابگەیەنە کەتۆ چیت لەو دەوێت و هەڕەشەی ئەوەشی لێبکە گەر خۆی نەگۆڕێت ئەم کارە باش و پێشنیار بۆکراوانەی ئەنجام نەدات ئەوا داهاتووی لەم کۆمپانیای تۆدا باش نابێت. ئەوجا ڕێگەی پێبدە باوەکو بڕواتەوە سەر ئەو کارەی تۆ پێی دەسپێری، لە نزیکەوە چاودێری بکە بەبێ خۆبارگاوی کردن بەئەو، هەوڵبدە وەها هەستبکات کەتۆ دەتەوێت یارمەتی بدەی و چاکی بکەیت.

**٢-بۆچوونی ئاراستە بکە و کۆبونەوەی بەدواداچوونی بۆ ئەنجامبدە:**

گەر ڕەفتارەکانی باش نەکرد، جارێکی تر بەدوویدا بهەنێرەوە و ئەمجارەیان کاتێکی دیاریکراوی بۆ دانێ بۆئەوەی ڕەفتارە نەشیاوەکانی بگۆڕێت ئەگینا دەردەکرێت.

**٣-جارێکی تۆ بۆچونی ئاراستەبکە و هەڵی باشتربوونی پێبدە:**

گەر کارمەندەکە هەرلەسەر بۆچوون و ڕەفتارەکانی بەردەوام بوو ئەوا جارێکی تر ئاگاداری بکەرەوە. باشتر وەهایە ئەمجارەیان پێنج شەممەبێت و پێی بڵێ: بوەستە، تائێرە و بەس، دواتر ڕۆژی یەك شەمەیشی بۆبکەرە پشوو" چونکە هەینی و شەممە خۆی پشووە و یەك شەممەیش ئەمە سێ ڕۆژ دەکات، بۆئەوەی بەباشی بیر لە ڕەفتارە نەشیاوەکانی بکاتەوە.

کاتێك ئەم کارە ئەنجام دەدەی ئەوکات دەبینی ڕۆژی دوو شەممە کارمەندەکە خۆی ڕۆژی دووشەممە دێت و نامەی دەست لەکارکێشانەوەت پێشکەش دەکات، هەندێکیان بەشیمانی دەردەبڕن و واز لەڕەفتارە خراپەکانیان دەهێنن و دەگەڕێنەوە سەر کارەکانیان، بەڵام پاشی ماوەیەك دەست دەکەنەوە بە نواندنی هەمان جۆرە کردار و ڕەفتار و بەهۆیەوە ناچاری خۆت دەریانبکەی.

## ٤-دواین ڕۆژ:

ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە چاوت بە کارمەندەکە دەکەوێت و هەواڵی دەرکردنی پێڕادەگەیەنیت، بۆئەوەی ئەم کارەیەش ئاسان ئەنجامبدەی پێویستە بزانی کە ئامادەی و هەموو شتێکت لەبارەی ئەم کارمەندە و دەرکردنیەوە ئامادەکردووە، بەم شێوەیە:

أ- دۆسیەی ئەم کارمەندە بەگشتی بە چاوپۆشین لەم کاریە هەڵەیەی.

ب- دوایین شیکی پارە و هەموو مافەکانی تری لەشێوەی زیادە موچەی و موچەی مەترسی ئەو ماوەیەش کاری تێداکردووە، بێگومان ئەمەیش پشت بەستە بەساڵەکانی کارکردنی و ڕامیارێتی کۆمپانیاکە و هەموو مافێکی یاسایی کارمەندەکە.

کارمەندەکە بانگ بکەرە نوسینگەکەی خۆت و بڕیاری دەرکردنی پێ بڵێ، لەگەڵ پاراستنی بەها مرۆڤبوونی، بێگومان دەزانی دەرکردن کارێکی خوازراو و ئاسان نییە، بۆیە زۆر لەگەڵیدا قسەمەکە و باسی هیچی تری لەگەڵدا مەکەرەوە، لەم جۆرە دۆخانەدا هەمیشە من دەمگوت:" کیڤن ئەم جۆرە پیشەیە وابزانم دەردی تۆ ناخوات، کاتێك داوات لێدەکەین واز لەم کارە بێنی پارمەتیشت دەدەین بۆ دۆزینەوەی کارێکی باشتر و گونجاوتر لەگەڵ تۆ، بۆئەوەی بتوانی لەجێگەیەکی تر باشتر خزمەتبکەی و بەهرەکانتیان بۆ دیاربخەی" . ئەوجا هەواڵە خۆشەکانی پێبدە و پێی بڵێ:" فەرموو ئەوەش موچەی پازدە ڕۆژ لەگەڵ هەموو تایبەتمەندیەکانت لەو ماوەیەدا و موچەی دووهەفتەی تری کارکردنیشت بۆ خەرج دەکرێت، بەبێ کارکردن)) ئینجا لەچاوانی بڕوانە و پێی بڵێ:"

هیوام سەرکەوتنتە"، ئەوجا تاوەکو لای دەرگای نوسینگەکەت بیبە. بەڵێ پێویستە بەڕێوەبەر بەم شێوەیە کارمەندانی دەربکات .

ڕێگەیوکی تریش هەیە کە بەر لەوەی دەری بکەی داوای لێبکەی کە خۆی داوای دەست لە کارکێشانەوە بکات" بۆئەوەی تۆ دەری نەکەیت. ئەم هەلی پێشکەشکردنی دەست لەکارکێشانەوەیە کایەی ئەوەی پێدەدات نەختێك خۆڕاگرانەتر ڕەفتاربكات و خۆی بە بەرپرسیار بزانێت و تۆیش تاوانبار نەکات.

دوایین چاوپێکەوتنی تایبەتی: ئامانجی پشت ئەم چاوپێکەوتنی ئەوەیە هەموو هەلێکی گونجاو بە کارمەندەکەت بدەی، بۆنمونە: دەتوانێت چاوی بەسەرۆکی کۆمپانیا یاخود خاوەنی کۆمپانیا بکەوێت و ڕای خۆی پێ بڵێت، بەپێی ئەزمونی خۆم بۆم دیارکەوتووە کە دوایین چاوپێکەتن سودی زۆرە و گرنگترینیان :

١- یارمەتی کارمەندەکە دەدات لەئیشەکەی دەرنەکرێت گەر ستەمی لێکرابوو یاخود بوختان بۆ ئەم کارمەندە کرابوو.

٢- یارمەتی بەرپرسانی کارگێڕی دەدات خۆیان لە تێوەگلان لە کێشە دیاریکراوەکان بەدووربگرن.

**كردارەی دەركردن**

↑

**٤**

**دواین ڕۆژ**

↑

**٣**

**دووەم جار بۆچوونی ئاراستەبكە**

↑

**٢**

**بۆچونتی ئاراستەبكە و هەڵی پێبدە**

↑

**١**

**چاوپێكەوتن و نامەی بەدواداچوون**

## ٩٠-دە خاڵی بڤە لەکاتی دەرکردنی هەر کارمەندێکدا:

((هەرگیز لەکاتی توڕەییدا کەس دەرمەکە. کاتێک توڕەدەبم بیست و چوار کاتژمێر چاوەڕوان دەبم کەچی هێشتاکە هەست دەکەم توڕەم، بەڵام لەم کاتەدا جێبەجێ کردنی بڕیارەکان باشتر و ئاسانتر و کاریگەرتر دەبن))

**فرانك باکتا**

### دەخاڵی مەترسیدار و بڤە کە پێویستە لەکاتی دەرکردنی هەر کەسێکدا لەپێش چاوی بگریت:

١. بەبێ ئامادەکردنی دۆسیە و ڕاپۆرتەکانی تایبەت بەو کارمەندە کردارەی دەرکردن ئەنجام مەدە.

٢. بەبێ ڤیلمەندی کارگێڕی ئەم کردارەیە ئەنجام مەدە.

٣. لەبەرهۆکاری تایبەتی خۆت کەس دەرمەکە.

٤. ڕەخنەی مەکە.

٥. بەهۆی سۆزەوە دەری مەکە.

٦. کاتی زۆر بۆ دەرکردنی بەفیڕۆ مەدە.

٧. زۆر قسەی لەگەڵدا مەکە.

٨. پەلەمەکە.

٩. زۆر چاوەڕوان مەبە" چون بە تێپەڕبوونی کات ڕەنگە دیسانەوە هۆگری بیتەوە.

١٠. پاش دەست لەکارکێشانەوەی کارمەندی نەرێنی و خراپ لای خۆت ڕامەگرە.

**ئێستایش بیر لەوە بکەرەوە:**

گەر بەڕێوەبەر کارمەندێکی بەهۆی نالێهاتووییەوە دەکرد باشە کێ جێگەی دەگرێتەوە بەڕێوەبەر یان کارمەندێکی لێهاتوو؟

## ٩١-چۆن دەزانیت تیشك خراوەتەسەر تۆ؟

((گەر نەتوانی ڕاستی بدۆزیتەوە لەهەر كوێیەك بیت، كەواتە پێت وەهایە لەكوێ دەیدۆزیتەوە))

**دوگن**

١- كاتێك دەزانی و هەست دەكەیت سەرۆك كارەكەت زۆر ڕەخنەت دەكات.

٢- كاتێك نامەی خراپ ئەنجامدانی كارەكانت بۆ دێت. نامەی نادەستخۆشیانە.



٣- كاتێك سەركارەكەت لە ئیشە گرنگەكاندا پەنات پێ ناگرێت.

٤- كاتێك لە ئەنجامدانی فیدباك دەوەستیت.

٥- كاتێك هیچ كەسێك باس لە بۆچوونی تۆ ناكات.

٦- كاتێك دەوروبەرت پلەیان بەرز دەكرێتەوە و تۆیش هیچ.

٧- كاتێك كۆمپانیاكە بڕیاری كەمكردنەوەی موچەدەدات و تۆیش كەمترین وەردەگریت.

٨- كاتێك موچەی تۆ زۆر لەوانی تر زیادترە. ئەوانەی موچەیان زۆرە زووتر لە موچە كەمەكان دەردەكرێن.

گەر هەستت بەهیچ كام لەو ئاماژانەی پێشووتركرد ئەوا بزانە تۆ بۆ دەركردن دیاریكراوی، بەدووی كارێكی تردا بگەڕێ، باشتر وەهایە خۆت دەست لەكاربكێشیتەوە یاخود بەرلەوەی دەرت بكەن خۆت چاكبكە و فریای خۆت بكەوە.

تۆ ئێستا بە تەواوەتی ئاشنای دامەزراندن و دەرکردنیشی. بزانە خۆپاراستن باشترە لە چارەسەر. هەربۆیە تۆیش وریابە و بەژیرانە کارمەندانت دابمەزرێنە و زانیاریان لەبارەوە کۆبکەرەوە، پێویستە متمانەت بە پەیهەستت بێت. گەر بڕیاری دەرکردنی کارمەندێکت دا ئەوا وەکو مرۆڤێکی باش ئەم کارە ئەنجام بدە، وەك بنیامین فرانكلین جارێکیان گوتی:" **دادگەری ڕاستییەو جێبەجێ دەکرێت**"، دامەزراندن بکەرە ئامانجت، هەوڵی فێربوونی بدە وەك چۆن براوەی خەڵاتێکی زێڕینی وەرزشی ئاشنای جۆری وەرزشەکەیەتی، کتێبی زۆر بخوێنەرەوە، گوێ لە ڤیدیۆی زۆر بگرە و ببینە، ئامادەی کۆڕەکان بە، چەندە دەتوانی فێربە، لەمرۆوە بەڵێن بەخۆتبدە و مەوەستە .

لەکۆتاشدا گوتەیەکی فرانسیس دروبیت بۆ دەهێنمەوە:" **هەموو کارێکی مەزن سەرەتایەکی هەیە، بەڵام بەردەوامبوون تاوەکو کۆتایی سەرکەوتن و شکۆمەندی ڕاستەقینە بەرهەم دەهێنێ**".

**بڕیاربدە کە هەموو شتێکی تایبەت بە دامەزراندن و دەرکردن فێربیت...**

## كۆتـــــاوشەكان

### بڕوابونت بەخۆت نهێنی سەركەوتنتە..

((هەرچییەك مێشكی مرۆڤ بتوانێت وەری بگرێت و بڕوای پێبكات، دەتوانێت بیكات بەڕاستی و بەدیبهێنیّ))

**كلیمنت ستۆن**

ڕۆژێك برایان بە شاكیای خێزانی گوت:" نازانم چی بكەم، وەختە كارەكەم لەدەست دەدەم، كڕیارەكانم لە خراپەوە بۆ خراپتر دەگۆڕێن و قەرزدەرەكانیشم لەهەموو لایەكەوە داوای قەرزی خۆیانم لیّ دەكەنەوە. دەبێت من چی بكەم؟ باشە من بۆچی ئەم هەموو نەگبەتیەم توش بووە؟" ، ژنەكەیشی گوتی:" برایان گویّ بەسبەی مەدە، ئێستا برۆ نەختێك بحەسێرەوە و سەیرانی شوێنێك بكە" . برایان بەقسەی ژنەكەی كرد، ڕۆیشتە سەیران، گەیشتە دارستانێك و ماندووبوون ناچاری كرد دابنیشیّ. لەناكاو لەنێو درەختەكانەوە پیاوێكی پیر دیاركەوت و لێی نێزیك كەوتەوە و لێی پرسی:" ئەی كوڕی گەنج بۆچی خەمباری؟"، برایان كێشەكەی خۆی بۆ پیاوە پیرەكە گێڕایەوە، پیاوە پیرەكەش پێكەنی و بەدەنگی بەرز و نەرم پێی گوت:" وابزانم دەتوانم یارمەتیت بدەم!"، شیكێكی دابە برایان و داوای لێكرد سالّی داهاتوو بگەڕێتەوە هەمان جێگە بۆئەوەی وامەكەی بۆ بگێڕێتەوە.

برایان گەڕایەوە مالّ و دواتر كاتێك بەجوانی سەیری شیكەكەی كرد بۆی دیاركەوت كە شیكەكە ٥٠٠،٠٠٠ دۆلاری پیّ دەبەخشێت! ئەم پیاوەیش یەكێكە لەگەورەترین ملیاردێرەكانی جیهان كە ئەویش جۆن د.ڕۆكفلر بوو. برایان زۆر دلّشاد بوو، بەژنەكەی گوت:" قەرزی هەموو قەرزدەرەكان دەدەمەوە و سەرلەنویّ دەست پێدەكەمەوە"، ئەوجا بۆ خولەكێك بیری كردەوە و گوتی:" نەخێر ئەم شیكە هەلّدەگرم و هەولّدەدەم

بەبێ یارمەتی ئەوانی تر کارەکەم بۆ باشتر هەنگاو پێبنێم" ، بۆیە بانگی هەموو خاوەن قەرزەکانی کرد و لەگەڵیاندا ڕێککەوت کە بە مانگانە پارەکانیان بۆ بگێڕێتەوە.

برایان دەستی دایە کارکردن، زۆری بەژیرانە کاری دەکرد و خۆیشی ماندوو دەکرد، بەماوەی کەمتر لەیەك ساڵ سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەست هێنا.

ساڵ تێپەڕی و کاتی ئەوە هات بگەڕێتەوە نێو باخچەکە و شیکەکەی بەڕێز ڕۆکفلر بگێڕێتەوە، کاتێك برایان گەیشتەوە جێگەی مەبەست پیاوەکەی لەنێو درەختەکاندا بینییەوە، کاتێك ویستی بەسەرهاتی خۆی بگێڕێتەوە ، لەو کاتەدا ئافرەتێکی سپی پۆشی بینی کەبۆلای پیاوە پیرەکە دەهات، ئەوجا ئەم ژنە سپی پۆشە بە برایانی گوت:" هیوادارم بێزاری نەکردبیت، من نەخۆشەوانم لە خانەی بەساڵدا ڕۆیشتوان، ئەم پیاوە زۆربەی جارەکان لەماڵەکە هەڵدێت و بە هەرکەسێك ڕابگات پێی دەڵێت: " من جۆن د . ڕۆکلری دەوڵەمەندم" .

ئێستایش دەمەوێت لێت بپرسم:" چی وەهای لە برایان کرد وەها سەرکەوتوو بێت؟ ئەم چەك یان شیکە قەڵبە بوو، یان باوەڕ و متمانەی؟"، برایان بەباشتر لەجاران کاری کرد، ژیرتر و باشتر کاری بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی دەکرد. باوەڕە مەزنەکەی وەهای لێی کرد بە تەواوەتی هەموو هێزەکانی بقۆزێتەوە و بە پێداگیری و ئارامگرییەوە کاربکات، بەڵێ ئەوە متمانە و باوەڕی بوو بەسەرکەوتن کە ئەم کەتوارییەی بۆ ئافراند، تۆ و ئەوانی تریش دەتوانن هەمان کار ئەنجام بدەنەوە.

دەتوانی تۆیش سەرکەوتوو بیت نەوەك تەنها لە ئیش و کارتدا بەڵکو لە هەر چوار بەشەکەی ژیانتدا: تایبەتی و پیشەیی و دارایی و تەندروستیش. ئەم کارەیش تەنها پێویستی بە گرتنەبەری هەنگاوێکی پێویستە کە ناوی کرداری لێ دەنێین. ئەو ستراتیژیەتیانەی لەم پەڕتوکەدا فێری بووی بەکاریان بێنە، بەو مەرجەی چەندین جار بیان خوێنیتەوە و بەباشی لێیان تێبگەی، بیان کەرە خووت بۆ بەدیهێنانی سەرکەتنت.

دەتوانی فێری خووەکان بیت دەشتوانیت بیان گۆڕیت، بۆیە خۆت ڕابێنە و سەرکەوتن بکەرە خووت. ئامانجەکانت دیاریبکە، کاتەکانت هەڵبسوڕێنە، بڕیاری باشتر دروستبکە، سەرکردەیەکی نـاوەزە بـە، دامەزرێنـەرێکی زۆرباشـی دەسـتەی کـاری سـەرکەوتووبە، هەوڵبـدە دەسـتت بـە زۆرتـرین ئامانجـەکانت بگـات و چـێژ لـەکارەکانت وەربگریـت، بەبەکارهێنانی ئەم کلیلە کارا و مەزنانە.

وشـەکانی جۆرج بێرنـارد شـۆ زۆر ڕاسـتن کاتێـك دەڵێـت: **" هـەوڵی بەدەست هێنانی ئەوەبدە کە حەزت لێیەتی، ئەگینا وەهات لێبەسەردێت ئـەوەت خۆشـبێت کەبەدەستی دەهێنیت"**، بۆیە چاوەڕوان مەکە تاوەکو شتەکان ڕوودەدەن، خۆت بیان ئافرێنە، گوێ بۆ کەسانی نەرێنی مەگرە، گەر وتیان تۆ ناتوانی شتێك بکەیت ئەوا بزانە قسەکانی ئەوان دوورن لەڕاستییەوە و ئەوەیشی دەیڵێن گرنگ نییە.

گرنگـی بەخۆتبـدە، لـەبیری مەکـە پێبکـەنیت، هـیرۆدۆت جارێـك گـوتی: **" گـەر پیـاو ناچاربوو هەمیشە سوربێت لەسەر شتەکان و چێژ وەرنەگرێت و نەحەسێتەوە ئەوا توشی شێتی دەبێت، لە زۆر ڕوانگەشەوە ناهاوسەنگ دەبێت"** .

ئێستاکە شارەزایی بیست و پێنج ساڵ لەکاری پیشەیی و فێرکاری و گەڕانی خۆمت بۆ بەردەستە، بۆیە بەباشترین شێوە بەکاری بێنە و سەرکەوتنی پێ بەردەستبخە.

سوپاست دەکەم لەبەرامبەر ئەوەی ڕێگەت پێـداوم بـە بیسـت و پێـنج سـاڵی ئـەزمونم بەشدارت پێبکەم، هیوادارم سەرکەوتوبیت و خۆشبەختی و تەندروستی باشترت بە بـەش بێت. بەختێکی باش و خوا ئاگای لێت بێت.

## دە ڕاسپاردە بۆسەرکەوتن و بەختەوەری



١) بڕوابکە کاتێك ئەوانی تر بەگومانن.

٢) کاربکە کاتێك ئەوانی تر خەون دەبینن.

٣) گوێبگرە کاتێك ئەوانی تر قسەدەکەن.

٤) بەشان و باڵیاندا هەڵبدە کاتێك ئەوانی تر ڕەخنە دەگرن.

٥) پێبکەنە کاتێك ئەوانی تر دەناڵێنن و گازندەدەکەن.

٦) دروستبکە کاتێك ئەوانی تر دەڕووخێنن.

٧) لەبیربکە کاتێك ئەوانی تر پێداگیری دەکەن.

٨) لێبوردەبە کاتێك ئەوانی تر تۆمەتبار بەخشنەوە.

٩) خۆشەویستی دەربڕە کاتێك ئەوانی تر ڕقیان دەبێتەوە.

١٠) لەبیری نەکەیت کە پێویستت بە گیانێکی گاڵتەجارانەو کەمۆڵەکەیەکی گەورەی ئارامگرییشە.




١) بڕوابکە کاتێك ئەوانی تر بەگومانن.

٢) کاربکە کاتێك ئەوانی تر خەون دەبینن.

٣) گوێبگرە کاتێك ئەوانی تر قسەدەکەن.

٤) بەشان و باڵیاندا هەڵبدە کاتێك ئەوانی تر ڕەخنە دەگرن.

٥) پێبکەنە کاتێك ئەوانی تر دەناڵێنن و گازندەدەکەن.

٦) دروستبکە کاتێك ئەوانی تر دەڕووخێنن.

٧) لەبیربکە کاتێك ئەوانی تر پێداگیری دەکەن.

٨) لێبوردەبە کاتێك ئەوانی تر تۆمەتبار بەخشنەوە.

٩) خۆشەویستی دەربڕە کاتێك ئەوانی تر ڕقیان دەبێتەوە.

١٠) لەبیری نەکەیت کە پێویستت بە گیانێکی کاڵتەجاڕانەو کەمۆڵەکەیەکی گەورەی ئارامگرییشە.

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما 

نرخ ( ٨٠٠٠) دینار